ت. ج. دی بۆر

# مێژووی فەلسەفە لە ئیسلامدا



وەرگێرانی

ئارام ئەمین شوانی



ت.ج. دی بۆر

# مێژووی فەلسەفە لە ئیسلامدا

وەرگێڕانی
ئارام ئەمین شوانی




هەولێر - ٢٠١٣

**لەم کتێبەوە وەرگێڕدراوە:**

**١- تاريخ الفلسفة في الأسلام، تأليف: الأستاذ ت، ج، ديبور – بجامعة الأمستردام، نقله الى العربية و علق عليه: دكتور محمد عبدالهادي أبوريده، طبعة الخامسة – منقحة مهذبة، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، سنة.........**

2- The History of Philosophy in Islam, BY; T. J. DE Boer. Translated by; Edward R. Jones, B. D. Dover Publications, INC, NEWYORK N. Y. 10014. Library of Congress Catalog Card Number; 66- 30424.



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **مێژووی فەلسەفە لە ئیسلامدا**
- ت. ج. دی بۆر
- وەرگێڕانی: ئارام ئەمین شوانی
- نەخشەسازی ناوەوە: **رێدار جەعفەر**
- بەرگ: رێمان
- نرخ: (٥٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپ: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٣١)ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٧٨)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## پێشەکی نووسەر:

ئەمە یەکەم هەوڵە بۆ خستنەرووی سەرپاکی مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی، هەڵبەت پێشتر بەرێز (مۆنك)[*] پوختەیەکی لەم بارەوە نوسیووە، بۆیە دەکرێ ئەم کتێبەی من بە سەرەتایەکی تازە دابنرێ، نەك بە تەواوکردنی ئەو کتێبانەی پێشتر لەم بارەوە نوسراون. لافی ئەوەش لێ نادەم ئاگام لە هەموو ئەو نوسینانەیە کە لەم بارەوە نوسراون و هەر هەمووشیانم لەبەردەست نەبووە، هەروەها نەمتوانیوە سود لە دەستنووسەکان وەربگرم.

جا لەبەر ئەوەی لە خستنەرووی بابەتەکانی ئەم کتێبە بە کورتی بڕیومەتەوە، ئەو سەرچاوانەم فەرامۆش کردوون کە پشتم پێ بەستوون، مەگەر شتێکم دەقاودەق وەرگرتبێ و بێ دەستکاری گواستبێتمەوە. حەیفێ کە ناتوانم منەتباری خۆم بۆ زانایانی وەك: دیتریسی و دی گۆی و گۆڵد نزیهر و هۆتسما و ئۆگست مۆلەر و مۆنك و نۆلەکە و رێنان و سنۆك هۆرگردنی و شتەینشنەیدر و فان فلۆتن و زۆری تر دەربڕم کە هاوکارم بوون بۆ تێگەیشتن لەو سەرچاوانەی بەکارم هێناون.

دوای ئەوەی ئەم کتێبەم تەواو کرد، لێکۆڵینەوەیەکی تێروپڕ لەمەڕ ئیبن سینا[**] بلاوکرایەوە کە زۆرێك لە مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی خستبووە بەر باس، بەڵام ئەو لێکۆڵینەوەیە وای لێ نەکردم هیچ شتێك لە کتێبەکە بگۆڕم.

ئەوەی پەیوەستە بە سەرچاوەکان ئەوە خوێنەر رادەسپێرم بگەڕێنەوە بۆ ئەو کتێبانە ی لەمەڕ زانست و فکر لە خۆرهەڵات نووسراون:

---

(*) Munk; me langes de philosophie juive et arabe, 1859.

(**) Carra de vaux; avicenne. Paris, 1900.

.Die Orientalische Biblographie

.Brockelmanns Geschichte der Arabischen Literature

هەروەها بگەڕێنەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی لە کتێبەکەی ئۆبەرڤیچ (Uberweg) لەمەڕ مێژووی فەلسەفەدا هاتوون.

بەڵام من لێکۆڵینەوەکەم بەگوێرەی توانا بەسەر فەیلەسوفانی ئیسلامدا کورت کردۆتەوە و زۆر بە کورتیش نەبێ باسی ئیبن جەبرون و ئیبن مەیمونم نەکردووە، هەروەها ئەو فەیلەسوفانەشم فەرامۆشکردووە کە بە فەیلەسوفی جولەکە دادەنرێن، گەرچی لەرووی فەلسەفییەوە دەچنە ناو بازنەی کولتوری ئیسلامی، بەڵام ئەمە نابێتە ڕێگر لە سودگەیاندنی ئەم کتێبە بە خوێنەر.

تاکو ئێستا کتێبی زۆر لەمەڕ فەیلەسوفانی جولەکە نوسراون، بەڵام فەیلەسوفانی ئیسلام بە تەواوی فەرامۆش کراون.

T. J. De BOER

.(Groningen (Netherlands

# ١- دەروازە

## ١- نیشتیمانی کۆنی عەرەب:

### ١- شانۆی رووداوەکان

بیابانی عەرەبستان لە کۆنەوە هەروەکو ئەمڕۆ شوێنی گەڕان و بزاوتی هۆزە کۆچەرییە سەربەخۆکان بووە، ئەو کۆچەرییانە بە هزرێکی ساخلەم و ئازادەوە لە ژیانی خۆیان ڕادەمان کە بە یەك چەشن بەڕێوەدەچوو. هێرش و تالآن، خۆشی و ئۆخژنی پێ دەبەخشین، زەخیرەی ئەقڵییان هەر ئەو زەخیرەیە بوو کە هۆزەکان نەوە دوای نەوە بە میرات جێیان هێشتبوو.

هیچ بەرهەمێکی وایان نەبووە کە بە کۆشش و هەماهەنگی کۆمەڵایەتی پێگەیشتبن، هەروەها هیچ شوێنەوارێکی هونەری جوانیشیان نەبووە زادەی خۆشگوزەرانی و دەستبەتاڵی بووبێت، لە شارستانیەتیشدا نەگەیشتوونەتە پلەیەکی بڵند، تەنها لە دەوروبەرەکانی ئەو بیابانەدا نەبێت، هەر شتێکیش لەو وڵاتانە دروست بووبێ زۆرجار وەبەرهێرشی ئەو کۆچەرییانە کەوتووە.

لە باشوریش رەوشەکە هەروابوو، هەر لە دەوڵەتی کۆنی (سەبەئـ)ـەوە تا دەگات بە چەرخی مەسیحایی لە ژێر قەڵەمڕەوی حەبەشییەکان و فارسەکاندا.

لە رۆژئاوایشەوە مەککە و مەدینە (یسرب) دەکەوتنە سەر رێگەیەکی کۆنی بازرگانی، مەککەش بە شێوەیەکی تایبەت بەهۆی بازاڕەکانی و بوونی لە نێو چنگی (البیت الحرام)، بووبووە سەنتەری بزاوتێکی بەهێزی بازرگانی.

بەڵام لە باکوور دوو مەملەکەتی عەرەبی دروستبوون کە بۆخۆیان هەندێ دەسەڵات و سەروەرێتیان هەبوو، واتە مەملەکەتی (خومییەکان) لە (حیرە) لەسەر سنورەکانی (فارس)، مەملەکەتی (غەساسنە) لە (شام) لەسەر سنورەکانی (رۆم).

یەکیەتی نەتەوەیی عەرەب بەر لە دەرکەوتنی (پەیامبەری ئیسلام) لەزمان و شیعرەکانیاندا دەرکەوت، شاعیرەکان لە کن نەتەوەکانییان ئەهلی زانست و زانابوون، قەسیدەکانیشیان لەسەرەتادا پێگەی سروشتی کاهینەکانی هەبوو، بەتایبەت لەلای هۆزەکانی خۆیان، زۆربەی جار کاریگەری ئەو شاعیرانە لە سنوری هۆزەکانی خۆیان واوەتر دەچوون.

**٢- خولەفای راشیدین، مەدینە، شیعە:**

پەیامبەر خۆی و یارانی: ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی (٦٣٢-٦٦٢ زایینی) توانی گیانی یەکگرتویی، لەدەروونی بیابانشینانی ئازاد و لەدەروونی خەڵکە شارستانیترەکەی دەورووبەریش زیندووبکاتەوە، هۆکاری ئەم سەرکەوتنەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو پێگەیەی کە ئیسلام وەکو ئایینێکی جیهانی دایڕشتبوو، خودا راستی فەرموو کە پەیمانی سەرکەوتنی بە موسڵمانان دا. وەکو ئەوەی پشتگیری خودا بۆ موسڵمانان وەڵامدانەوەی بانگەوازەکەیان بوو کە لەکاتی رووبەرووبوونەوەی دوژمناندا دەیانگوت (الله اکبر)، کاتێك وەکو فەتحکەرێك لە دوڕگەکەیان وەدەرکەوتن، جیهان لە هەمبەریان بچوك بووبووە و هەر هەموو جیهانیان لە دووتوێی فەتحەکانیاندا دەق و نوشت کرد.

زۆری پێ نەچوو سەرپاکی وڵاتی فارسیان فەتح کرد، هەروەها عەرەب باشترین دوو ویلایەتی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی رۆژهەڵاتیان بۆ خۆیان داماڵی، واتە: میسر و شام.

مەدینە بارەگانی یارانی سەرەتای پەیامبەر بوو، پاشان عەلی توانی بەسەر ئەوانی تردا سەر بکەوێ و کوڕەکانیشی بەسەر مەعاویەدا سەرکەوتن و توانیان شام بخەنە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیان، ئا لەو کاتیەوە گرووپی شوێنکەوتوانی عەلی سەریان هەڵدا، واتە شیعە[1].

(١) کەوایە بنەڕەتەکانی شیعەی سیاسی، عەرەبی و ئیسلامیە، پاشان لە ئامانج و پرەنسیپەکانیدا بە فاکتەری نەتەوەیی و فەلسەفیی کاریگەربووە، بڕوانە کتێبی (**الحضارة الاسلامية) ادم متز، ط**، القاهرە،

ئەو گرووپە هەر داکۆکی لە خۆی کرد، بە تێپەڕبوونی مێژوو وێنەی جیاوازی بەخۆوە گرت، جاروبار ملکەچی هێز دەبوو، جارجارەش لەهەندێ شوێن دەگەیشتە دەسەڵات، تا دوایین جار (١٥٠٢ز) لە ئیمپراتۆریەتی فارسی شیعە خۆی دەرخست و بە یەکجاری لە ئیسلامی سوننە جیابۆوە.

بە هەر چەکێك کە دەستیان پێ گەیشتبا تەنانەت بە زانستیش، رووبەرووی هەر حکومەتێکی دونیایی دەبوونەوە، سەرەتا لە نێویاندا گرووپی (کیسانی)[٢] دەرکەوتن، ئەمانە (ئیمامی عەلی و کوڕەکانی) بە سوپەرمان دەزانن و زانستێکی نهێنیان وەپاڵ داون کە لەسەرووی سروشتی مرۆییەوەیە و تەنها بە کۆمەکی ئەو زانستەیش دەکرێ لە سرووشی خودایی (وەحی ئیلاهی) تێ بگەین، لە شیعەدا هەر کەسێك بیەوێ بەو زانستە بگات نابێ بڕوابوونی بە پاکژی ئەو کەسەی ئەم زانستەی هەیە و مل بۆ کەچکردنی، کەمتر بێ لە خودی دەقی قورئان.

## ٣- ئەمەوییەکان، دیمەشق، بەسرە و کوفە:

دوای ئەوەی معاویە سەرکەوت و دیمەشقی کردە پێتەختی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی، وای لێهات پلە و پێگەی مەدینە لە رووی روحییەوە لە کورتی دا، بۆیە ناچاربوو تەنها دەست بە شەریعەت و فەرموودەوە بگرێ، لەمەشدا تارادەیەك لە ژێر کاریگەری جولەکە و مەسیحاییەوەبوو.

بەڵام لە دیمەشقدا دەبینین بەنی ئومەییە (٤٠-١٣٢ کۆچی) (٦٦١-٧٥٠ زایینی) حوکمەتێکی سیکۆلاریان دامەزراند، لە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەواندا ناوچەی دەوڵەتی ئیسلامی هەر لە زەریای ئەتڵەسەوە درێژ دەبۆوە بۆ ئەودیو سنورەکانی هیند و تورکستان،

---

١٩٤٧ ج١، ص٧٧، ٩٤-٩٧، هەروەها بڕوانە المللی الشهرستانی کە قسەی لەبارەی ئیسماعیلیە و گرووپەکانی کردووە. (و.ع).

(٢) ئەمانە شوێنکەوتوانی (کیسان)ی لایەنگری عەلی بوون، هەروەها قوتابی محمد بن الحنفه بووە کە ساڵی ٨١ کۆچیی مردووە. کیسانییەکان پێیان وابووە، ئایین ملکەچبوونە بۆ کەسێك کە شارەزایی هەموو زانستەکان و تەئویل و زانستەکانی دیکەیشە (و.ع).

هەروەها هەر لە دەریای باشوورەوە تا وڵاتی قەوقاز و شورەکانی قوستەنتینیە، بەڵام ئەمە ئەوپەڕی سنوری دەوڵەتی ئیسلامی بوو.

عەرەب لە هەموو شوێنێك پێیان وابوو ئەوێ شوێنی فەرمانڕەوایەتی کردنە، بۆیە بوون بە چینێکی ئەریستۆکراتی جەنگی، جوانترین بەڵگەش بۆ رادەی کاریگەربوونیان بەوەی میللەتێکی باڵادەستن و هیچ شارێکیش نییە لە شارەکانی عەرەب پێشکەوتووتر و کۆنتر، ئەوەبوو هەر شوێنێکیان فەتح دەکرد زمانی عەرەبییان دەکرد بە زمانی ئەو شوێنە، ئیدی وای لێهات زمانی عەرەبی بووە زمانی ئایین و دەوڵەت و شیعر و زانست.

پێگە باڵاکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و سوپا بەعەرەب دەسپێردرا، ئەمەش وایدەکرد هونەر و زانست لە دەستی میللەتانی ناعەرەب و نەژادتێکەڵاوەکان بێت[٣]، لە شامدا عەرەبەکان لە مەسیحیەکانەوە فێری شت دەبوون.

بەڵام مەزنترین بارەگانی کولتوری ئەقڵانی لە بەسرە و کوفە بوو، لەویادا عەرەب و فارس، ئیسلام و مەسیحی، جولەکە و مەجوس پێگ دەگەیشتن، هەر لەویادا بازرگانی و پیشەسازی گەشەی سەند، هەروەها دەبێ هەر لەوێدا سۆراخی سەرەتاکانی زانستی ئەقڵانی –دونیایی بکەین، ئەو سەرەتایانەی لە ژێر کاریگەرییەکانی مەسیحی – یۆنانی ( Hellenistic-Christian) و فارسیدا سەری هەڵدا.

### ٤- عەبباسییەکان – بەغدا:

دەوڵەتی عەبباسی (٧٥٠-١٢٥٨ز) پاش دەوڵەتی بەنی ئومەیە دامەزرا، جا بۆ ئەوەی عەبباسییەکان بگەن بە دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری، ناچاربوون لەگەڵ فارسەکاندا رێکبکەون و ملکەچی داخوازییەکانیان بن، ئینجا بەرگێکی ئایینییان وەبەر بزوتنەوە سیاسیەکانیاندا کرد و خستیاننە خزمەتی بەرژەوەندیەکانیانەوە.

لەسەدەی یەکەمی دەوڵەتەکەیاندا (واتە نزیکەی ٨٦٠ز) مەزنایەتی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی لە گەشەسەندندا بوو، یا لانی کەم توانی وەکو خۆی بمێنێتەوە، لە ساڵی (٧٦٢ز)

---

(٣) ئیبن خەلدونیش لە مقدمەکەیدا (**الفصل السادس و الثلاثین**)دا دەڵێ: "زۆرینەی ئەوانەی سەرقاڵی زانست بوون، عەجەمەکان بوون)، بەناوهێنانی هەندێ کەسیش قسەکانی پشت راست دەکاتەوە. (و.ع).

مەنسوری دووەم خەلیفەی عەبباسییەکان شاری بەغدای دامەزراند، تا لە بری دیمەشق ببێتە پێتەختی ئیمپراتۆریەت.

هەر زوو لە رووی جوانی و شکۆوە دیمەشقی وەپاش دا و لەرووی گەشە و نەشونمای فیکرییەوە بەسەر کوفە و بەسرەدا سەرکەوت و مەگەر قوستەنتینیەی پێ بەراورد کرابا، کۆشکەکانی مەنسور (٧٥٤ -٧٧٥ز)، رەشید (٧٨٩ -٨٠٩ز)، مەئمون (٨١٣-٨٣٣ز) و زۆری تر لە بەغدا بوون بە مەڵبەندی کۆبونەوەی شاعیران و زانایان و بەتایبەت لە رۆژهەڵاتی ئیمپۆراتۆریەتەکەوە، زۆرێك لە خەلیفەکانی بەنی عەبباس سەوداسەری کولتوری ئەقلانیبوون، جا چ بۆ خۆیان بوایە یا بۆ جوانترکردنی مەملەکەتەکەیان. ئەوان ئەگەر بە تەواویش مافی زانا و هونەرمەندانیان نەدابا، ئەوەندە خەلاتیان پێ دەبەخشین تا ستایشیان بکەن و بە بالایاندا هەڵبڵێن.

لەسەردەمی هاروونە رەشیدەوە تەنانەت تا خودی مەنسوریش لە بەغدا لانی کەم کتێبخانەیەك و پەیمانگایەکی زانستی هەبوو. ئینجا لەسەردەمی مەئمون و بەتایبەتیش دوای مەئمون[٤]، دەستکرا بە وەرگێڕانی زانست و زانیاری یۆنان و بەزۆریش لە رێگەی زمانی سریانیەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی. ئەمجا پوختە و راڤەی کتێبە یۆنانییەکان نوسران، تەنانەت گەرچی ئەم چالاکیە زانستییە گەیشتبووە ئەوپەڕی چڵەپۆپە، بەڵام شکۆی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی لەسەروەختی داکشاندابوو. لەسەردەمی بەنی عەبباسدا دەرەبەگایەتی و دەمارگرژی هۆزگەری کە هەرگیز لەسەردەمی بەنی ئومەیە خامۆش نەبوو، تەنها بە شێوەیەکی رووکەش جێگەی بۆ یەکەیەکی سیاسی تۆکمە و توندوتۆڵ چۆڵ کرد، هەروەها ناکۆکی و دووبەرەکیەکانی دیکەش بەتەوژمتر و توندتربوون، وەکو مشتومڕ لەمەڕ بابەتی کەلام و مشتومڕی فەلسەفیی میتافیزیکی، هەروەکو ئەوەی لەسەروەختی رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیای رۆژهەڵات روویدا.

---

(٤) وەرگێڕان لەسەردەمی بەنی ئومەیە دەستی پێکرد، خالد بن یزید بن معاویە فەرمانی وەرگێڕانی کتێبە پزیشکی و ئەستێرەناسی و کیمیاگەرییەکانی دەرکرد، دەڵێن ئەوە سەرەتای وەرگێڕان بووە لە ئیسلامدا، وێڕای ئەوەش لە رۆژگاری حەجاجدا دیوان لە فارسییەوە وەرگێڕدراوە، هەروەها کتێبی (اهرون القس) بە فەرمانی عمر بن عبدالعزیز وەرگێڕدراوە. (و.ع)

بەڵام خزمەتکردنی دەوڵەت لە ژێر سایەی فەرمانڕەوایەتی دیکتاتۆری لە ڕۆژهەڵاتدا، تەنها پێویستی بە چەند پیاوێکی زیرەك و لێهاتوو هەبوو، زۆرێك لە بەهرەدار و پیاوە لێهاتووەکان لە نێو خۆشگوزەرانی و رابواردندا لەنێو چووبوون، ئەوانی دیکەش کەوتبوونە نێو سەفستە و یاریکردن بە وشەکان و سۆراخکردنی زانست، کەچی خەلیفەکان بۆ پاراستنی ئیمپراتۆریەتەکەیان پەنایان بردبووە بەر پرس و راکردن بە هێزی گەلانی زیرەك و دوور لە خۆشگوزەرانی شارستانی. لەسەرەتاشدا پرس و رایان بە خوراسانییە ئێرانییەکان یا ئێرانیکراوەکان کرد، پاشان بە تورکەکان.

## ٥- وڵاتە بچوکەکان – رووخانی خەلافەت:

هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەت وردە وردە دەردەکەوت، سوڵتانی سەربازە تورکەکان، شۆڕشی گشتی لە شاران، شۆڕشی جوتیارانی گوند، پیلانگێڕی شیعە و ئیسماعیلیەکانیش لە هەموو کون و قوژبنێك، جا مەیل و خواستی ویلایەتە دوورەکان بۆ سەربەخۆیی، هەموو ئەمانە هۆکار و ئاماژەی رووخانی ئیمپراتۆریەت بوون.

تورکەکان لە کۆشکی خەلیفەکان بوون بە سکرتێر، واتە بوون بە سوڵتان لە پاڵ سوڵتانی خەلیفەکان، جا پێگەی خەلیفەکان لە کورتیدا و تەنها پلە و پایەی ئایینییان مایەوە، جا وردە وردە لە دەوروبەری ئیمپراتۆریەت وردە دەوڵەتی سەربەخۆ دروستبوون.

تەنانەت مەسەلەکە بووە هۆی دەرکەوتنی (مەلیکەکانی دەوروبەر) هەروەها ئیمارەتی کەم یا زۆر سەربەخۆ دەرکەوتن، گەورەترینیان لە رۆژئاوای ئیمپراتۆریەت بوون، وەکو بەنو ئەغلەب لە باکوری ئەفریقیا دەرکەوت – هەڵبەت ئەگەر دەوڵەتی بەنی ئومەیە لە ئەندەلوس لەبەرچاو نەگرین- هەروەها تۆڵۆنیەکان و فاتمیەکانی میسر، بەنو حەمدان لە شام و جەزیرە، تاهیریەکان و ساسانیەکان لە رۆژهەڵات، تورکەکانیش وردە وردە وڵاتەکەی خۆیان لە دارودەستەی ئیمپراتۆریەت پاك کردەوە.

زانایان و شاعیران لە چەرخی دووەمی (سەدەی سێ و چوار) لە کۆشکی ئەو بنەماڵە بچوکانە دەدۆزرانەوە. بۆماوەیەکی کورت حەلەب کە بارەگای بەنی حەمدان بوو، توانی لە بری بەغدا ببێتە مەڵبەندی بزووتنەوەی ئەقڵباوەڕی، قاهیرەش کە (فاتمیەکان) لە ساڵی (٩٦٩ز) دایانمەزراندبوو، توانی بۆ ماوەیەکی پتر لە (حەلەب) ببێتە مەڵبەندی بزاوتی

ئەقلانی، پاشان مەحمود غەزنەوی تورکی هات کە ساڵی (٣٨٩کۆچی) بووە فەرمانڕەوای خوراسان[٥]، ماوەیەکی زۆر کورت کۆشکەکەی ئەو لە ڕۆژهەڵاتدا پەرەی سەند.

لەسەردەمی ئەم دەوڵەتە بچوکەدا کە فەرمانڕەوایەتی لەدەستی تورکێکدا بوو، قوتابخانەیەکی ئیسلامی دامەزراند و یەکەم قوتابخانەشی ساڵی (١٠٦٥ز) لە بەغدا دامەزراند[٦].

لەو کاتەدابوو ڕۆژهەڵات بوو بە خاوەنی زانست، بەڵام ئەو زانستە تەنها گێڕانەوەی کتێبەکانی پێشووتربوو بەبێ دەستکاری، قوتابی ئەوەی لە مامۆستاکانی خۆی فێریان بووبوو دەیدایەوە بە قوتابییەکانی، بەرادەیەك لە کتێبە تازەکاندا هیچ ڕستەیەك نەبوو لە کتێبە کۆنەکانەوە وەرنەگیرابێ، ئا بەم شێوەیەش زانست لە لەنێوچوون قوتاری بوو.

بەڵام دەگێڕنەوە کاتێك زانایانی ئەودیو ڕووبار بیستیان قوتابخانە دامەزراوە، بەهۆی کۆچکردنی زانینەوە پرسەیان گرت، ئا لەم کارەشیاندا بە هەڵەدا نەچووبوون[٧].

پاشان لە سەدەی حەوتی کۆچی هێرشەکانی تەتار دەستی پێکرد و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیان ڕامالّی، ئەوەی کە تورکەکانیش پاراستبوویان، ئەوان لەناویانبرد. پاش ئەمە لەو وڵاتەدا ڕۆشنبیریەك گەشەی نەکرد کە بکرێ لێیەوە هونەرێك تازە لە دایك بێتەوە، یا خەمی زیندووکردنەوەی زانستەکان بوروژێنێ.

---

(٥) ئەو پیاوە، ئەبو قاسم محمود بن ناصر الدولە أبی منصور سیکتکین الغزنوی-یە. (و.ع).

(٦) نوسەر مەبەستی قوتابخانەی نیزامیە کە نیزامولمولکی وەزیری سوڵتانی سەلجوقی ئەلب ئەرسەلان دامەزراندووە. (و.ع).

(٧) بڕوانە Snouck hurgronje, mekka, II,S, 228f، بەڵام سنوك هۆرگرۆنی لە زمانی یەکێك لە مێژوونوسانەوە دەگێڕێتەوە کە زانایانی ئەودیوی ڕووبار پێیان وابوو زانست شتێکی باڵایە، دەروونەکان داوای دەکەن تا هەم زانست پایە بەرز بێت و هەم خۆیشیان پایە بەرز بن، بۆیە ئەگەر زانست قوتابخانەی بۆ کرایەوە و مامۆستای بۆ دیاری کرا ئەوە کەرامەتی زانست لەکەدار دەبێ و لەپێگە و پلەوپایەیەی دێتە خواری، هەروەها بوونی قوتابخانەی ڕەسمی زەمینەخۆش دەکات بۆ دەروونە پیسەکان کە داوای زانست بکەن نەك بۆ ئەوەی پلە و پایەیان بەرز بکاتەوە، بەڵکو بۆ مەبەستی ماددی دونیایی، ئا ئەمەش دەبێتە هۆی پاشەکشەی زانست، بێ ئەوەی پلە و پایەیان پێی بەرز ببێتەوە. (و.ع).

## ٢- حیكمەتی ڕۆژهەڵاتیانە

**١- تێڕوانینی ئەقڵیانە لەلای سامییەكان:**

ئەقڵی سامی بەر لە پەیوەندیكردن بە فەلسەفەی یۆنانییەوە لە پشت وتە و پەندە حیكمەت ئامێزەكانەوە هیچ فەلسەفەیەكی نەبوو، هەروەها ئەو بیركردنەوە سامییانە كە پشتی بە ڕوانگەی سروشتباوەڕی لێكجیا دەبەست، بەشێوەیەكی تایبەتیش پشتی بە سەرنجدانی مرۆڤ و چارەنوسەكەی دەبەست، گەر ئەقڵی سامی ڕووبەڕووی شتێك بووبا و نەیتوانیبا پەی پێ ببات، دەستبەجێ دەیگەڕاندەوە بۆ ویستی خودا كە هیچ شتێك دەستەوەستانی ناكا و ئێمە بەمەودا و نهێینەكانی بەڵەد نین. ئێمە ئەم جۆرە حیكمەتە لە (تەوراتدا) دەبینین، لە تەوراتدا لە چیرۆكی (سەبەئی شاژن) و ئەوەی باسی لوقمانی حەكیم دەكات ئاماژە بەو شێوازە حیكمەتە دەكات لە نێو عەرەبەكاندا پەرەی سەندووە، هەروەك ئەوەی لە پەندە عەرەبییەكاندا هاتووە.

لە پاڵ ئەو حیكمەتەشدا لە هەموو شوێنێك سیحر و جادوبازی بەرچاو دەكەوێ، جادووگەریش مەعریفیەك بووە خاوەنەكەی توانیویەتی هەڵسوكەوت بە شتەكانەوە بكات.

بەڵام هیچ تێڕوانینێكی زانستیانە تر لەمەیان لەمەڕ جیهان نەبووە، مەگەر كەشیشەكانی بابلی كۆن نەبێت.

ئێمە ئەو هۆكارانە نازانین كە بوونەتە هۆی ئەو زانینە پوختە، هەروەك ڕادەی زانستیشیان نازانین، تێڕوانینی ئەو كەشیشانە لەمەڕ بوونی سەرزەمینی پشێودا گۆڕا بە سیستەمێكی گەردووناسی، ئەوانە وەكو ئەو (عیبرانیانە) نەبوون كە لە زانستدا سنوری سەرسامبوون بە گەردوونیان تێنەپەڕاند[٨]، ئەوان ئەستێرەی بێ ئەژماریان تەنها بە هێمای نەوەی دوارۆژی خۆیان دەزانی[٩]، بگرە پتر بەو یۆنانیانە دەچوون كە لەمیانی جوڵەی هاوسەنگ و

---

(٨) **كتێبی أیوب، الاصحاح السابع و الثلاثین و الثامن و الثلاثین،** باسی ئەم شتە دەكات. **(و.ع)**

(٩) سفری التكوین، الاصحاح الخامس عشر، قسەكانی نوسەر پشت ڕاست دەكاتەوە. (و.ع).

هاوئاهەنگی ئەستێرەکانەوە پێیان وابوو جیهان یەك شتە، پاشان پەییان بە شتە هەمەجۆر و زۆر و زەبەندەکانی سەرزەوی برد.

ئەو کەشیشانە لە زانستدا هیچ کەموکوڕییەکیان نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت ئەفسانەی ناو خەیاڵەکانی خۆیان تێکەڵ بە شتە راست و دروستەکان دەکرد، سەرچاوەی تێکەڵکردنی زانیاری نادروست، ئەستێرەناسی بوو، لەلای یۆنانیەکانیش هەرهەمان شت بوو.

لە رۆژگاری ئەسکەندەری مەزندا بیروباوەڕی رۆژهەڵاتیانەی یۆنان و پاشان بیروباوەڕی مەسیحایی درەنگوەختی بەرەنگ و بۆی فەلسەفەی یۆنانیەوە، دزەیانکردە نێو حیکمەتی (کلدانییەکان) لە بابل و شام.

دەکرێ بڵێین ئەو بیروباوەڕانە جێگەیان بەو حیکمەتە چۆڵکرد. جگە لە شاری (حەڕان) نەبێت، بتپەرستی کۆن تا سەردەمی ئیسلام پێگەی خۆی لە دەست نەدا، ئەو بت پەرستیەش کەمێك کاریگەربوو بە مەسیحایی.

## ٢- ئایینی فارسی، رۆژگارباوەڕی:

حیکمەتی هیندی و فارسی پتر لە داب و نەریتی سامی کاریگەرییان خستە سەر موسڵمانان، پێویستیش ناکات بچینە ناو ئەو بابەتەی کە ئایا سەرەتا حیکمەتی رۆژهەڵات کاریگەربووە بە فەلسەفەی یۆنانی، یا فەلسەفەی یۆنانی کاریگەربووە بە حیکمەتی رۆژهەڵاتی.

لە رێگەی سەرچاوە عەرەبیەکانەوە بە یەقینی دەردەکەوێ موسڵمانان راستەوخۆ کاریگەربوونە بە فارس و هیندیەکان، ئەمەش لەم رووەوە تارادەیەك بێ خەمان دەکات.

وڵاتی فارس وڵاتی دوالیزمباوەڕانە (Dualisumus)، رێشی تێدەچێ ئامۆژگارییە ئایینەکانی فارس بە مەزهەبی دوالیزمیشەوە، کاری کردبێتە سەر ناکۆکیە کەلامیەکان لە ئیسلامدا، جا چ کاریگەرییەکی راستەوخۆ بێت یا لە رێگەی (مانەوەیـ)ـەوە بێت یا لە رێگەی گرووپ و دەستە (گنوسیەکانی)[١٠] ترەوە. بەڵام مەزهەبی (زرڤانیزم - رۆژگار— Zrwanisumus) وەکو دەگێڕنەوە لەسەردەمی (یەزدەگری دووەم)ی دەوڵەتی ساسانی

(١٠) کۆمەڵەیەکی ئایینی فەلسەفیی بوون لە هەردوو سەدەی یەکەم و دووەمی زایینی وەدەرکەوتن، رەوتێکی سۆفییزمیانەیان هەبوو و هەوڵی تەباکردنی سەرجەم ئایینەکان و تێکەڵکردنی ئایین و فەلسەفەییان دەدا. (و.ع).

(٤٣٨-٤٥٧ز) بووەتە ئایینێکی باو و خەڵکی دانیان پێدا ناوە، ئەم ئایینە پتر لە ئایینەکانی تر کاری کردۆتە سەر ئەو بیرمەندانەی کە بیرکردنەوەیان نائایینی بووە.

لەم مەزهەبەدا تێڕوانینی دوولایەنە (دوالیزمی) بۆ گەردوون رەتکرایەوە، رۆژگاری بێ کۆتایی (زرڤان) کرا بە بنەمای باڵا، هەر ئەو رۆژگارەش چارەنووس یا فەلەکی گەردوونی پان و بەرین یا جوڵەی ئەستێرەکان دیاری دەکات. ئەم مەزهەبە توانی سەرنجی لایەنگرانی هزری فەلسەفیی بە لای خۆیدا رابکێشێ، هەروەها پێگەیەکی بڵندی لە ئەدەبی فارس و بیروباوەڕی میللیدا بۆخۆی بونیادنا، کە تاکو ئەمڕۆش هەر ماوە، جا چ لە ژێر پەردەی ئیسلامدا بێت یا نا.

بەڵام کەلامناسانی ئیسلام و فەیلەسوفانی ئایدیالیزم وەکو چۆن ماتریالیزم (Materialimus) و بێ بڕوا و ئەو جۆرە شتانەیان رەتدەکردەوە، ئاوا مەزهەبی رۆژگارباوەڕانیان رەتدەکردەوە.

### ٣- دانایی هیندییانە:

هیند بە وڵاتی راستەقینەی حیکمەت دادەنرێ، زۆرجار نوسەرانی عەرەب لە کتێبەکانیاندا دەڵێن حیکمەتی هیند (مەعدەنی فەلسەفەیە).

عەرەب لەسەروەختی ئاشتیدا، لەرێگەی بازرگانیەوە بە حیکمەتی هیند ئاشنابوون، کە زۆرینەی جار فارسەکان پردی نێوان عەرەب و هیندیەکان بوون، جگە لە بازرگانی بەهۆی فەتحکردنی هیندیش لەسەردەستی موسڵمانەکان، هۆکاری ئاشنابوونی عەرەب بوو بە حیکمەتی هیندی.

لە سەردەمی مەنسور و (٧٥٤-٧٧٥ز)، رەشیددا (٧٨٩—٨٠٩ز) زۆرێك لەو حیکمەتە هیندیانە وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی، دیارە هەندێك لەو حیکمەتانە لە زمانی فارسییەوە (زمانی پەهلەوی)ەوە وەرگێڕدران، هەندێکی دیکەیشیان راستەوخۆ لە زمانی سانسکریتیەوە. چەندین ووتە لە حیکمەتی ئەخلاقی و سیاسی لە چیرۆك و ئەفسانە هیندییەکانەوە وەرگیران وەك چیرۆکی (پانچاتانترا) و چەندینی تر، کە ئیبن مەقفەع لەسەردەمی مەنسوردا لە زمانی پەهلەویەوە وەریگێڕان.

هەرچەندە زانستی بیرکاری هیندی و ئەستێرەناسی پەیوەست بە پزیشکی پراکتیکی و جادوو، کاریگەرترین شت بون لەسەر سەرەتاکانی حیکمەتی ئەقڵانی لە ئیسلامدا، عەرەب بە

کتێبی ئەستێرەناسی (سێد هانتا Sidd Hanta) بەرهەمکبۆست ئاشنابوون، ئەو کتێبەی کە نزاری لەسەردەمی مەنسوردا بەهاوکاری زانایانی هیند وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی، هەڵبەت بەر لەوەی ئاشنای کتێبی (مەگەستی) بەتلیمۆس بن.

ئا بەو شێوەیە عەرەب ئاسۆیەکی فراوانیان بەسەر جیهاندا کردەوە، کە رابردوو و ئاییندەشی لەخۆ دەگرت، مێژووناسانی عەرەب بەهۆی ساویلکەییانەوە تا ئاستی شڵەژان، سەرسامی ئەو ژمارە زۆرەبوون کە هیندییەکان لە ژمێرەکردندا بەکاریان دێنا، هەروەها لەلایەکی ترەوە زۆرێك لە بازرگانانی عەرەب لە هیند و چین تەمەنی جیهانیان بە چەند هەزار ساڵێك دەخەملاند، بەم بۆچوونەشیان دەبوونە جێگەی قەشمەری و لاقرتێ.

هەروەها موسڵمانەکان بێ ئاگا نەبوون لە بیروباوەڕی لۆژیکی و میتافیزیکی هیندییەکان، گەرچی کاریگەری ئەم بیروباوەڕانە لە پەرەسەندنی زانستیدا کەمتربوو لە کاریگەری بیرکاری و ئەستێرەناسی، بێگومان تێڕامانی هیندییەکانی پەیوەست بە چەپاندنە پیرۆزەکەیان و وابەستەبوونێکی توندی ئایینی کاریگەرییەکی فراوانی بەسەر سۆفیگەری فارسی و ئیسلامییەوە هەبوو[11].

بەڵام گومانی تێدا نییە فەلسەفە بەرهەمی ئەقڵی یۆنانی بوو، کارێکی باش ناکەین گەر لەم کتێبە پتر لە پێویست گرنگی بە بیروباوەڕی منالانەی سۆفیە هیندییەکان بدەین. ئەو سۆفیە قوڵ تێڕامانکەرانە کە بۆ خۆپاکژکردنەوە لە گوناه خۆیان ئەشکەنجە دەدا، پێیان وابوو هەموو ئەو شتانەی هەستەکان پەییان پێ دەبەن دیاردەگەلی لەخشتەبەرن، واتە شتی وەکو شیعر و جادووی شیعر، ئەمەش رێك هەمان ئەو شتە بوو کە لە مەزهەبی نوێ فیساگۆرسیەکان و مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان گەیشتە رۆژهەڵات، ئەم دوو مەزهەبە پێیان وابوو هەموو شتەکانی سەرزەوی ساختە و لەخشتەبەرن. گەرچی هیندیەکان لە تەفسیکردنی دیاردەکانی گەردوون، یا زیندووبوونەوەی زانستیانەی روح، شتێکی مەترسیداریان باس نەکردووە، دیارە لەمەشدا بە رادەیەکی زۆر کەم بە فیساگۆرس یا ئەفلۆتین کاریگەربوون.

---

(١١) پێویستە سۆفیگەری راستەقینەی ئیسلامی لەرووی سەرهەڵدان و ئامانج و ئامراز و بیروباوەڕەوە جیا بکرێتەوە. ئامانجی قەلەندەر یا سۆفیەکی هیندی جیاوازە لە ئامانجی سۆفیەکی موسڵمان، هەروەها بیروبۆچوونی هەردووکیشیان لەمەڕ زاتی ئیلاهی و ئامرازەکان و ئاکامی سۆفیگەریش لە هەردوو حاڵەتەکەدا جیاوازە. (و.ع).

بەڵام بۆ ئاراستەکردنی هزر، بەرەو ناسینی حەقیقەتی شتە دەرەکیەکان، پێویستمان بە خەیاڵی هیندی نییە، بەڵکو پێویستمان بە ئاوەزی یۆنانییە. لە بیرکاریناسی عەرەبیدا باشترین بەڵگەی ئەو قسانەی سەرەوە دەبینین، هەروەها بەڕای باشترین زانایان ئەوانەی لەم بارەوە پشتیان پێ دەبەستریٚ، پێیان وایە تەنها ژمێرە لە بیرکاریدا توخمێکی هیندیە، بەڵام جەبر و ئەندازە رەوتێکی یۆنانین، با ئەم بۆن و بەرامە یۆنانیەشیان پێوە دیار نەبێت.

خەریکە بێژم هیندیەك نابینیەوە پەی بە بیرکاری پەتی-دا بردبیٚ، چونکە ژمارە هەرچەند زۆریش بێت لەلای ئەوان هەمیشە شتێکی ماددی بەرهەست بووە، لە فەلسەفەی هیندیدا زانین ئامرازە.

دەروێش و سۆفیەکانیان پێیان وابوو (بوون) خراپەیە و قوتاربوون لێی ئامانجە، فەلسەفەشیان بە رێگەی ژیانێکی بەختەوەر دەزانی، لە پێناو ئەمەشدا حیکمەتی هیندی هەر لەسەر یەك چوارچێوە مایەوە و نویٚ نەبۆوە، ئەو حیکمەتە بەرەو کۆکردنەوەی هەموو شتەکان لە یەك شتدا ئاراستە کرابوو، ئەمەش بە پێچەوانەی مەعریفەی یۆنانی بوو، زانینی یۆنانی لە فرە ئاراستەیی خۆیدا هەوڵی دەدا لە هەموو روویەکەوە پەی بە بکەرەکانی سروشت و بکەرەکانی ئەقڵ ببات.

لە حیکمەت و ئەستێرەناسی و زانیارییە گەردوونیەکانی رۆژهەڵات، بابەتی هەمەجۆر کەوتە بەردەستی بیرمەندانی ئیسلام، بەڵام ئەو فۆرمەی کە ئەو مادەیەی تیایدا دارێژراو بنەمای سەرەکی بونیادنانی یۆنان بوو، کە دەبینین عەرەب شتەکان بە شێوەیەکی لۆژیکی پێکەوە دەبەستن یا لەسەر بنەمای تایبەتمەندی شتەکان پێکەوەیان دەبەستن، لە هەموو ئەم شتانە قەرزارباری یۆنانن.

## زانستی یۆنان:

### ١- سریان:

هەروەك  چۆن فارسەکان ئەڵقەی پەیوەندی بازرگانی نێوان هیند و چین نێوان بیزنتینیەکان بوون، ئاوا سریانەکان هۆکاری گواستنەوەی کولتوری رۆژهەڵات بوون بەرەو ئەوپەڕی رۆژئاوا، تا دەگات بە فەرەنساش، هەر ئەوان بوون مەی و ئاوریشم و شتی دیکەیان بەرەو رۆژئاوا دەبرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوان بوون کلتوری یۆنانیان لە ئەسکەندەرییە و ئەنتاکیەوە دێنا و لە رۆژهەڵات بڵاویان دەکردەوە و دەیانبرد بۆ خوێنگەکانی (رەها) ئیدێسا و ئەسیبیان و حەڕڕان و گێندێساپور، راستیەکەی سوریە وڵاتی نێوەند بوو، لەوێدا دوو مەزنترین دەوڵەتی ئەو سەردەمە واتە دەوڵەتی فارسەکان و دەوڵەتی رۆمەکان پێك دەگەیشتن، ئا لەوێدا هەردوو نەیار یا دۆست پێك گەیشتن و پەیوەندیەکەیان چەندان سەدە درێژەی کێشا، مەسیحیە سریانەکان لەو سەردەمەدا رۆڵێکیان گێڕا، هەر لەو رۆڵە دەچوو کە دواتر جولەکەکان گێڕایان[١٢].

### ٢- کلیسای مەسیحیەکان:

موسڵمانە فەتحکەرەکان بینیان کلیسای مەسیحیەکان دابەشی سەر سێ تیپی گەورە بووە، هەڵبەت گەر  وردە تیپە زۆر و بۆرەکان لەبەرچاو نەگرین، ئەوانیش: کلیسای یەعقوبی (monophysite)، لە پاڵ ئەویشدا کلیسای ئەرسەدۆکسی (الملکانیە) کە ئایینی رەسمی سوریا بوو، هەروەها کلیسای نەستورییەکان (Nestorian) لە وڵاتی فارس.

---

(١٢) رەنگە نوسەر مەبەستی ئەوەبێت کە جولەکەکانی ئەندەلوس زۆرێك لە کتێبە فەلسەفییە یۆنانی و عەرەبییەکان وەرگێڕایە سەر زمانی و خۆیان و ئەوەش بووە هۆی ئەوەی زۆرێك لە بەرهەمە فەلسەفییەکانی عەرەب لە فەوتان رزگاریان ببێت، دواتر مەسیحیەکان بۆ ناسینی کەلەپوری عەرەبی و یۆنانی پشتیان بەو وەرگێڕانانە بەست. (و.ع).

دەشێ جیاوازی مەزهەبی نێوان ئەو گرووپە کلیساییانە رۆڵێکی گرنگی لە پەرسەندنی بیروباوەڕی ئیسلامی گێڕابێ.

شوێنکەوتوانی کلیسای یەعقوبی پێیان وابوو خودا و سروشتی مرۆیی لە مەسیحدا (د.خ) یەك سروشتیان پێکهێناوە، لە کاتێکدا ئەرسەدۆکسەکان جیاوازییان دەکرد نێوان ئەو دوو سروشتە لە مەسیحدا، واتە سروشتی یەزدانی و سروشتی مرۆیی، نەستورییەکانیش لەم جیاکارییەدا زۆر لە ئەرسەدۆکسەکان توندتربوون.

گەرچی سروشت بریتیە لە هێز و بنەمای کار، کەچی بووبووە جێگەی مشتومڕ و ناکۆکی: ئایا کار و ئیرادەی خودا و کار و ئیرادەی مرۆڤ لە مەسیحدا یەکیان گرتووە یا لێك جیاوازن؟.

یەعقوبییەکان بەهۆی هۆکاری ئایینی و هۆکاری تێڕوانینی ئەقلانی، جەختیان لەسەر یەکانگیری یەکیەتی خوداکەی خۆیان دەکرد لە مەسیحدا، هەڵبەت لە توخمێکی مرۆییدا.

بەڵام نەستورییەکان جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە مەسیح لە بوون و ئیرادە و کاردا تایبەتمەندی مرۆیی هەیە. جیاوازیشیان لە نێوان ئەوانە و ڕگەزی خودایی دەکرد.

ئەم مەزهەبەی دواینیان کە هەلومەرجی سیاسی و رەوشی کولتوری هاوکارییان کردبوو، بوارێکی فراوانتریان بۆ تێڕوانینێکی فەلسەفی لە گەردوون و ژیان هەبوو، راستیەکەی نەستورییەکان ئەوپەڕی هەوڵیاندا بۆ دیراسەکردنی زانستەکانی یۆنان.

### ٣- ئیدێسا و نەسیبین:

سریانی زمانی کلیسای رۆژئاوا و رۆژهەڵات (فارسی) بوو، بەڵام لە دێرەکاندا لە پاڵ زمانی سریانی زمانی یۆنانی دەخوێندرا، دەبێ ئەوەش بێژین (رأس عین) و (قنسرین) دوو سەنتەری کلتوری بوون لە کلیسای رۆژئاوا و یەعقوبیدا، لەوانیش گرنگتر خوێندنگەی ئیدێسا بوو، چونکە دیالێکتی یا زاراوەی ئیدێسەیی زۆر پێشکەوتوبوو، بەرادەیەك دەکرا ببێتە زمانێك کە پێی بنوسرێ، بەڵام ساڵی ٤٨٩ ز ئەو خوێندنگەیە داخرا، چونکە مامۆستاکانی لە بیروباوەڕەکانیاندا نەستوریی بوون، پاشان جارێکی دیکە نەسیبییەکان کردیانەوە، بەهۆی هۆکاری سیاسییەوە ئەو خوێندنگەیە پاڵپشتی و پشتگیری ساسانیەکانی بەدەستهێنا و بیروباوەڕی نەستورییەکان و زانست و زانیاری یۆنانەکان لە وڵاتی فارسەکان بڵاوەی کرد.

ئەوەی لەو خوێندنگانە دەخوێندرا بەگشتی روخسارێکی ئایینیان هەبوو و پەیوەست بوون بە دەقە پیرۆزەکانەوە، بە شێوەیەك ئاراستە دەکرا کە پێویستییەکانیی کلیسا دابین بکات، گەرچی پزیشك و خوێندکارانی پزیشکیش بەشدارییان تێدا دەکرد، یا ئەگەر ئەوانە بە گشتی لە چینی پیاوانی کلیسا بوون، ئەوە جیاوازی نێوان خوێندنی خوداناسی و سەرقاڵبوون بە زانیارییە دنیاییەکانەوە وەلا نانێ.

راستە، یاسای رۆمانی لە شام کاری پێ دەکرا و مامۆستایان ( قەشە زاناکان) و پزیشکانی لە سەندنی باج و سەرانە دەبەخشی و ئیمتیازاتی دیکەی پێدەدان، بەڵام قەشەکان بە پزیشکی تیمارکردنی روح لە قەڵەم دەدران، بەڵام پزیشکەکان کاریان تەنها تیمارکردنی جەستە بوو، ئا ئەمەش بەسبوو بۆ بیانووی ئەو رێز و شکۆیەی قەشەکان هەیانبوو و بەسەر پزیشکەکاندا، پزیشکی بەردەوام بە کاروبارێکی دنیایی لە قەڵەم دەدرا، سیستەمی خوێندنگەیی نەسیبیەکان (لە ساڵی ٥٩٠ ز) بڕیاریدا نابێ کتێبە پیرۆزەکان لەگەڵ ئەو کتێبانە لە یەك شوێندا بخوێندرێن کە گرنگی بە کاروباری دونیایی دەدەن.

پزیشکەکان رێزێکی زۆریان بۆ کتێبەکانی ئەبیکرات و کالیۆنس و ئەرەستۆ دادەنا، بەڵام لە دێرەکاندا یەکەم تایبەتمەندی فەلسەفە ئەو ژیانە تێڕامانکارییە بوو کە لە دونیا زیزبوان زیندوویان کردۆتەوە و تەنها گرنگی بە فەلسەفەش دەدەن کە خەمی سەرەکیانە.

## ٤- شاری حەڕان:

لە شاری حەڕان لە میزۆپۆتامیادا، شارێکە دەکەوێتە نزیك ئیدێسە، شوێنێکی تایبەت بەخۆی هەبوو، لەو شارەدا بەتایبەت لە سەردەمی فەتحی عەرەبیدا دووبارە گەشایەوە، بتپەرستی کۆنی سامییەکان بەسترایەوە بە لێکۆڵینەوە بیرکاری و گەردوونناسی و تیۆری هەردوو مەزهەبی نوێ فیساگۆرسیەکان و نوێ ئەفلاتونیەکانەوە، حەڕانیەکان یا سائیبەکان[١٣]- ئەم ناوە لە هەردوو سەدەی نۆیەم و دەیەمی زایینی بەسەریاندا بڕا- دانایی و

(١٣) بە قسەی ابن الندیم کە ئەویش لە مێژوونوسێکی مەسیحی وەریگرتووە، سائیبەکان لە کۆتایی سەردەمی ئەمەوی ناوی خۆیان ناوە سائیبە تا مافی ئەهلی کتێبیان هەبێ، چونکە لە قورئانیشدا ناویان وەکو گرووپێکی ئایینی هاتووە، هەروەها ئیبن نەدیم ئەڵێ لەسەردەمی عبدالملك بن مروانەوە سەرۆك و پێشەوایان هەبووە، هەروەها کتێبێیان هەیە کە دەیدەینە پاڵ هیرمس کە یەکێك لە پەیامبەرانیان، کیندیش زۆر

حیکمەتە شێوە تەسەوفییەکان و نهێنییەکانی بوونیان دەگەڕاندەوە بۆ سێ کۆچکەی دانایی هیرمس (hermes trismegistos) و ئاگاتا زیمۆن[١٤] و (agdathodaemon)، ئۆرانیۆس[١٥] (urdnius) و ئەوانی تر، لەرووی دڵسۆزیشەوە زۆر بیروباوەڕی سەردەمی هیلینیستی-یان وەرگرت، دەشێ ئەو بیروباوەڕانەش هەر لەنێو خۆیاندا داڕێژرابن.

ژمارەیەکی کەمیان لە وەرگێڕان و نوسیندا چالاك بوون، زۆریشیان لەسەدەی هەشتەمەوە تا دەیەمی زایینی پەیوەندیەکی توندوتۆڵیان بە زانایانی فارس و عەرەبەوە هەبوو.

## ٥- گێندیساپۆر:

پاشان لە وڵاتی فارسدا خوسرەو ئەنۆشیروان (٥٣١-٥٧٩ز)ی کیسرا هات و لە شاری گێندیساپۆر پەیمانگایەکی بۆ لێکۆڵینەوە فەلسەفی و پزیشکیەکان دامەزراند[١٦]، زۆرینەی مامۆستاکانی مەسیحیە نەستورییەکان بوون، ئەنۆشیروان زۆر شەیدا و تامەزرۆی کلتوری ئەقڵانی بوو، لێبوردەیی و بەخشندەیی ئەو نەستورییەکان و یەعقوبییەکانیشی گرتەوە،

---

ستایشی ئەو کتێبە دەکات، هەروەها ئیبن نەدیم دەڵێ سائیبەکان (ئەو ئیبراهیمیانەن کە بڕوایان بە حەزرەتی ئیبراهیم هێناوە، لەسەر ئەو کتێبە دەڕۆن کە بۆ ئیبراهیم دابەزیوە). بە قسەی بەیرونیش ئەحکام و عیبادەتیان هەر وەکو جولەکە و موسڵمانان وایە. (و.ع).

(١٤) میسرییە و یەکێکە لە پەیامبەرانی یۆنانیەکان و میسرییەکان. **(طبقات الاطباء).ج١، ص١٦. (و.ع).**

(١٥)لە کتێبی الفهرست (ص٣١٨) بە ئارانی هاتووە، لە پاڵ پەیامبەری حەڕانیەکان و کلدانییەکان باسی کردووە. (و.ع).

(١٦) لە سەدەی شەشەمی زاییندا لە وڵاتی فارسدا راپەرینێکی زانستی سەریهەڵدا، لە روخساری ئەو راپەڕینەش پێشکەوتنی قوتابخانەی گێندێساپور بوو، هەر لەوێ پەیمانگایەکی پزیشکی دامەزرا و نەخۆشخانەیەکی لەپاڵ دروستکرا، مامۆستا و پزیشکە هیندییەکان و یۆنانیەکان کە لە وڵاتانی خۆیان وەدەردەکەوتن دەهاتن بۆ ئێران، بۆیە حیکمەتی هیندی و فارسی لە گیندیساپور لە ژێر سایەی فەرمانڕەوایەکی رۆشنگەر کە ئەنۆشیروانی کیسرا بوو، بە شێوەیەکی زۆر بە پیت پێك گەیشتن. ئەو قوتابخانەیە دوای فەتحی ئیسلامیش هەر درێژەی بە چالاکیەکانی دا، لە سەرەتاکانی چەرخی عەبباسیدا کەڵك لە مامۆستایانی ئەو قوتابخانەیە وەرگیرا و چەندین سەدە پزیشکی بەخشی بە خەلیفەکانی ئیسلام و رۆڵێکی بەرچاویشیان لە بزاوتی زانستی ئیسلامی هەبوو. (و.ع).

مەسیحیەکانی سریان بوون بە پزیشك و ئەو خێروبێرەیان چنگ کەوت کە دواتر لە کۆشکی خەلیفەکان بەریان کەوت.

پاشان حەوت فەیلەسوفی سەر بە مەزهەبی نوێ ئەفلاتونی لە ئەسیناوە دەرکەوتن و ساڵی ٥٢٩ز ئەنۆشیروان لە کۆشکەکانی خۆیدا چاوی پێیان کەوت، دەشێ ئەوەی ئەوانە لەوێ بینیان هەر لەو شتە بچێ کە بیرمەندانی ئازادیخوازی فەرەنسی لەسەدەی نۆزدەدا لە وڵاتی روسیادا رووبەرووی بوونەوە، بە هەرحاڵ سۆزیی گەڕانەوە بۆ نیشتیمانیان تێدا بزوا، ئەنۆشیروانیش چونکە پیاوێکی بەخشندە و رۆشنگەربوو رێی پێدان بڕۆنەوە، لەو پەیماننامە ئاشتیەی کە ئەنۆشیروان ساڵی ٥٤٩ز لەگەڵ بێزەنتینیەکان بەستبووی باسی ئازادی بیروباوەڕ کرابوو، بێگومان مانەوەیان لە وڵاتی فارسەکاندا کاریگەری خۆی هەبوو.

### ٦- وەرگێڕانی سریانییەکان:

سەردەمی وەرگێڕانی کتێبە فەلسەفییەکانی یۆنان لەسەردەستی سریانییەکان هەر لەسەدەی چواری زایینیەوە دەستپێدەکات تا سەدەی هەشتەم، لە سەدەی چوارەمدا کۆمەڵێك پەند و حیکمەت وەرگێڕدران.

یەکەم وەرگێڕ باس دەکرێ پرۆبۆسە (Probus) کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی زایینی لە ئەنتاکیە هەم پزیشك بوو هەم قەشە، دەشێ کارەکەشی تەنها راڤەکردنی کتێبە لۆژیکیەکانی ئەرەستۆ و ئیساکۆژی فرفۆریوس (Prophyrius) بێت. لە هەمووشی نێودارتر سەرگیسی[(١٧)] رەسعەنییە (Sergius von Ras`anih)، کە لە تەمەنی (٧٠) ساڵێدا کۆچی دوایی کردووە، بێگومان لە قوستەنتینیە بووە، قەشە و پزیشکێکی عیراقی بووە و لەسەرجەم زانستی ئەسکەندەرییە شارەزابووە، دەشێ هەر لە ئەسکەندەریەش ئەو زانستەی وەرگرتبێ، ئەم پیاوە تەنها کتێبی خوداناسی و ئەخلاق و کتێبە تەسەوفیەکانی وەرنەدەگێڕا، بەڵکو وەرگێڕانەکانی کتێبە سروشتی و پزیشکی و فەلسەفیەکانیشی گرتۆوە.

---

(١٧) أبن اصبعیە (ج١، ص١٠٨ و ١٨٦ و ٢٠٤) بە سەرگیشی الرأس العینی ناوی دێنێ و دەڵێ: یەکەم کەس بووە کتێبی لە زمانی یۆنانیەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی سریانی و خاوەنی پۆلینکاری مەزنیشە لە پزیشکی و فەلسەفەدا. (و.ع).

سریانەکان تاکو دوای فەتحی عەرەب درێژەیان بەو بزوتنەوە زانستیە دا، یەعقوب ئیدێسی (Jakob von Edessa) (640-708) ئەو کتێبە یۆنانیانەی وەرگێڕان کە لەسەر خوداناسی نوسرابوون، بەڵام لە پاڵ ئەوەشدا سەرقاڵی فەلسەفە بوو، کاتێك لەبارەی ئەوەی دەکرێ قەشەیەکی مەسیحی منالانی موسڵمان فێر بکات، پرس و جۆی کرد، بۆی دەرکەوت دەکرێ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی موسڵمانان پێویستیان بە کولتور و رۆشنبیری بوو و ئارەزوویشییان دەکرد.

سریانەکان بە گشتی بە دەستپیاکیەوە کتێبە یۆنانیەکانیان وەردەگێڕا، بەتایبەت سەرگیس، گەرچی ئەم دەستپاکییە پتر لە کتێبە لۆژیکی و سروشتناسیەکان بە دەردەکەون، وەك لە کتێبە ئاکاری و میتافیزیکییەکان، زۆرێك لە لێڵی و تەمومژی ئەم دوو زانستەی دواتریان وەلا نا، یا بەشێوەیەکی دیکە تێی دەگەیشتن، یاخود بیروباوەڕی مەسیحاییان دەخستە جێگەی بیروباوەڕە بتپەرستییەکان.

برێ جار پترۆس و پۆڵس و یوحەننا لە بری سوکرات و ئەفلاتون و ئەرەستۆ بە دیاردەکەوتن، هەروەها خودای تاقانە لە بری چارەنووس و خودا زۆر و زەبەندەکان، جگە لەوانە دەبینین بیروباوەڕی وەك دونیا و نەمری و تاوان بەرگێکی مەسیحاییان بەبەردا کراوە.

بەڵام عەرەبەکان دواتر هەوڵیاندا خۆیان لەگەڵ زمان و ئایین و کولتوری سریانەکان بگونجێنن، هۆکاری بەشێك لەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە موسڵمانەکان رقیان لە هەموو شتێکی بتپەرستی دەبۆوە، هۆکارەکانی دیکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی موسڵمانەکان کولتوری سریانەکانیان پێ باشتر بوو لە هەرسکردنی شتی بیانی.

### ٧- فەلسەفە لای سریانەکان:

سریانەکان لە پاڵ گرنگیدان بە کەمێك لە بیرکاری و پزیشکی گرنگیان بە دوو شتی دیکەش دەدا، ***یەکەم:*** کۆکردنەوەی پەندە ئاکارییە پەروەردەییەکان و پێکەوە دەیانکردن بە چەشنێك لە مێژووی فەلسەفە، بە گشتی گرنگیان بە دانایی فیساگۆرسی — ئەفلاتونی دەدا کە تارادەیەك نزیك بوو لە تەسەوفەوە، گرنگترین شتیش کە لەمەدا وەبەرچاوان دەکەوێ ئەو پەند و ئامۆژگاریانەن کە وەپاڵ فیساگۆرس سوکرات و پلۆتەیچ (Plutaich) و دیۆنوسیۆس (Dionysius) و ئەوانی تر دەدرێن.

چەقی گرنگیدانییان تیۆری دەروونی ئەفلاتون بوو، کە دواتر گۆڕیان تاکو لەگەڵ فەلسەفەی فیساگۆرسی بگونجێ یا بۆ ئەوەی لەگەڵ مەسیحیەتدا تەبا بێت، وێڕای ئەوانەش دەبینین سریانەکان لە کلیساکانیاندا ئەفلاتونیان وەکو قەشەیەکی رۆژهەڵاتی وێناکردووە کە لە ناو جەرگەی بیاباندا دوور لە ئاوەدانی پەناگەیەکی بۆ خۆی بونیادناوە، ئینجا دوای سێ ساڵ تێڕامان بە بێدەنگی لە ئایەتێکی کتێبی پیرۆز، دواجار بە بڕواهێنان بە (سێینە —تثلیث — Tri-unity) کۆتایی بەو تێڕامانە هێناوە.

***دووەم*** شت کە سریانەکان گرنگیان پێدەدا لۆژیکی ئەرەستۆ بوو، نێوبانگی ئەو فەیلەسوفە هەروەکو چۆن ساڵانێکی درێژ لە نێو عەرەبدا هەر پەیوەست بە لۆژیکەکەیەوە ئاوا لەنێو سریانەکانیشدا هەر وەکو لۆژیکناسێك دەناسرا، لە لۆژیکەکەی ئەرەستۆوە فێری: گوتەزا، رستەناسی (Hermineutic) و فێر شیکاری یەکەمیش (کتێبی پێوەر) بوون، هەروەك ئەوەی لە رۆژئاوا لە سەرەتای سەدە ناوەڕاستینەکاندا هەبوو.

ئەوان پێویستیان بە لۆژیك هەبوو تا لە کتێبی زانایانی کلیسای یۆنانی تێ بگەن، چونکە ئەو کتێبانە لانی کەم لە رووی فۆرمەوە کاریگەربوون بە لۆژیك، بەڵام بە تەواوەتی شارەزایی لۆژیك نەبوون، بەڵکو زیاتر لە رێگەی زانایانی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونییەوە بە لۆژیك ئاشنابوون، هەروەك بۆ نموونە لەو کتێبەدا دەبینرێ کە پۆڵسی فارسی[١٨] (Paulus Persa) بە زمانی سریانی بۆ ئەنۆشیروان پاشا نوسیویەتی.

---

(١٨) پۆلسی فارسی مەسیحیەکی نەستوریە و زۆر شارەزا بووە لە فەلسەفە و ئایین و لە خزمەتی کیسرادا بووە، پۆلس لە پێشەکی کتێبە لۆژیکەکەیدا ستایشی فەلسەفە دەکات و دەڵێ مەزهەبە ئایینەکان لە بابەتگەلی وەك تاك و تەنهایی خودا و توانای خودا بەسەر هەموو شتێك و خولقاندنی هەموو شتێك و نەمری و کۆنی جیهان و سەرپشکبوون و سەرپشك نەبوونی مرۆڤ و زۆر بابەتی تر، ناکۆکن. بە شێوەیەك مرۆڤ ناتوانێ هەموو ئەو مەزهەباتە قبوڵ بکات یا رەتیان بکاتەوە. هەروەها هیچ دەروازەیەك نییە بۆ گەیشتن بە بیروبۆچوونێکی روون و ئاشکرا، تا ئێستاش جێگەی گومان و دووردونگین، لەبەر ئەوە پۆلس جیاوازی دەکات لەنێوان بابەتی زانست  کە ئاشکراترە، لەگەڵ بابەتی ئیمان، کە نادیارە  و ئاشکرا نییە. هەروەها پێی وایە زانست وردتر و جێمتمانەترە لە ئایین، بەتایبەت چونکە بڕواداران لە لێکۆڵینەوەکانیاندا پشت بە زانست نابەستن و ئەوەی ئێستا ئێمە بڕوامان پێیەتی تەنها ئیمانە و دواتر شتەکانمان بۆ روون دەبێتەوە. دواجار پۆلس دەڵێ مەعریفەی فەلسەفی باڵاتر و جێمتمانەترە لە مەعریفەی ئایینی. (و.ع).

لەو کتێبەدا زانست پێگەیەکی بڵندتری لە باوەڕ پێدراوە، فەلسەفەش وا پێناسەکراوە کە مەعریفەیەکە بۆ ناسینی دەروون، هەر بەو مەعریفەیە دەروون پەی بە هەموو شتێك دەبات، هەروەك چۆن خودا بەزانینی خۆی هەموو شتێك دەزانێ.

### ٨- وەرگێڕانە عەرەبییەکان:

بەڵگەی ئەوەی عەرەب کەڵکیان لە سریانەکان وەرگرتووە، ئەوەیە زانایانی عەرەب زمانی سریانیان بە پێشکەوتووترین زمان لە قەڵەم دەدا یا بە زمانێکی راست و دروست و بێ کەموکوڕیان دەزانی. راستە لای ئەوان سرانەکان هیچیان دانەهێناوە، بەڵام چالاکی سریانەکان لە وەرگێڕاندا زۆر بە سودبوو بۆ زانستی عەرەب و فارسەکان. هەروەها ئەوانەی سەرقاڵی وەرگێڕانی کتێبە یۆنانیەکان بوون بۆ عەرەبی، لە ساڵانی نێوان هەردوو سەدەی هەشتەم و دەیەمی زایینی، زۆرینەی زۆریان سریانی بوون، ئەو شتانەشی وەریان دەگێڕا یا لە وەرگێڕانە کۆنە سریانیەکانەوە بوو یا لە رێگەی ئەو وەرگێڕانەی کە خۆیان راستیان کردبۆوە یا سەر لەنوێ وەریان دەگێڕایەوە.

دەگێڕنەوە خالدی کوڕی یەزیدی خەلیفەی ئەمەوییەکان (٧٠٤ ز مردووە) بە سەرپەرشتی قەشەیەکی مەسیحایی سەرقاڵی خوێندنی کیمیا بوو، هەروەها فەرمانی پێکردبوو کتێبێك لەبارەی کیمیاوە لە زمانی یۆنانیەوە وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی.

هەروەها چ پەند و حیکمەت و وتار و ئامۆژگاری هەبوو، چی شت هەبوو پەیوەندی بە مێژووی فەلسەفە بە شێوەیەکی گشتی هەبوو، هەر هەموویان کۆکردەوە و هەر لە چەرخی یەکەمەوە وەریان گێڕا.

بەڵام تاکو سەردەمی مەنسور ئەو کتێبە یۆنانیانەی لەمەڕ سروشت و پزیشکی و لۆژیکبوون، وەرنەگێڕانە سەر زمانی عەرەبی، هەندێ لەو کتێبانەی لە زمانی پەهلەوییەوە وەرگێڕدران.

ئیبن مەقفەع کە مەجوسیەکی بەرچەڵەك فارس بوو، لەو بزووتنەوەیە چانسێکی پێ برا، جگە لەرووی زاراوەیشەوە نەبێت هیچ جیاوازییەکی لە وەرگێڕەکانی دوای خۆی نەبوو، لەو کتێبە فەلسەفیانەی بۆی وەرگێڕاوین هیچمان بەدەست نەگەیشتووە.

ئەو کتێبانەی لە سەدەی هەشتەمدا (دووەمی کۆچی) وەرگێڕدراون هەموویان لە ناوچوون، یەکەم کتێبی وەرگێڕدراو کە بەدەستمان گەیشتبێ مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆیەم (سێیەمی کۆچی) کە دەکاتە سەردەمی مەئمون و دوای ئەو.

زۆرینەی وەرگێڕانەکانی سەدەی نۆیەم پزیشك بوون، کتێبەکانی بقرات و گالینۆس یەکەم کتێب بوون کە لەدوای کتێبەکانی بەتلیمۆس و ئەقلیدس وەرگێڕدران، با لێرەدا قسەکانمان تەنها بەسەر فەلسەفە بە مانا تایبەتیەکەی کورت بکەینەوە.

دەڵێن یوحەننا یا یەحیای کوڕی بەتریق (سەرەتای سەدەی نۆیەم) وەرگێڕانی چیرۆکی تیماوسی ئەفلاتونی بڵاوکردەوە، هەروەها کتێبەکانی ئەرەستۆشی وەرگێڕا، وەك (میترۆلۆژی – Meteorology) کتێبی ئاژەڵان، هەروەها هەندی بەشی کتێبی دەروون، کتێبی (لەبارەی جیهانەوە)شی وەرگێڕا.

دەڵێن عبدالمسیحی کوڕی عبدالله ناعمە الحمصی (٨٣٥ز) کتێبی سۆفیستیکای ئەرەستۆی وەرگێڕاوە، هەروەها شەرحەکەی جۆن فلۆبۆن[١٩] لەمەڕ فیزیکی ئەرەستۆیی وەرگێڕاوە، هەروەها کتێبی (خوداناسی ئەرەستۆیی) وەرگێڕاوە کە بە هەڵە ئەو ناوەی لێنراوە، ئەو کتێبە شەرحی بەشی نۆیینیەکەی ئەفلۆتینە.

هەروەها دەڵێن قستای کوڕی لۆقای بەعلەبەکی (٩١٢ز مردووە) شەرحی ئەسکەندەری ئەفرۆدیسی و جۆن فلۆنی وەرگێڕاوە کە لەسەر (سروشتناسی)یە، هەروەها هەندێ شەرحی ئەسکەندەری لەسەر گەردوون و گەندەڵی (Me Genenration et Corruptione) و کتێبی رای فەیلەسوفانی فلوترێچ و چەندین کتێبی دیکەشی وەرگێڕاوە.

ئەبو زید حنین بن ئیسحاق (٦٠ کۆچیی مردووە) و کوڕەکەی ئیسحاقی کوڕی حنین (٩٨ کۆچی مردووە) خوارزاکەی حبیش بن الحسن پڕبەرهەمترین وەرگێڕبوون، جا لەبەر ئەوەی پێکەوە خەریکی کارکردن بوون زۆرێك لەو کتێبانەی وەریان دەگێڕا هەرجارە و بەناوی یەکێکیانەوە بوو، بێگومان زۆرێك لە کتێبەکان بە چاودێری ئەوان و بەهاوکاری خوێندکاران و هاوکاران وەردەگێڕدران، وەرگێڕانەکانیشیان سەرجەم زانستەکانی ئەوکاتی دەگرتەوە، کتێبە وەرگێڕاوەکانیان راست دەکردەوە و کتێبی نوێشیان وەردەگێڕا، حەنین کتێبی پزیشکی وەردەگێڕا، بەڵام ئەمیلی کوڕی کتێبی حیکمەتی وەردەگێڕا.

---

(١٩) عەرەب پێی دەڵێن: يحيى النحوى. (و.ع)

وەرگێڕان بەدرێژایی سەدەی دەهەم (چوارەمی کۆچی) هەر درێژەی هەبوو، لە نێوان ئەوانەی کە زۆر نێوبانگی هەبوو ئەبو بەشیر مەنتاین یونیس القنائی[٢٠] (٩٤٠ ز مردووە)، ئەبو زەکەریا ئیسحاق ئیبن زەرعە (٣٣١-٤٤٨ کۆچی) هەروەها باسی ئەبی الخیر بن الحسن الخمار (٣٣١ لەدایکبووە) دەکرێ کە یەکێك بووە لە قوتابییەکانی یەحیای کوڕی عدی، کە نامەیەکی لەمەڕ تەباکردنی ڕای فەیلەسوفان و کریستیانەکان نوسیووە، سەرباری وەرگێڕان و شەرحکردنی چەندین کتێب.

چالاکی وەرگێڕەکان لە ڕۆژگاری حەنین بن ئیسحاق، پتر کتێبەکانی ئەرەستۆ و تەفسیرکردن و لێکدانەوەی کتێبەکانی ئەوبوو.

## ٩- فەلسەفەی وەرگێڕان:

هەق نییە ئەو وەرگێڕانە لە ریزی فەیلەسوفانی مەزن دابنێین، بەدەگمەن یەکێکیان لە خۆیەوە کاری وەرگێڕانی کردووە، بەڵکو بەزۆری لەسەر راسپاردەی خەلیفە و وەزیرەکان یاخود پیاوێکی مەزن ئەو کارەیان کردووە.

پزیشکی لقێکی ئەو زانستە بووە کە تیایدا پسپۆڕبوون، گرنگترین شت کە دوای پزیشکی گرنگیان پێدابێت دیراسەکردنی حیکمەت بوو: مەبەستم ئەو چیرۆکە جوانانەیە کە هەڵگری راز و نهێنی ئاکارین، یا سەرگوزشتە و پەند.

ئەو وەرگێڕانە حەزیان دەکرد بەو رستانەی لە دیالۆگ و چیرۆك و شانۆکاندا هاتوون خەڵکی سەرسام بکەن، ئەوان سەرسامبوون بەو وتانە و کۆیان دەکردنەوە، چونکە پەند و حیکمەتیان تێدابوو، یاخود رەنگە لەبەر ئەوەی رەوانبێژیەکی جوانیان تێدابووە.

ئەو خەڵکانە هەر بە دڵسۆزی بۆ ئایینی باو و باپیرانیان مانەوە کە ئایینی مەسیحی بوو، لەبارەی ئیبن جبریلەوە شتێك دەگێڕنەوە کە لە یەك کاتدا ئاماژەیە بە شێوازی بیرکردنەوەی ئەمان و سنگفراوانی خەلیفەکان و رێزگرتنی ئازادی بیرکردنەوە، دەڵێن کە خەلیفە مەنسور حەزی کردووە ئیبن جبریل ببێتە موسڵمان، ئیبن جبریل لە وەڵامدا وتویەتی: (من لەسەر

(٢٠) دەگەڕێتەوە بۆ کلیسای قەنی، مەسیحیە و لەسەردەمی خۆیدا بووە بە پێشەوای لۆژیکناسان، لە بەغدا ساڵی ٣٢٨ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

ئایینی باوباپیرانم دەمرم، حەز دەکەم لەو شوێنە بم کە باوانم لەوێن، چ لە بەهەشت بن یا دۆزەخ)، جا بۆیە خەلیفە پێکەنیوە و ئازادی کردووە و پاداشتێکی زۆریشی کردووە.

تەنها پاشماوەیەکی کەمی نوسینەکانی ئەو پیاوانەمان بەدەست گەیشتووە، قستای کوڕی لۆقا نامەیەکی کورتی هەیە لەمەڕ جیاوازی نێوان دەروون (Seele) و روح (Geist)، کراوە بە لاتینی[٢١] و تا ئێستا هەر ماوە، توێژەران زۆر باسیان لێوەکردووە و بەکاریان هێناوە، لەلای لۆقا روح تەنێکی ناسکە و لەبۆشایی چەپی دڵ سەقامگیربووە، ئا لەوێشەوە ژیان بە سەرتاپاکی جەستەی مرۆڤ دەبەخشێ و هێز و توانای هەست و بزاوتیشی پێدەدات، هەرچەندە ئەو رووحە ناسك و نەرم و روون بێت، خاوەنەکەی هۆشمەند و رۆشنفکر و کارا و دەستڕەنگین و لێهاتوو دەبێت.

سەرجەم فەیلەسوفانیش لەسەری کۆکن، بەڵام بەڕای ئەو، دەروون: زۆر سەخت و یاخییە، لێ زۆرینەی فەیلەسوفان لەسەر ئەمەیان ناکۆکن و قسەکانیان دژی یەکترە، مەسەلەکە هەر چۆنێکی بێت دەروون جەستە نییە، چونکە لە یەك کاتدا پێکدژترین حاڵەت قبوڵ دەکات، دەروون جەوهەرێکی ناپێکهاتەیە، هەروەها بەجیابوونەوەی لە جەستە نە لەناو دەچێ و نە پوچەڵ دەبێتەوە، وەکو ئەوەی بەسەر روحدا دێت، بەڵام روح ئەڵقەی پەیوەندی نێوان جەستە و دەروونە، هۆکاری دووەمی جوڵە و هەستکردنە.

ئەو شتەی لە بارەی دەروونەوە دەیڵێین لە کتێبی زۆرێك لەو زانایانەدا هاتووە کە دواتر لەو بارەوە هەڵ و کۆششیان داوە، بەڵام کاتێك فەلسەفەی ئەرەستۆ بیروباوەڕەکانی ئەفلاتونی بەرەو پێگەی دووەم پاڵ پێوەنا، وردە وردە دوو لایەنی دیکەی پێکدژ زۆر بەروونی دەرکەوتن، ئیدی وای لێهات قسەکردن لەبارەی روحەوە تەنها کاری دکتۆران بوو، بەڵام فەیلەسوفان دەروونیان خستە بەرامبەر ئەقڵ (Vernunt) و پێگەی دەروونیش دابەزی و هاتە ریزی شتە لەنێوچووەکانەوە، تەنانەت هەندێ جار دەبینین دەروون هاتوەتە ریزی ئارەزووە پیس و خراپەکارەکانەوە، هەروەك ئەوەی لای (گنوسیەکان) دەبینرێ، بەڵام ئەقڵی بیرکەرەوە لە دەروون پایەدارتربوو، واتە ئەقڵ باڵاترین شتی مرۆڤ بوو، ئەقڵ ئەو جەوهەرەبوو کە لەناوچوون توخنی نەدەکەوت.

---

(٢١) ئەو نامەیە باڵاترین نامەی فەلسەفییە، یوحەننای ئیسپانی لە سەدەی دوانزەهەمی زایینیدا کردوویەتی بە لاتینی. (و.ع).

ئێمە گەر ئێستا لەبارەی ئەو شتانە قسان بکەین وەك ئەوەیە پێش مێژوو کەوتبین، واتە باس لە دۆزگەلێك دەکەین کە هێشتا لەو سەردەمەدا دەرنەکەوتبوو کە باسی لێوە دەکەین، جا بۆیە دەبێ بگەڕێینەوە سەر وەرگێڕانەکان.

**١٠- رادەی ئاشنایی عەرەب بە کەلەپوری یۆنان:**

رۆژهەڵاتیەکان هەرگیز نەیانتوانیوە بگەن بە ئاستێکی باڵاتر لەو شتانەی کە ئەقڵی یۆنانی لە هونەر و شیعر و نوسینی مێژوو بۆیان داهێناوین، بگرە هەندێ جار رۆژهەڵاتیەکان بە ئەستەم تێی گەیشتوون، شارەزاییان لە ژیانی یۆنان نەبووە و نەیانتوانیوە چێژی لێوەربگرن، عەرەبەکان پێیان وایە مێژووی یۆنان لەگەڵ ئەسکەندەری مەزنی دەستی پێکردووە، کاتێك گەیشتە لایان یەك دونیا ئەفسانەی مەزنی پێوەنرابوو، بێگومان ئەو پێگەیەی کە ئەرەستۆ لای ئەو پاشا مەزنەی دونیای کۆنی هەیبووە، هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی فەلسەفەکەی لە کۆشکی خەلیفە موسڵمانەکان بە باشی پەسەند بکرێ.

عەرەب تا کلیۆپاترە، پاشاکانی یۆنانیان دەناسی، هەروەها ئیمپراتۆرە رۆمانیەکانیشیان دەناسی، کەچی مێژوونووسی وەك (تۆکیدیدس Thukydides)یان نەدەناسی، تەنانەت ناویشیان نەژنەوتبوو، لە هۆمیرۆسیش تەنها ئەو ووتە نێوەدارەیان خواستبوو کە دەڵێ: "تەنها یەك کەس دەبێ ببێ بە فەرمانڕەوا" (One Only Should be the Ruler)، هەروەها هیچ ئاشنایەتیەکیان نە بە چیرۆکبێژانی یۆنان و نە بە شاعیرە لیریکیەکان نەبوو، کولتوری یۆنانی تەنها لە رێگەی بیرکاری و پزیشکی و فەلسەفەوە، کاریگەری بەسەر عەرەبەوە هەبوو. لە فەلسەفەی پێشکەوتووی یۆناندا هەندێ شتیان لەبارەی پلۆتاریچ و پۆرپۆریۆس و ئەوانی تریان دەزانی، ئەوەشیان لەرێگەی کتێبەکانی ئەرەستۆ و گالینۆسەوە، بەڵام ئەو ئاشنایەتیەش بە کۆمەڵێك ئەفسانە و ئوستورە تێکەڵکرابوو، ئەو شتانەی کە رۆژهەڵاتیەکان لەبارەی مەزهەبی فەیلەسوفانی پێش سوکرات دەیزانن، بە ساختە وەپاڵ ئەوانیان داون، دەکرێ بدرێتە پاڵ خودی ئەو بیروباوەڕانەی لە خودی رۆژهەڵات پەرەیان سەندووە، بەڵام هەوڵیانداوە بە دانەپاڵ دانایانی کۆنی یۆنان بەهای پێبدەن، بەهەرحاڵ دەبێ بێژین گەڕاونەتەوە سەر سەرچاوەیەکی یۆنانی.

## ١١- بەردەوامبوونی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان:

کاتێك داوی فەلسەفە بەدەستی دوایین فەیلەسوفانی یۆنان پسا، دەتوانین بێژین سریان و عەرەبەکان قبولّیان کرد ئەو داوە بەدەستەوە بگرن، مەبەستم ئەوەیە ئەوان کاتێك دەستیان پێکرد کەزانایانی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونی خەریکی لێکدانەوەی فەلسەفەی ئەرەستۆ بوون، کە کتێبەکانی ئەفلاتونیش لە پاڵ کتێبەکانی ئەرەستۆدا دەخوێندران و لێکدەدرانەوە.

حەڕانییەکان و هەندێ گرووپی ئیسلامی سەردەمێکی درێژ بە جوانترین شێوە بیروباوەڕەکانی ئەفلاتون و ئەفلاتونیزمیێ تێکەڵ بە مەزهەبی فیساگۆریزمیان دەخوێند، هەروەها زۆرێك لە مەزهەبی رەواقیەکان و مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان بەو بیرکردنەوانە بەسترانەوە، جگە لەوەش گرنگیەکی بێ وێنەیان بە سوکرات دەدا کە لە ئەسینادا بووە شەهیدی رێبازە ئەقڵیەکەی خۆی، تیۆرەکانی ئەفلاتون لەمەڕ دەروون و لەمەڕ سروشت کاریگەرییەکی زۆری بەسەریانەوە هەبوو، دروشمی فەلسەفەی سوکرات ئەو ئامۆژگارییە بەناوبانگەبوو کە لەسەر پەرستگای دلفی نوسرابوو : "خۆت بناسە!"، ئەم وتەیە لە بەرگێکی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیدا گەیشتە عەرەب، ئەوانیش دایانە پاڵ ئیمامی عەلی زاوای پێغەمبەری ئیسلام، جا دایانە پاڵ خودی پەیامبەر کە دەڵێ: هەر کەسێك خۆی بناسێ، ئەوە خودای خۆی ناسیوە. ئەم قسەیە زۆرێك لە سۆفیباوەڕان بۆ جیاوازی رێچکەکەیان پشتییان پێ دەبەست.

نوسراوەکانی ئەرەستۆ وردە وردە لە نێو دکتۆرەکان و کۆشکی خەلیفەکاندا برەوێکی زۆری پەیدا کرد، بێگومان یەکەم کتێب کە ئەو چانسەی بەرکەوت کتێبی (لۆژیك) و هەندێ بەشی کتێبی سروشت بوو، عەرەبەکان پێیان وابوو ئەرەستۆ تەنها لۆژیکی داهێناوە، بەڵام لەبارەی زانستەکانی دیکەوە پێیان وابوو ئەوەی لە نوسراوەکانی ئەرەستۆدا هاتووە هەروەك ئەوەی فیساگۆرس و ئەنبادۆکلیس و ئەنکساگۆراس و سوکرات و ئەفلاتونە، بۆیە وەرگێڕە مەسیحی و حەڕانیەکان و ئەوانی تر بیروڕاکانی خۆیان لەمەڕ دەروون و ئاکار و سیاسەت و میتافیزیك لەمەزهەبی حەکیمەکانی پێش ئەرەستۆ وەردەگرت.

دیارە ئەو بیروبۆچوونانەی کە لای عەرەب بە بیروبۆچوونی ئەنبادۆکلیس و فیساگۆرس و ئەوانی تر لە قەڵەم دەدران، لە راستیدا هی ئەوان نەبوو، عەرەب فەلسەفەکەی خۆیان دەدایە پاڵ هرمس یا حەکیمەکانی دیکەی رۆژهەڵات، عەرەب پێیان وابوو ئەنبادۆکلیس قوتابی داود

پاشا بووە، دواتر بووە بە قوتابی لوقمانی حەکیم، هەروەها پێیان وابوو فیساگۆرس دەرچووی خوێندنگەی سولەیمان بووە، ئیتر ئەم جۆرە شتانە.

ئەو کتێبانەی کە نوسەرانی عەرەب وەپاڵ سوکراتیان دەدا، ئەگەر راست بێت دیالۆگەکانی ئەفلاتونە کە تیایاندا کەسایەتی سوکرات بەرچاو دەکەوێ.

گەر باس لەو کتێبانە نەکەین کە بە ناڕەوا وەپاڵ ئەفلاتون دراون، دەبینین عەرەب ئەم کتێبانەشی وەپاڵ دەدەن: داکۆکی، کریتۆ، سوفیستەکان، فایدرۆس، کۆمار، فایدۆن، تیماوس، کتێبی یاساکان، بەڵام بەهۆی ئەوەوە نابێ پێمان وابێ عەرەب تەواوی ئەو کتێبانەیان وەرگێڕاوە.

بەڵام ئاشکرایە لە سەرەتادا تەنها ئەرەستۆ نەبوو کە ئەقڵی عەرەبی کۆنترۆڵ کردبوو، ئەفلاتونیشیان دەناسی، وەکو ئەوەی تێی گەیشتبوون، ئەفلاتون بڕوای بە ئافراندنی جیهان و نەمری دەروون و بوونی دەروون وەکو جەوهەرێکی روحی هەبووە، ئەو بۆچوونانەش لەگەڵ بیروباوەڕی موسڵمانان پێکدژ نەبووە.

بەڵام ئەرەستۆ بڕوای بە نەمری جیهان هەبووە، هەروەها مەزهەبەکەشی لەمەڕ دەروون و ئاکار کەمتر لە مەزهەبەکەی ئەفلاتون روحانی بووە، عەرەب بۆچوونەکانی ئەرەستۆیان بە مەترسیەك بۆ سەر ئایینەکەیان دەزانی، تەنانەت کەلامناسانی ئیسلام لە سەدەی نۆیەم و دەیەمی زایینی بەجیاوازی مەزهەبەکانیشیانەوە کتێبی زۆریان لە دژی ئەرەستۆ نوسی، بەڵام دواتر رەوشەکە گۆڕا، لەپڕ هەندێ فەیلەسوف دەرکەوتن ئەو تیۆرەیەی ئەفلاتونیان وەلا نا کە دەیوت لە جیهاندا یەك دەروونی گشتگیر هەیە، دەروونی تاکەتاکەی مرۆڤەکان تەنها بەشێکی کاتیی ئەو دەروونە گشتگیرەیە، ئەو فەیلەسوفانە بۆ پتەوکردنی هیواکانیان لەمەڕ نەمری، پشتیان بە فەلسەفەکەی ئەرەستۆ دەبەست، چونکە فەلسەفەکەی ئەرەستۆ پێگەیەکی گرنگی بە دەروونی بەشەکی دەدا.

### ١٢- کتێبی سێو:

رادەی ئاشنایی عەرەب بە ئەرەستۆ لەسەرەتایی ئاشنابوونیان بە فەلسەفە لەوەدا دەردەکەوێ کە هەندێ کتێبیان وەپاڵ داوە لە راستیدا هی ئەو نییە، تەنها لەرێگەی شەرحی فەیلەسوفانی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونەوە کتێبە راستەقینەکانی ئەرەستۆیان بە دەست دەگەیشت، بۆیە دوو دڵیان نەکرد لەوەی کتێبی (لەبارەی جیهانەوە) وەپاڵ ئەرەستۆ بدەن، نەك تەنها ئەوە بەڵکو زۆر کتێبی دیکەیشیان وەپاڵ دا، کە یۆنانیەکانی دوای ئەرەستۆ نوسیبویان، بۆ نموونە زۆر نوسینی

روونی ئەفلاتون هەبوو تێکەڵ بە مەزهەبی فیساگۆرسی یا مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان کرابوون، یاخود مەزهەبی نوێی دروستکراوی سەرجەم مەزهەبە جیاوازەکان.

جا با (کتێبی سێو)[٢٢] لەبەرچاوبگرین کە یەکەم گەواهیدەری ئەو قسەیەی سەرەوەیە، لەو کتێبەدا ئەرەستۆ هەمان رۆڵی سوکرات لە دیالۆگی فیدۆن دەگێڕێ کە ئەفلاتون نوسیویەتی: لەو کتێبەدا وا باسی ئەرەستۆ کراوە کە هەندێ لە خوێندکارەکانی دێن بۆ عیادەکەی، دەبینن ئەرەستۆ دەروونی خرۆشاوە، ئا ئەمەش وایان لێدەکات داوا لە مامۆستاکەیان بکەن کە لەسەروەختی رۆیشتنە فێری هەندێ شتیان بکات لە بارەی راستەقینەی چییەتی دەروون و نەمری دەروون، جا مامۆستاکەشیان قسەیەکی لەم جۆرەیان پێ دەڵێ: حەقیقەتی دەروون لە مەعریفەدا، واتە لە بالاَترین شێوەی خۆیدا، بریتیە لە فەلسەفە، بەرکەماڵی مەعریفەی راستەقینەش ئەو بەختەوەریەیە کە چاوەڕوانی دەروونی زانایە لە دوای مردنی، پاداشتی زانستیش زانستێکی بێ کەموکوڕیترە، هەروەها سزای نەزانی نەزانییەکی کوشندەترە، راستیەکەی نە لەم ژیانە و نە لە ژیانی دواییدا، نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا هیچ شتێك بوونی نییە، جگە لە فەلسەفە و نەزانی نەبێت، کە هەر یەکێکیان پاداشت و سزای خۆیان هەیە.

فەزیلەتیش لە حەقیقەتی خۆیدا جیاواز نییە لە فەلسەفە، هەروەك خراپەش جیاواز نییە لە نەزانی، دانەپاڵی فەزیلەت بە فەلسەفە و خراپە بە نەزانی وەکو دانەپاڵی ئاوە بۆ بەفر، ئەم دوو شتە یەك شتن، بەلاَم شێوەو فۆرمی لێکجیاوازیان هەیە.

دەروون تەنها لەو فەلسەفەیەدا چێژی راستەقینەی خۆی دەدۆزێتەوە کە شتێکی ئیلاهیە لە دەروونداـ، هەروەها دەروون نەك لە خواردن و نە لە خواردنەوەکان و نە لە چێژە هەستیەکاندا، خۆشبەختی و کامەرانی خۆی نادۆزێتەوە، چێژی هەستی تەنها کڵپەیەکە بۆ ساتێکی کەم دەخرۆشێ، پاشان خامۆش دەبێ، دەروونی هۆشمەند ئەوەیە هەوڵی خۆ قوتارکردن لە جیهانی تاریکی هەستەکان دەدات، دەروونی هۆشمەند (Thinking Soul) روناکیەکی پوختە و بۆ

---

(٢٢) ئەم دیالۆگە بۆیە پێی دەوترێ (کتێبی سێو)، چونکە ئەرەستۆ لە کاتی دیالۆگکردندا سێوێکی بەدەستەوە گرتووە و بۆنی کردووە تا هەمیشە بە ئاگا و چالاك بێت، لە کۆتایی دیالۆگەکەشدا دەستی ئاوەلاَ کردووە و سێوەکە کەوتووەتە سەر زەوی. (نوسەر).

بەلاَم من پێم وایە قسەکەرەکە سوکراتە و پوختەی ئەم کتێبەم لە کتێخانەی تیموری لە دار الکتب المصری بینیوە بەناونیشانی (پوختەی کتێبی سێوەکەی سوکرات). (و.ع).

ماوەیەکی درێژ خامۆش نابێتەوە، هەر لەبەر ئەمەیە فەیلەسوف لە مردن ناترسێ، بەڵکو هەر کاتێك خودا بانگی کرد بەدڵخۆشییەوە بەرەو پیلی دەچێت، ئەو چێژەی کە زانیارییە کەمەکەی لەم ژیانەدا بۆی دەرەخسێنێ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەکاتی مرندندا دەکەوێتە نێو خۆشبەختی و کامەرانییەوە، ئەوەش کاتێك جیهانێکی گەورەتریی بۆ ئاشکرابووە کە پێشتر نەیناسیوە، بگرە هێشتا هەر کەمێکی لە بارەوە دەزانێ، چونکە مەعریفەی ئەو کەسەی دەیبینێ کە مەعریفەیەکە شانازی پێدەکات تەنها بەمەعریفەی ئەو نائامادەیەیی نەیبینیوە دروست دەبێ، هەر کەسێکیش لەم ژیانەدا خۆی ناسی، ئەوە دەتوانێ زانیارییەکی نەمری لەبارەی هەموو شتێکەوە هەبێت، واتە ببێتە دەروونێکی نەمر.

## ١٣- تیۆلۆجی ئەرەستۆتالیس یا کتێبی یەزدانناسی:

هەروەها دەتوانین لە رێگەی ئەو کتێبەی بە هەڵە وەپاڵ ئەرەستۆ دراوە (کتێبی یەزدانناسی ئەرەستۆ)[٢٣] رادەی ئاشنایی عەرەب بە ئەرەستۆ بزانین، لەو کتێبەدا ئەفلاتونێکی یەزدانیی دەبینین کە لەسەر شێوەی نموونەی باڵای مرۆڤ وێناکراوە، لە رێگەی هزری دەرکییەوە[٢٤] پەی بە هەموو شتێك دەبات و پێویستی بە لۆژیکی ئەرەستۆ نییە.

راستیەکەی حەقیقەتی باڵا کە بوویەکی رەهایە، بە بیرکردنەوە پەی پێ نابردرێ، بەڵکو بە دیتن پەی پێ دەبردرێ، ئەوەش لە حاڵەتی دوورکەوتنەوە لە جیهانی بەرهەست.

ئەرەستۆ وەکو ئەوەی عەرەب بۆی چوون دەڵێ: "من کاتێك بە تەنها دەبم و دەچمە خەڵوەتەوە، لە جەستەم دێمە دەرەوە و جەستەم لەلایەك دادەنێم، جا دەبم بە جەوهەرێکی رووتی بێ جەستە، دەچمەوە ناو خۆم: دەگەڕێمەوە بۆ خۆم، لە دەرەوەی سەرجەم شتەکان دەبم بە زانست و زانا و زانراو بە گشتی، جا لە خۆمدا چاکە و جوانی و رووناکی دەبینم، پاشان سەراسیمە دەبم و دەبینم بووم بە بەشێك لە بەشەکانی جیهانی باڵای خودایی، خاوەن ژیانێکی چالاك و ئافرێنەر، کاتێکیش متمانە بەم شتە پەیدا دەکەم، لەم جیهانەوە بەرز دەبمەوە بۆ جیهانی یەزدانی، وا خۆم دێتە بەرچاوان وەکو ئەوەی لەودا بم و پێوەی پابەند دەبم، جا

---

(٢٣) ئەم کتێبە بۆ یەکەمجار فریدریخ دیتریسی لە بەرلین ساڵی ١٨٨٢ بڵاوی کردەوە. (و.ع).

(٢٤) مەبەستی ئەقڵی راستەوخۆیە. (و.ع).

دەكەومە سەرووی سەرجەم جیهانی ئەقڵیەوە، هەروەها وا خۆم دەبینم لەو پێگە باڵا یەزدانییە وەستاوم، ئا لەوێدا رووناكی و جوانیەك دەبینم كە زمان لە وەسفكردنی لاڵە و گوێچكەكان توانای بیستنیان نییە"، گەرچی ئەم وتەیە لە راستیدا هیی ئەفلۆتینە.

لە كتێبی (یەزدانناسی – theology) دا دەروون تەوەری باسەكەیە، هەموو مەعریفەیەكی مرۆیی راست بریتیە لە مەعریفەی دەروون، مەبەستم خۆناسینی مرۆڤە، واتە سەرەتا چیەتی دەروون بزانێ، پاشان زانینی بێ كەموكوڕی شوێنەوارەكانی، حیكمەتی باڵا ئەو شتەیە كە مەعریفە و زانینێ زۆر بەكەمی پێی دەگات، واتە شتێكە لە رێگەی چەمكە فیكرییەكانەوە بەتەواوەتی پەی پێنابردرێ، بۆیە فەیلەسوف وەكو هونەرمەندێكی لێزان و یاسادارێژێكی دانا حیكمەتی باڵا لە وێنەیەكی جواندا بۆ ئێمەی خەڵك دەردەخات، وەكو پەرستنی خودا، لەمەدا فەیلەسوف وەكو كەسێكی سەرووی پێداویستی و كەرەستەكانی دەروون دەردەكەوێ، وەكو جادووگەرێكی خۆبژێو، زانستەكەی خستویەتیە سەرووی خەڵكیەوە، چونكە خەڵكی هەمیشە كۆت و بەندی شتەكان و پێشبینی و بۆچوون و ئارەزووەكانن.

دەروون دەكەوێتە ناوەڕاستی پلەبەندی بوون، لەسەرووی دەروونیشەوە خودا و ئەقڵ هەن، لەخواری خواریشەوە سروشت و مادده هەن، دەروون لەلایەن خوداوە دێت بۆ ئەقڵ، لە ئەقڵیشەوە بۆ مادده، جا لە جەستەدا بڵاو دەبێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی، ئەوە ئەو سێ قۆناغەیە كە تیایدا ژیانی دەروون و ژیانی دونیا هەڵدەسوڕێ، ئا لێرەدا مادده و سروشت و دەرككردن و خەیاڵكردن پێگەی خۆیان لە دەست دەدەن، هەموو شتێك بوونی خۆی لە ئەقڵەوە (vous)ەوە بەدەست دێنێ، ئەقڵ خاوەنی هەموو شتەكانە، هەموو شتەكان لەناو ئەقڵدا پێكەوەن. دەروونیش ئەقڵە، بەڵام مادام لەنێو جەستەدایە ئەوە ئەقڵی هێزە، ئەو ئەقڵە بە وێنەی روناكی بەرەو جیهانی سەرەوە، بەرەو جیهانی هەسارەكان، جیهانی چاكە و خۆشبەختی دەڕوات، لەو جیهانەدا ئەقڵ ژیانێكی ئەقڵانی و نورانی دەژیت، دوور لە خەیاڵ و ئارەزوو.

ئا ئەمە ئەو ئەرەستۆتالیسە بوو كە رۆژهەڵاتیەكان و پەیڕەوكارانی سەرەتای ئیسلام دەیانناسی.

## ١٤- تێگەیشتنی عەرەب لە ئەرەستۆ:

نابێ بحەپەسێین لەوەی رۆژهەڵاتیەکان نەیانتوانیوە بە دروستی لە ئەرەستۆ تێ بگەن، ئەوەش لەبەر ئەوەی وەکو ئێمە ئامرازی رەخنەگرتنیان نەبووە تاکو کتێبە راستیەکانی ئەرەستۆ لەو کتێبانە جیابکەنەوە کە وەپاڵی دراون، یا رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ تێگەیشتن لە کلتوری یۆنانی بۆ ئەوان سەخت بووبێ، بە پێچەوانەی زانایانی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاست کە ئاسانتر تێی دەگەیشتن، چونکە پەیوەندی زانایانی مەسیحی بە کلتوری کۆن بە تەواوی نەپچڕابوو، بەڵام رۆژهەڵاتیەکان بۆ ناسینی فەلسەفەکەی ئەرەستۆ پشتیان بە نوسین و شەرحی زانایانی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان دەبەست، هەروەها هەندێ بەشی مەزهەبی ئەرەستۆتالیسیان کەمبوو وەکو کتێبی سیاسەت، جا بۆیە بە ئاسانی هەردوو کتێبەکەی ئەفلاتونیان لە جێی ئەو کتێبە دانا: کۆمار و یاساکان، هیچ جیاوازیەکیشیان لە نێوان ئەو دوانە نەدەکرد، بەدەگمەن نەبێت.

فاکتەرێکی دیکەی شایانی باس، ئەوەیە موسڵمانەکان کە دەیانبینی کتێبی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان مەزهەبی فەیلەسوفەکانی یۆنانیان شەرحکردووە و پێکیان گونجاندوون، بۆیە ئەوانیش هەر ئەو میتۆدەیان گرتە بەر، یەکەم گرووپی ئەوانەی چوونە سەر مەزهەبەی ئەرەستۆ ناچاربوون هەڵوێستێکی پێچەوانەی دوژمنەکەیان هەبێ و داکۆکی لە خۆیان بکەن، جا زانایانی موسڵمان چ لەگەڵ یەکتر کۆکبن یا ناکۆك خاوەنی فەلسەفەیەکی یەکگرتوو نەبوون کە مرۆڤ بتوانێ لە نێویدا هەقیێکی بێ وێنە بدۆزێتەوە. دواتر زانایانی موسڵمان رێز و حورمەتی خۆیان بۆ کتێبی زانستە یۆنانییەکان دەربڕی، هەروەك چۆن پەیامبەری ئیسلام رێزی کتێبی پیرۆزی مەسیحی و جولەکەکانی دەگرت، گەرچی ئەو زانایانە شارەزای ئەو کتێبانە بوون کە بۆی دەگەڕانەوە، بەڵام نەیاندەتوانی داهێنانی تێدا بکەن، بۆیە پێیان وابوو فەیلەسوفە کۆنەکان سوڵتانی زانستن و دەبێ سەریان بۆ دانەوێنین.

بیرمەندانی سەرەتای ئیسلام بڕوایان بە باڵایی زانستی یۆنانی هەبوو، تەنانەت هیچ گومانیان لەوە نەبوو ئەو زانستە بە باڵاترین پلەی یەقین گەیشتووە، شەرقییەکان نەیاندەتوانی بە ئاسانی بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە کایەیەك بکۆڵنەوە ئەگەر پێشتر واتە پێش ئەوان

لەدەرگای ئەو باسە نەدرابێ، چونکە پێیان وابوو هەر کەسێك شەرمەشقی نەبێت ئەوە سەرمەشقەکەی شەیتانە.

هەروەها نیازی هیچ هەولێکیان نەبوو بۆ هەماهەنگی نێوان ئەرەستۆ و ئەفلاتون، بەتایبەت بۆ بێدەنگ تێپنەڕاندنی ئەو تیۆرانەی کە دژی بیروباوەڕی ئیسلامی بوو، یا بە شێوەیەك دەری بخەن کە بە تەواوی دژی بیروباوەڕی ئیسلامی نییە، بەڵکو هەوڵیان دەدا وەکو فەیلەسوفانی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان پێکیان بگونجێنن(٢٥).

کۆششیان دەکرد تا نەیارانی ئەرەستۆ و نەیارانی فەلسەفە بە گشتی قایل بکەن، گرنگیەکی زۆریان بەو حیکمەت و پەندانە دەدا کە دەکرا بەهۆیەوە ئیمان بە هێز بکرێ، ئەو پەند و حیکمەتانەشیان لە کتێبەکانی ئەرەستۆوە وەردەگرت، جا چ ئەو کتێبانەی بە راستی هی ئەوبوون یا وەپاڵی درابوون، هەروەها لەم کارەشیاندا مەبەستی ئەوەیان هەبوو رێگە خۆش بکەن بۆ قبوڵکردنی بیروبۆچوونە زانستیەکانی ئەرەستۆ.

بەتایبەتیش گەرەکیان بوو -وەکو گرووپ و مەزهەبەکانی تر کردیان- فەلسەفەکەی ئەرەستۆ بکەن بە حەقیقەتی باڵا، ئەوەش بە زەمینەخۆشکردنی لە رێگەی بیروباوەڕی گشتی بۆ ماوە و مەزهەبی ئەو کەلامناسانەی کە لە بەڵگەی پشتگیریکەردا چانسی یەکسانیان نەبوو.

## ١٥- فەلسەفە لە ئیسلامدا:

فەلسەفەی ئیسلامی هەمیشە فەلسەفەیەکی هەڵبژاردنەکی بووە (eklektizismus)، برِبڕەی پشتی ئەو فەلسەفە گوڵچنی کتێبە وەرگێڕدراوەکانی یۆنان بووە، رێڕەوی مێژوویشی هەر تێگەیشتن و هەڵمژینی زانیاری پێشینان بووە، نەك داهێنان، فەلسەفەی ئیسلامی هیچ تایبەتمەندییەکیش نییە لە فەلسەفەکانی پێش خۆی جیای بکاتەوە، نە بە خستنەرووی کێشەی نوێ، نە بە داهێنانی نوێ لەو هەولانەی بۆ تاوتوێکردنی باس و خواسە کۆنەکان بەخشیویانە، لە جیهانی فیکر و هزریشدا هیچ هەنگاوێکیان هەڵنەهێناوە شیاوی تۆمارکردن بێت.

---

(٢٥) ئەم قسەیە بە مەزهەبی کەلامناسە ئەقڵانیەکاندا پەیڕەو ناکرێ کە بیروباوەڕەکانیان زۆر بە روونی پێکناکۆك بوو لەگەڵ ئاییندا. (و.ع).

لەگەڵ ئەوەشدا پێگەی فەلسەی ئیسلامی لە رووی مێژووییەوە زۆر لەوە گەورەترە تەنها ئەڵقەیەکی پەیوەندی نێوان فەلسەفەی کۆن و فەلسەفەی مەسیحایی سەدەکانی ناوەڕاست بێت. شوێن پێ هەڵگرتنی هزری یۆنانی و تێکەڵکردنی بە شارستانیەتی فرە توخمی رۆژهەڵات، لەرووی مێژووییەوە جێگەی بایەخی توێژەرانە، بەتایبەت ئەگەر فەلسەفەی یۆنان لە بیر بکەین و بە فەلسەفەی ئیسلامی بەراوردی نەکەین، بۆیە ئەگەر هەلی ئەوەمان بۆ برەخسێ شارستانیەتی ئیسلامی بە شارستانیەتەکانی دیکەی بەراورد بکەین، ئەوە ئەو بەراوردکردنە دەبێتە لێکۆڵینەوەیەکی پڕ بایەخ.

فەلسەفە دیاردەیەکی سەربەخۆیە و لە وڵاتی یۆنان سەری هەڵداوە، تەنانەت مرۆڤ وای دارشتووە ملکەچی ئەو هەلومەرجە گشتیەش نەبێت کە شارستانیەتەکانی تیادا دروستبووە، بەشێوەیەکیش نەکرێ هۆکاری سەرهەڵدانی وەپاڵ هۆکاری دەرەکی بدرێ.

مێژووی فەلسەفەش لە ئیسلامدا گرنگی و بایەخی خۆی هەیە، چونکە یەکەم هەوڵمان پیشان دەدات بۆ کەڵکوەرگرتن لە فیکر و هزری یۆنانی، کەڵکوەرگرتنێك ئازادانەتر لە سەرهەڵدانی زانستی عەقیدەکان لەلای مەسیحیەکانی سەرەتا، ئەگەر زانیاریمان لەبارەی ئەو هەلومەرجەوە هەبێت کە زەمینەخۆشکەری ئەوهەوڵە بوو، ئەوە دەتوانین لە رێگەی پێوانەوە بەو ئەنجامە بگەین کە زانستە یۆنانیەکان لە سەدە ناوەڕاستینەکاندا لە رێگەی عەرەبەوە بە مەسیحیەکان گەیشتووە، بەڵام دەبێ لەم پێوانەیەشدا وریا بین، هەروەها لانی کەم نابێ ئێستا لەم مەسەلەیەدا زێدەڕۆیی بکەین، پاشان شارەزابوونمان بەو هەلومەرجە، رەنگە هەندێ زانیاریمان پێبدات لەمەڕ ئەو فاکتەرانەی بە هۆیانەوە فەلسەفە بەگشتی سەری هەڵدا.

بە دەگمەن دەتوانین قسە لەمەڕ فەلسەفەی ئیسلامی بکەن بە مانای راستەقینەی ووشەی فەلسەفە، بەڵام زۆر پیاو لە ئیسلامدا هەن نەیانتوانیوە خۆیان لە فەلسەفاندن ببوێرن، ئەوانە گەرچی خۆیان بە بەرگی یۆنان داپۆشیوە، بەڵام ئەو بەرگە رووخساری تایبەتی ئەوانی دانەپۆشیوە. ئاسانە بۆ ئێمە لە کۆشکی بڵندی یەکێك لە قوتابخانە فەلسەفیە هاوچەرخەکانەوە، سوك سەرنجی ئەو پیاوانە بدەین، بەڵام باشتر وایە لە ژینگە مێژووییەکەی خۆیاندا بیانناسین، ئێستا واز لەوە دەهێنین هەر هزرێك لەهزرەکانیان بگەڕێننەوە سەر ئەو چاوگەیەی کە لێوەی هەڵقوڵاوە، ئەم باسە هەڵدەگرین بۆ بەشێکی تایبەت، ئەوەی لێرە بەدواوەش دەیخەینەروو تەنها ئاماژەیە بەو بونیادەی کە بە قسەی موسڵمانەکان پێشتر بۆیان ئامادەکراوە.

# ٢- فەلسەفە و زانستە عەرەبییەکان

## ١- زانستی زماننامسی:

### ١- جۆرەکانی زانست

زانایانی موسڵمان لە سەدەی دەیەمی زایینی (چوارەمی کۆچی) زانستەکانیان دابەشکردبوە سەر: زانستە عەرەبییەکان و زانستە پێشینەکان یا زانستە ناعەرەبییەکان[٢٦]، یەکەم زانست لای ئەوان: زانستی زماننناسی، فیقه، کەلام، مێژوو، ئەدەب، دووەم زانستیش: فەلسەفە، سروشتناسی، پزیشکی.

ئەو دابەشکردنە بە گشتی راست بوو، کۆمەڵەی دووەمی زانستەکان، لە پاڵ کاریگەری گەورەی بیانی بەسەریانەوە، لە نێو عەرەبدا بە تەواوی بڵاونەبووبوو، بەڵام ئەوەی پێی دەوترێ زانستە عەرەبییەکان داهێنراوی تایبەتی دەستی عەرەب نەبوو، بەڵکو گەشە و نەشونمای ئەو زانستانە لەو شوێنانەی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی بوو کە لەوێدا عەرەب و ناعەرەبەکان پێکەوە دەژیان، بۆیە پێویستیان بە بیرکردنەوە لەو بابەتانە هەبوو کە بە توندی پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەبوو، وەك: شیعر و زمان، فیقه و ئایین، ئەوەش بە شێوەی جیاواز لەنێوان عەرەب

---

(٢٦) دەشێ نوسەر مەبەستی (أبا عبدالله محمد بن أحمد یەسف الخوارزمی) بێت، کە لە پێشەکی کتێبەکەیدا: کلیلی زانستەکاندا دەڵێ: "زانستەکانم دابەشی سەر دوو گرووپ کردووە: یەکەمیان زانستە شەرعیەکان و زانستە عەرەبیەکان، دووەم: زانستە عەجەمیەکان لە یۆنانیەکان و گەلانی تر"، **طبعة لندن، ١٩٨٥، ص٥. (و.ع).**

و ناعەرەبەکان، چونکە گەرەکیانبوو بەلێکۆڵینەوە لەو زانستانە کەموکوڕی  زانستەکانیان بزانن و بە ئاسانیش پەی بەکاریگەری بیانییەکان بەتایبەتیش فارسەکان لە چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەو زانستانە ببەن. تا ئێستاش پێگە و گرنگی فەلسەفەی یۆنانی لەو کاریگەرییەدا لە زیادبووندایە.

## ٢- زمانی عەرەبی، قورئان:

عەرەب زۆر پەرۆش و مشورخۆری زمانەکەیان بوون، ئەو زمانە زۆر زەنگینە لە وشە و لێوانلێوە لە وێنەی مەجازی، سروشتی ئەو زمانەش وایە قبوڵی وشەداتاشین دەکات، بۆیە لە نێو زمانەکانی جیهاندا پێگەیەکی گرنگی بۆ خۆی بونیادناوە، گەر بە سەختی و دژواربوونی زمانی لاتینی و قورسی و قەبەیی زمانی فارسی بەراوردی بکەین دەبینین زمانی عەرەبی وێنەی دەستەواژەیی کورتی زۆری تێدایە کە گوزارشت لە مانای پوخت دەکات، ئەم تایبەتمەندیەش بۆ پراکتیزەکردنی زانستەکان زۆر گرنگە، ئێمە بەهۆی ئەو زمانە عەرەبییەوە دەتوانین گوزارشت لە وردترین جیاوازی نێوان ماناکان بکەین، گەرچی فرە هاومانایی وشە لە زمانی عەرەبیدا مرۆڤ بەلارێدا دەبات و لەو رێسایە دووری دەخاتەوە کە ئەرەستۆ دایهێناوە و دەڵێ: بەکارهێنانی دەستەواژە و وشەی هاومانا لە زانستە وردەکاندا شیاو نییە، چونکە لەو زانستانەدا مانا بە وردی دیاری دەکرێت.

هەر زمانێك جوانی دەربڕین و هێزی ئاماژەی تێدابێ، هاوکات دژواریش بێ، ئەوە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و هەڵکۆڵینی زۆر هەیە، هەروەك زمانی عەرەبی، کاتێك بوو بە زمانی زانست لای سریان و فارسەکان.

ئەو شتەی وایکرد قوڵبونەوە لە توێژینەوەی زمان شتێکی پێویست بێ، ئەوەبوو موسڵمانەکان سەرقاڵی توێژینەوە و خوێندن و تەفسیری قورئان بوون، هەروەها بە گوێرەی قسەی ئەوانەی نەبووبوون بە ئیسلام دەیانتوانی هەڵەی زمانەکانی لە قورئاندا بسەلمێنن، بۆیە موسڵمانەکان بۆ ئەو مەبەستە کەوتنە لێکۆڵینەوەی زمان، نموونەی شیعری کۆنی عەرەبییان کۆکردەوە، قسەی باوی سەرزمانی بەدەوییەکانیان پشتگیرییەك بوو بۆ زمانی قورئان، تێبینی گشتیش خرانە سەر ئەو نموونانە کە پەیوەستبوون بە دروستی رستە بە شێوەیەکی گشتی.

بە گشتی پێوەری ئەوان زمانی گفتوگۆی عەرەبی بوو، گەرچی موسڵمانەکان کاتێك هەوڵیان دەدا داکۆکی لە دروستی شێوازی قورئان بکەن، هەندێ جار بەرهەمەکانیان لە شتی دروستکراو و ساختە خاڵی نەبوو، بەڵام ساویلکەیی موسڵمانەکان ئەوەبوو بەگومانەوە سەرنجی ئەو هەوڵانەیان دەدا، تەنانەت (مەسعودی)ش بۆمان دەگێڕێتەوە هەندێ زمانزانی بەسرە باسی ئەوەیان دەکرد کە دەستکاری هەندێ لەو (دەمی کار)انە کراوە کە لە قورئاندا هاتوون، ئەو زمانزانانە لە گەشت بوون، لە نزیك ئەوانیش هەندێ بیستانڕن هەبوون، کاتێك گوێیان لە قسەی زمانزانە بەسراییەکان بوو هێرشیان کردنە سەر و دارکاریان کردن[٢٧].

## ٣- زمانزانەکانی بەسرە و کوفە:

عەرەب دارشتنی رێزمان و زۆر شتی تر وەپاڵ ئیمامی عەلی (ر.خ) دەدەن، تەنانەت دابەشکردنی وشە بۆ سێ بەش کە هی ئەرەستۆیە، ئەویش هەر وەپاڵ ئیمامی عەلی دەدەن.
راستیەکەی خەڵکی لە بەسرە و کوفەوە دەستیان کرد بە دیراسەکردنی رێزمان کرد و هەر لە یەکەم لێکۆڵینەوەشدا بە لێڵی و تەمومژی تەنرا، گەر تەماشای کتێبی (سبعویە)[٢٨] بکەین، بەرهەمێکی پێگەیشتوو و هەوڵێکی مەزن دەبینین، تەنانەت زانایانی دواتریش

---

(٢٧) ئەبو خەلیفە **الفضل** بن الحباب الجمحی، ساڵی ٣٠٥ ی کۆچیی مردووە و یەکێك بووە لە قازییەکانی بەسرە و زۆر قسەخۆش بووە، ئەم پیاوە و هەندێ لە دۆستانی لە ژێر دار خورمایەك لە کەناری رووبارێك لە رووبارەکانی بەسرە دانیشتبوون، هەندێك لە دۆستانی پرسیاری حوکمی (واو)یان لێکرد لە قورئاندا کە دەڵێ:**{یا أیها الذین أمنوا قوا أنفسکم و أهلیکم نارا وقودها الناس و الحجارة}**، جا پرسیان ئەگەر بۆ یەکێك یا دوان یا کۆمەڵێك پیاو و ژن بێت چۆن دەبێت، جا پێیان وت بە پەلە وەڵامی ئەمەمان بدەرەوە، ئەویش ووتی: ق قیاقوا قی قیا قین، کاتێك بێستانڕنەکان گوێیان لەو قسەیە بوو یەکسەر هێرشیان بۆ کردن و گووتیان: "ئەی زەندیقینە، ئێوە قورئان بە پیتی مریشك دەخوێننەوە و دارکاریان کردن، ئیدی پاش دەردەسەرییەکی زۆر ئەبو خەلیفە و دۆستانی قوتاریان بوو"، **مروج الذهب، ج٨، ص ١٣١-١٣٤ طبعة باریس.**

(٢٨) ئەبو بشر عمرو بن **عثمان** بن قنبر شوێنکەوتەی بن الحارپ بن کعب، لەبارەی مێژووی مردنی ناکۆکی هەیە، هەندێك دەڵێن لە ساڵی ١٦١کۆچیی و هەندێکی تر دەڵێن ساڵی ١٨٠ی کۆچیی یا ١٩٤ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

دەیانوت دەبێ ئەو کتێبە بەرهەمی هەوڵ و کۆششی کۆمەڵێك زانا بێت، هەروەك یاساکەی ئیبن سینا لە پزیشکیدا.

زانیاریمان لەمەڕ لایەنە جیاوازەکانی نێوان خەڵکی کوفە و خەڵکی بەسرە تەواو نییە، دەڵێن زمانزانەکانی بەسرە هەروەك زمانزانەکانی دواتری بەغدا لە حوکمی پەیوەست بە کاروبارەکانی زمان گرنگی زۆریان بە پێوەر (قیاس) دەدا، بەڵام کوفەییەکان گرنگیان بە شتی زۆر توندتر لە پێوەر دەدا، بۆیە بە زمانزانەکانی بەسرە دەوترا (ئەهلی لۆژیك) وەکو جیاکردنەوەیەك لە زمانزانانی کوفە، دەستەواژە رێزمانییەکانیان کەمێك جیاوازبوو لە دەستەواژە رێزمانییەکانی زماننناسە کوفەییەکان.

عەرەبەکان کە هەر لەسەر چەشەی (سەلیقە) عەرەبی خۆیان مابوون، بە کولتور و رۆشنبیری تازە کاریگەر نەبوون، پێیان وابوو لۆژیك مێشکی زۆر کەسی تێکداوە، تەنانەت لە وردبوونەوە لە زمان زێدەڕۆییان دەکرد، بەڵام ئەوانی تر رێزمانی زمانەکانیان بە ئارەزووی خۆیان دارشت.

لەوەی خەڵکی بەسرە یەکەم کەس بوونە سودیان لە لۆژیك وەرگرت هەر رێکەوتێك نەبوو، چونکە کاریگەری رێبازە فەلسەفییەکان بەر لە شارەکانی دیکە لە بەسرە وەردەکەوت، لە نێو زمانزانە بەسراییەکان زۆرێك لەو شیعە و موعتەزیلانە هەبوون کە زەمینەیان بۆ حیکمەتی بیانی خۆشکرد تا کار بکاتە سەر رێبازە کەلامییەکانیان.

## ٤- رێزمانی کاریگەر بە لۆژیك، کێش (عەروز):

لۆژیکی ئەرەستۆ کاریگەریخستە سەر ئەو زانستە زمانەوانیانەی کە ئەرکیان کۆکردنەوەی نموونە و وشەی هاوواتا و رێزمان نەبوو، چونکە ئەمانە پەیوەندی بەو بابەتانەوە هەبوو کە تاوتوێیان دەکرد، بەڵام سریانی و فارسەکان بەر لە چەرخی ئیسلامی کتێبی رستەناسی ئەرەستۆیان دیراسە کرد، وێڕای هەندێ پاشکۆی رەواقییەکان و نوێ ئەفلاتونییەکانیش.

ئیبن مەقفەع کە لەسەرەتادا هاوڕێی خەلیل بن ئەحمەدی زماننناس بوو، رێگەی بۆ عەرەب خۆشکرد تا شارەزایی لێکۆڵینەوە زمانەوانی و لۆژیکیەکانی ناو زمانی پەهلەوی بن، بۆ نموونە جاروبار رستەی لە پێنج چەشن و جۆردا، جارێکی تر لە هەشت یا نۆ جۆردا پۆلین کرد، هەروەك هەر سێ بەشی ووشەی لە: ناو، کار، پیت-دا دەستنیشانکرد.

پاشان هەندێ زانای وەك **جاحظ** هاتن، شێوەی پێوەری لۆژیکیان خستە نێو شێوازی ڕەوانبێژییەوە[29].

دواتر مشتومڕێکی زۆر لەبارەی ڕەوانبێژییەوە کرا کە ئایا ڕەوانبێژی لە دەستەواژەدایە یا لە مانادا، پاشان لە زمانیش کۆڵدرایەوە کە ئایا خۆرسکە یا دەستکردی مرۆڤە، وردە وردە تای تەرازووی ئەو بۆچوونە فەلسەفییە سەنگینتربوو کە دەڵێ زمان، چەمکە و دەستکردنی مرۆڤە.

لە پاڵ کاریگەری لۆژیك کاریگەری زانستە بیرکاری و پەروەردەییەکانیش دەبینین هەروەك کۆکردنەوەی ئەو پەخشانانەی لەسەر زاری خەڵکی بوون، کۆکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان، کۆکردنەوەی قەسیدەی شاعیران، بگرە لەسەر بنەمایەکی دیاریکراویش پۆلین کران، بۆ نموونە لەسەر کتێبی شیعری.

لە دوای ڕێزمان، عەروز (Prosody- زانستی ڕێکخستنی هۆنراوە) دەرکەوت، دەڵێن خەلیل بن ئەحمەد[30] مامۆستای سەبعەوی بوو، یەکەم کەسیش بووە پێوەری لە زماننناسیدا بەکارهێناوە، دەگێڕنەوە کە ئەو زانستی عەروزی داهێناوە، گەرچی ئەو زمانەی شیعری پێ دەنوسرا بە توخمێکی نەتەوەیی زاراوەناسی لە شیعردا لە قەڵەم دەدرا، هەندێك پێیان وابووە کێشی عەروزی شیعر شتێکی سروشتیە و کۆی مرۆڤەکان تێیدا هاوبەشن، بۆیە دەبینین سابتی کوڕی قووڕە[31] لە پۆلینکردنی زانستەکاندا پێی وایە کێشی عەروزی شتێکی گرنگ و جەوهەرییە، عەروزناسییش زانستێکی سروشتییە، بۆیە ئیبن قووڕڕە بە بەشێکی فەلسەفەی لە قەڵەم دەدا.

---

**(29)** مەبەست لە وشەی (rhetorlk) وتار یا ڕەوانبێژییە.(و.ع).

**(30)** ساڵی ١٠٠ی کۆچیی لەدایکبووە و لە نێوان ساڵانی ١٦٠ – ١٧٥ کۆچیی مردووە (أبن خلکان ج١ ص ٢١٦). (و.ع).

**(31)** أبو الحسن پابت بن الحکیم الحرانی، ساڵی ٢٢١ کۆچیی لەدایکبووە و ساڵی ٢٨٨ کۆچیی مردووە، أبن خلکان ج١ ص ١٢٤-١٢٥، **طبقات الاطباء**، ج ٢ ص ٢١٥-٢٢٠، الفهرست ص ٢٧٢، کتێبێکی لەمەڕ پۆلینکاری زانستەکان هەیە و وەرگێڕانە لاتینیەکەی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە ئەڵمانیا بڵاوبۆتەوە. (و.ع).

**٥- زانستی ڕێزمان و فەلسەفە:**

وێڕای هەموو ئەوانەش ڕێزمانی عەرەب تایبەتمەندییەکانی خۆی پاراست، ئێرە شوێنی ئەوە نییە پتری لەسەر بدوێین، بە هەرحاڵ ڕێزمانی عەرەبی یەکێکە لە بەرهەمە نایابەکانی ئەقڵی عەرەبی، کە کەلێنی دۆزینەوەی خاڵی لاوازی نەبوو، ئەمەش شتێك بوو عەرەب مافی خۆیان بوو شانازی پێوە بکەن، یەکێك لە زاناکانی سەدەی دەیەمی زایینی (چوارەمی کۆچی) کە زانستە عەرەبییەکانی بەسەر فەلسەفەدا فەزڵکردووە دەڵێ: (هەر کەس بزانێ لە شیعر و کێشی عەرەبیدا چ وردی و قوڵیەکی تێدایە، دەزانێ شیعری عەرەبی لەو ژمارە و هێڵ و خاڵانە باڵاترە کە خەڵکانێك پشتی پێ دەبەستن و پێیان وایە پەی بە جەوهەری هەموو شتێك دەبەن، من هیچ سودێکی گرنگ لەو شتانە نابینم، ڕەنگە هەندێ سودی کەمیشی هەبێ، بەڵام زیان بەعەقیدە دەگەیەنێ و دەبیتە هۆی گەندەڵی).

عەرەب حەزیان نەدەکرد بیروباوەڕە گشتیەکانی فەلسەفە، ئەو چێژەیان لێ بشێوێنێ کە لە وردبینی زمانەکەیاندا دەیانبینیوە، چەندین مامۆستای زمانەوانی عەرەبی لەگەڵ وەرگێڕانی کتێبە بیانییەکانەوە سەریان هەڵدا!!.

هونەری خۆشنوسی لە لێکۆڵینەوەی زانستیانەی زمان بەناوبانگتر بوو، ئەو هونەرە گەیشتبووە ئاستێکی باڵای وردی و قوڵی، ئەو خەتە -وەکو هەموو هونەرەکانی دیکەی عەرەب- پتر لە زەخرەفەوە نزیك بوو نەك داهێنان.

لە تایبەتمەندییەکانی خەتی عەرەبیدا کار وردی و لێهاتووی ئەو ئەقڵەمان بۆ دەردەکەوێ کە دایڕشتووە، بەڵام هاوکات کەمتەرخەمی و بێ وزەیی دەبینین، ئەم شتە لە سەرپاکی کولتوری عەرەبیدا دەبینین.

## ٢- پەروەردەی ئاکاری

**١- سوننەت، فەرموودە، بۆچوون:**

ئەو پێوەرەی کە موسڵمان کاروکردەوە و بۆچوون خۆی لەسەر بونیاد دەنێ قسەی خودایە کە لە قورئاندا هاتووە، پاشان پەیامبەرەکەی (ص)، دوای ئەوەی پەیامبەر کۆچی دواییکرد لەو کاروبارانەی لە قورئاندا باس نەکرا بوو کار بە سوننەتەکانی پەیامبەر کرا، مەبەستم ئەوەیە خەڵکی لە کردار و گوفتاریاندا لەسەر سوننەتی پەیامبەر دەڕۆیشتن، هەروەك لە یارانی پەیامبەرەوە بە خەڵك گەیشتبوو.

بەڵام دوای ئەوەی موسڵمانەکان هەندێ وڵاتی خاوەن شارستانیەتی کۆنیان فەتح کرد، لە هەموو روویەکەوە داخوازی و داواکاری نوێ سەری هەڵدا، کە ئیسلام لەو بارەوە هیچ رێنماییەکی نەبوو، چونکە لەبری کاروباری ئاسایی ژیانی عەرەبی، رووبەرووی داب و نەرێتێك بوونەوە کە قورئان لەو بارەوە هیچ حوکمێکی نەبوو، نە لە سوننەت و نە لە تەئویکردنیشدا رێگەچارەی ئەو شتانە نەدەدۆزرانەوە.

رۆژ بە رۆژ کێشەی تاکەکەسی زیادی دەکرد کە هیچ دەقێکیش لەبارەی ئەو کێشانەوە نەبوو، موسڵمانەکانیش هیچ حوکمێکیان لەو بارەوە نەبوو، چ حوکمێك لەگەڵ نەرێتی بۆماوەییان بگونجێ یا بەهۆی بۆچوونی تاکەکەسیەوە پێی گەیشتبن، بێگومان لە ناوچە رۆمانییەکانی وەك شام و میزۆپۆتامیا، یاسای رۆمانی ماوەیەکی زۆر کاریگەری گرنگی بەسەر ئەو کێشەیەوە هەبوو.

ئەو فەقێ و زانایانەی بۆچوونیان لە دەرککردنی یاسادا لە پاڵ قورئان و سوننەتدا لەبەرچاو دەگیرا و خاوەن پێگە بوو، پێیان دەوترا (کەسانی خاوەن بۆچوون)، پێشەواشیان ئەبو حەنیفەی (٨٠-١٥٠ کۆچی) دامەزرێنەری مەزهەبی حەنەفیە لە کوفە.

بەڵام فەقێکانی شاری مەدینە بەر لە دەرکەوتنی مەزهەبی ئیمامی مالك (٩٥-١٨٩کۆچی _ ٧١٥-٧٩٥ز) بێ گرفت (رأی)یان بەکاردەهێنا، با بە رادەیەکی کەمیش بوایە، هەروەها شوێنکەوتوانی مەزهەبی مالیك خۆیشیان رەئییان بەکاردەهێنا.

بەڵام دوای ئەوەی خەڵکی وردە وردە رووبەرووی رەئی بوونەوە، چونکە ئیدی وای لێهاتبوو بەگوێرەی ئارەزوو حوکم و رەئی دەدرا، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی ئەو مەزهەبە بەهێز ببێت کە دەیگوت دەبێ لە هەموو شتێکدا بگەڕێینەوە سەر فەرموودەی رون و رەوانی سوننەتی پەیامبەر، بۆیە لە هەموو لایەکەوە دەستکرا بە کۆکردنەوەی فەرموودەکان، جا تەفسیرکران، گەرچی زۆریشیان لەنێوچوون، پاشان رێسایەك دەرچوو بە گوێرەی ئەو رێسایە فەرموودەی دروست لە فەرموودە ناکۆکی لەسەرەکان جیادەکرایەوە، ئەو رێسایە گرنگی بە بەڵگە و پاڵپشتی فەرموودەکە دەدا، کەمتر گرنگی بەوە دەدا فەرمودە نەکەوێتە پارادۆکس و پێکدژی لۆژیکیەوە یا راستی و دروستی سەبارەت بە پەیامبەر.

لە ژێر کاریگەری ئەو پەرەسەندنەدا دوو گرووپ دەرکەوتن: گرووپی ئەهلی رەئی، ئەمانە پتر لە عیراق بوون، گرووپی دووەم: گرووپی ئەهلی فەرموودە یا ئەهلی مەددینە بوون.

پاشان شافعی (١٥٠-٢٠٤ کۆچی) خاوەنی سێیەم مەزهەبی ئیسلامی دەرکەوت، شافعی بە زۆری پشت بە سوننەت دەبەستێ، بۆیە دەخرێتە ریزی ئەهلی فەرموودەوە، جیاواز لە ئەبو حەنیفە.

**٢- پێوەر:**

فێربوونی لۆژیك رێگەی بە هاتنە ژوورەوەی توخمێکی تازە دا بۆ ناو مشتومڕی نێوان هەردوو گرووپ، کە پێوەر بوو. بێگومان فوقەها تارادەیەك پێش خەڵکی تر پێوەریان بەکارهێنا، کردنی پێوەر بە بنەمایەك یا سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی حوکم یا یاسا، واتە کاریگەربوون بە بیرکردنەوەی زانستی[٣٢].

رەئی و پێوەر ئەگەر وەکو هاوماناش بەکاربهێنرێن، ئەوە بواری حوکمی شەخسی لە دووەمیاندا لەوەی یەکەمیان بەرتەسککترە، کاتێك خەڵکی فێربوون لە لێکۆڵینەوە زمانەوانی و لۆژیکیەکاندا پێوەر بەکاربهێنن، ئیدی بەکارهێنانیشی لە حوکمە فیقهیەکاندا سەخت نەبوو، ئەوەش یا بە هەڵێنجانی حوکمی شتێك لە حوکمی شتێکی هاوشێوەی ئەو شتە، یا هەڵێنجانی حوکمی کەم لە حوکمی زۆر، واتە: بەرێگەی پێوەری نموونەیی، یا بە دەرهێنانی زانستی حوکمی هاوبەش لە نێوان

---

(٣٢) پێوەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە بەکار دێت، بەشێوەیەکی بەرچاویش لەسەردەمی یاوەرانەوە بەکاردێت، بگەڕێوە بۆ کتێبی (**تمهيد لتاريخ الفلسفة الاسلامية**) ص ١٣٩-١٤٦، ١٥١-١٥٨-١٦٣-١٧٢-١٩٠و دواتر. (و.ع).

بەشە بچوکە جیاوازەکاندا، دەکرێ حوکمی یەکێکیان بسەپێنرێ، ئەوەش بە بوونی هۆکارێك کە هەموو شتەکان تێیدا هاوبەشن (واتە بە رێگەی پێوەری سۆراخکاری)[٣٣].

وەك دەردەکەوێ لەسەرەتادا پێوەر بە شێوەیەکی بەرفراوان لە نێوان حەنەفییەکان بەکاردەهات، لە دوای ئەوان لە نێو شافعیەکان، بەڵام بە شێوەیەکی کەمتر. ئەوەی کە ئایا زمان بۆ دەربڕینی گشتی لە بارە، یاخود هەر بۆ دەربڕینی بەشەکی لە بارە؟؟، پەیوەندی بەم باسەوە هەیە، بۆیە ئەم مەسەلەیە لە تیۆر و مەزهەبە فیقهیەکاندا گرنگی زۆری پێدراوە.

بەڵام پێوەر وەکو بنەمایەکی لۆژیکی لە فیقهدا چانسێکی زۆری نەبووە. لە دوای قورئان و سوننەت کە دوو سەرچاوەی یەکەمی حوکمی فیقهین، فوقەها جەختیان لەسەر بەهای کۆدەنگ کردووە، مەبەستم کۆدەنگی گرووپە ئیسلامییەکان لەسەر حوکمێك، یا کۆدەنگی میللەتێك، بەمانایەکی ووردتر کۆدەنگی موجتەهیدین، -ئەوانەی دەتوانین بە پاپاکانی کلیسا و زانایانی مەزهەبی کاسۆلیکیان بچوێنین. کۆدەنگی، بنەمایەکە تەنها ژمارەیەکی کەمی زانایان بەرەنگاری بونەوە، دواتر ئەو بنەمایە بووە گەورەترین ئامرازی پاڵپشتیکردنی فیقهی ئیسلامی.

تا ئێستاش لەرووی تیۆرییەوە پێوەر لە پلەی دووەمدایە، پێوەر بنەمایەکە لە بنەماکانی حوکمەکان و لەدوای قورئان و سوننەت و کۆدەنگی لە پلەی چوارەمدایە.

### ٣- بابەتی فیقە و پێگەکەی:

زانستی فیقە سەرجەم لایەنەکانی ژیانی موسڵمان دەخاتە بەرباس، باوەڕ یەکەم ئەرکی موسڵمانە. لەسەرەتادا فیقهیش وەکو هەموو شتێکی تازە رووبەرووی نارەزایی بۆوە، کە بەهۆی فیقهەوە حوکمەکانی شەریعەت بوون بە مەزهەبێکی تیۆری و ملکەچی بۆ فەرمانەکانی ئایین گۆڕا بە کاری مەعریفی.

ئەمەش لەلایەن خواپەرستانەوە و لەلایەن پیاوانی سیاسەتەوە رووبەرووی بەرەنگاری بۆوە، بەڵام خەڵکی وردە وردە دانیان بەوەدا هێنا کە زانایانی شەریعەتیش (فوقەها) میراتگریی پەیامبەرن.

ئەحکامناسی بەر لە (عەقیدە) نەش و نمای کرد و توانی تا ئەمڕۆش پێگەیەکی مەزن بۆ خۆی بونیاد بنێ، تارادەیەك هەموو موسڵمانان شارەزاییان لە بەشێك لە ئەحکامەکان هەیە،

---

(٣٣) وشەی پێوەر دەکەوێتە بەرامبەر ووشەی (Analogie). (نوسەر).

چونکە بەشێکە لە پەروەردەیەکی ئایینی چاك، ئیمامی غەزالی پێی وایە زانستی فیقھ رۆژانە دەروونی باوەڕدار بەهێز دەکات، بەڵام کەلامناسی تەنها تیماری دەروونێکی نەخۆش دەکات.

پێویست ناکات بچینە سەر قسەی فوقەها و رێچکەکانیان، فیقھ لە جەوهەری خۆیدا یاسایەکی تیۆری نموونەییە کە ناتوانین لەم دونیا ناکاملەدا بە پوختی دەری بهێنن.

ئێستا پلە و پایە و بنەماکانی زانستی فیقھمان لە ئیسلامدا زانی، جا با بە کورتی باس لە پۆلینکردنی کار و هەڵسوکەوتەکان بکەین کە بابەتی زانستی فیقهن، فوقەها بەم شێوەیە دابەشیان کردووە:

١- ئەرکە سەپێنراوەکان: لە ئەنجامدانیان پاداشت دەکرێن، لە نەکردنیشیان سزا دەدرێن.

٢- ئەو ئەرکانەی شەرع رێی پێداون، ئەنجامدەرانی پاداشت دەکرێن و ئەنجامنەدەرانیشی سزا نادرێن، (سوننەت و مەندوب و مستجب).

٣- ئەو ئەرکانەی شەرع رێی پێداون، جێگەی سزا و پاداشت نییە، چونکە ئەو کارانە شیاون و رێیان پێدراوە.

٤- ئەو کارانەی شەرع بڕیاری لەسەر نەداون، بەڵام سزای لەسەر نییە، بەڵکو تەنها ئەوەی کارێکی دزێوە.

٥- ئەو کارانەی شەرع نەهی لێکردوون، ئەنجامدانی سزای بەدواوەیە و قەدەغەکراوە(٣٤).

**٤- ئەخلاق و سیاسەت:**

تیۆرەکانی فەلسەفەی یۆنانی کاریگەرییەکی دوولایەنەی کردۆتە سەر توێژینەوە ئەخلاقیەکان لە ئیسلامدا، لەلای زۆرێك ئەهلی گرووپ و سۆفیگەرەکان، لای ئەهلی سوننە و ئەهلی بەگومڕاناوبراوان، مەزهەبێکی ئەخلاقی دەبینین پتر مەیلی بەلای زوهددایە و رەنگوبۆی فیساگۆرس و ئەفلاتونی پێوەیە.

شتی لەم جۆرە لەلای ئەو فەیلەسوفانەش دەبینین کە دواتر لە بارەیانەوە دەدوێین، زۆرجار لە نێو ئەهلی سووننەدا ئەو قسەیەی ئەرەستۆ دەوترێتەوە کە دەڵێ: فەزیلەت مامناوەندیبوونە

---

(٣٤) بڕوانە: snouck hurgronje iz Z. D. M.O. LIII, S, 155. نوسەر.

(واتە میانڕەوییە)، بەهۆی ئەوەی شتی لەم چەشنە لە قورئاندا هاتووە[٣٥]، و ڕەوتی ئیسلامیش بە گشتی ڕەوتێکی هەماهەنگکەری نێوان دوو لایەنی پێکدژە.

بەڵام سیاسەت لە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا پتر لە مەسەلە ئەخلاقیەکاندا سەرنجی توێژەرانی بۆ خۆی ڕاکێشاوە، تێکۆشانی نێوان پارتە سیاسیەکان یەکەم فاکتەر بوو بۆ هاتنەئارای بیروڕای جیاواز، دەبینین مەسەلەی ئیمامەت، مەبەستم پێشەوای گرووپێکی ئیسلامیە، بە درێژایی مێژووی ئیسلامی جێگەی ناکۆکی بووە.

گەرچی ئەو بابەتانەی ناکۆکیان لەسەر بووە، پتر تاکەکەسی و پراکتیکی بوونە نەك تیۆری بن، مێژوونووسی فەلسەفیی پێویستی بەوە نییە تیایاندا قوڵ ببێتەوە، چونکە هیچ شتێکییان تێدا نییە نادۆزێتەوە بەهایەکی فەلسەفی هەبێت.

لەسەدەکانی سەرەتادا دەوڵەتی ئیسلامی یاسایەکی شەرعی دەستووری نەگۆڕی هەبوو، بەڵام فەرمانڕەوا بەهێزەکان کاریان پێ نەدەکرد، چونکە شارەزای تیۆرەکانی فیقه نەبوون و ئەو کارەشیان بە وردبینی کەلامناسی لەقەڵەم دەدا، فەرمانڕەوا لاوازەکانیش نەیانتوانی ئەو یاسایانە بە گشتی پراکتیزە بکەن.

دیسان باسکردنی ئەو هەموو کتێبەی باس لە کەسایەتی و هەڵسوکەوتی پاشاکانی کردووە، بێ سودە، بەتایبەت لای فارسەکان زۆر برەوی هەبووە، کە دەستەودایرە و کۆشکەکانی والێدەکرد متمانە بەخۆیان و ئەرکەکانیان بکەن و حوکمێکی ئەخلاقی و ڕێسایەکی سیاسی حەکیمانە دەستەبەر بکەن.

کۆششی فەلسەفی لە ئیسلامدا پتر گرنگی بە لایەنی تیۆری ئەقڵانی دەدا، فەیلەسوفەکان گرنگیان بەو بابەتانە نەدەدا کە ژیانی واقیعی کۆمەڵایەتی و سیاسی ڕووبەڕووی دەکردنەوە، مەگەر لە کاتی پێویستدا.

هەروەها هونەری ئیسلامیش هەروا، هونەریش گەرچی پتر لە چوارچێوەی داهێناندابوو نەك زانست، کەچی نەیدەتوانی ژیان لە ماددەیەکی خامدا زیندووبکاتەوە، بەڵکو یاری بە وێنە زەخرەفییەکان دەکرد، شیعری عەرەبیش (درامای) دا نەهێنا، فەلسەفەکەشیان فەلسەفەیەکی زانستی نەبوو.

---

(٣٥) نوسەر مەبەستی ئایەتەکانی وەك : **{و تجعل يدك مغلولة الى عنقك و لا تنبسطها كل البسط}، يا {و الذين انفقوا لم يسرفوا و لم يقتروا و كان بين ذلك قواما}. (و.ع).**

## ٣- مەزهەبە بیروباوەڕییەکان

### (مەزهەبی کەلامناسان)

#### ١- بیروباوەڕی مەسیحایی:

قورئان ئایینی بە موسڵمانان بەخشیوە، نەك تیۆرە، هەروەها ئەحکامی پێ بەخشیون نەك مەزهەب. پێشەوایانی یەکەمی موسڵمانان ئەوەیان قبوڵکرد کە لە قورئاندا هیچ پێکدژیەك نییە، ئەوان بە گوێرەی ئاڵوگۆڕی هەلومەرجی ژیانی پەیامبەر (ص) و باری دەروونی بیانوویان بۆ پێکدژیانە دەهێنایەوە و بێ ئەوەی بپرسن: چۆن؟ یا بۆ؟ بڕوایان پێهێنا.

بەڵام دوای ئەوەی موسڵمانان وڵاتانی دیکەیان فەتح کرد، مەزهەبناسی مەسیحییان بینی کە بونیادێکی کامڵی هەیە، هەروەها مەزهەبی شوێنکەوتوانی زەردەشتی و مەزهەبی بەراهمەشیان بینی.

پێشتر قسەمان لەسەر ئەوەکرد کە تا چەند موسڵمانان سودیان لە مەسیحیەکان وەرگرتووە، بێگومان مەزهەبی کەلامناسان زۆر کاریگەربوون بە فاکتەرە مەسیحاییەکان، هەروەها بیروباوەڕی ئیسلامی لە دروستبوونیدا کاریگەربوو بە مەزهەبی (مەلکانی و یەعقوبییەکان) لە دیمەشق، لە بەغدا و بەسرەش کاریگەربوون بە مەزهەبی (نەستوری و گنوسی).

لەبارەی سەرهەڵدانی ئەو بزووتنەوەیە تەنها ژمارەیەکی کەمی بەجێماوی نوسراومان بە دەست گەیشتووە، گەرچی هەڵەمان نەوتووە گەر بڵێین تێکەڵبوونی موسڵمانەکان بە مەسیحییەکان و وەرگرتنی زانست لە مەسیحیەکانەوە کاریگەرییەکی فراوانی هەبووە.

نە لەو سەردەم و نە ئەمڕۆش لە رۆژهەڵاتدا کتێب خوێندنەوە هیچ سودێکی نییە، بەڵکو خەڵکی پتر بەشێوەیەکی زارەکیانە لە مامۆستاکانیانەوە فێری شت دەبن، واتە کەمتر لە رێگەی کتێبەوە. ئێمە دەبینین لە نێو مەزهەبی کەلامناسانی سەرەتای ئیسلامدا و لەنێو بیروباوەڕی مەسیحاییدا لێکچوونێکی بەهێز هەیە، کە هیچ کەس ناتوانێ نکۆڵی لە پەیوەندی راستەوخۆی نێوانیان بکات.

یەکەم بابەت کە لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە زۆر مشتومڕی لەسەر کرا، مەسەلەی (سەرپشکبوون- الاختیار بوو)، ئێستا سەرپاکی مەسیحیە رۆژهەڵاتیەکان سەرپشکبوونیان قبوڵکردوە، مەسەلەی ئیرادەش لە هیچ سەردەمێك و لە هیچ وڵاتێك لە هەموو روویەکەوە لێی نەکۆڵراوەتەوە وەکو ئەوەی لەرۆژگاری فەتحی ئیسلامیدا زانایانی مەسیحی رۆژهەڵات لێیان کۆڵیەوە، ئەو باسە سەرەتا هەر لەناو چوارچێوەی ئەو گرفتانە بوو کە پەیوەست بووبە مەسیح، پاشان خرایە نێو ئەو بابانەی کە پەیوەستبوون بە مرۆڤەوە.

لە پاڵ ئەم بەڵگانەشدا، بەڵگەی دیکەی جۆراوجۆریش هەن لەسەر ئەوەی گرووپە یەکەمینەکانی موسڵمانان کە سەرپشکبوونیان پەسەندکردووە، مامۆستای مەسیحیان هەبووە.

پاشان توخمە پوختەکانی فەلسەفە، سەرەتا لە مەزهەبی گنوسیەکان و ئەو کتێبانەی کە دواتر وەرگێڕدران، هات، هەڵبەت لەپاڵ کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی- مەسیحایی.

**٢- کەلامناسی:**

ئەو قسانەی بە شێوەیەکی زارەکی یا نوسین و لەسەر شێوەی لۆژیکی یا دیالێکتیکی دارێژراون، بەگشتی لەلای عەرەب بەتایبەتیش لە تاوتوێکردنی مەسەلە مەزهەبییەکان پێی دەوترێ (کەلام)، پێشەوایانی ئەم رەوتەش پێیان دەوترێ (کەلامناسان)، وشەی (کەلام) لە بەکارهێنانی وەك ئاماژەیەك بۆ چەند حاڵەتێکی تاکەکەسی گوێزرایەوە بۆ بەکارهێنانی، وەك ئاماژەیەك بە کۆی مەزهەبی کەلامناسان و ئەوەی پێی دەوترێ بنەما و بنەڕەت.

باشترین دەستەواژەش بۆ کەلامناسان (دیالێکتیکی ئایینی) یا تەنها (دیالێکتیکە)، لێرە بەدواوە لە بری دەستەواژەی کەلامناسان دەستەواژەی (دیالێکتیکەر) بەکاردەهێنم[*].

دەستەواژەی (کەلامناسان) بۆ یەکەمجار بەسەر هەموو ئەوانەدا دابڕا کە سەرقاڵی تاوتوێکردنی بیروباوەڕ و مەزهەب بوون، دوای ئەوە بەتایبەت بەو کەلامناسانە دەوترا کە دژی موعتەزیلەکان بوون و شوێنی(شوێنکەوتوانی فەرموودە) ئەهلی سوننە کەوتبوون، کەوایە دەبێ دەستەواژەی کەلامناسان بە (بیرمەندانی خوێندنگەیی –scholastiker) یا (دۆگمایستەکان dogmatists) وەرگێڕین، راستیەکەی گەرچی نەوەی یەکەمی کەلامناسان دەیانتوانی بونیادی بیروباوەڕ دابمەزرێنن، بەڵام نەوەکانی دواتر تەنها خەریکی سەلماندنی ئەو بیروباوەڕانەی نەوەی یەکەم بوون و بەڵگەیان لەسەر دەهێنایەوە.

لەسەرەتادا دەرکەوتنی (کەلامناسی) لە ئیسلامدا بە گەورەترین بیدعە دادەنرا، ئەهلی فەرموودە کە پێیان وابوو ئەوەی لە ئەحکامی فیقهی پراکتیکی دەکۆڵێتەوە گومڕایە، پێداگربوون لەسەر تەکفیرکردنی ئەم زانستە، چونکە لەلای ئەهلی فەرموودە باوەڕ ملکەچی و گوێڕایەڵیە، نەك وەکو ئەوەی مورجینە و موعتەزیلەکان بۆی چووبوون کە پێیان وابوو باوەڕ، زانست و مەعریفەیە. بگرە موعتەزیلە و مورجینەکان پێیان وابوو بیرکردنەوەی ئەقڵانی ئەرکی سەپێنراوی سەر موسڵمانانە، هەلومەرجی ئەو سەردەمەش هاوکاربوو بۆ پەسەندکردنی ئەو بۆچوونە، لە فەرموودەیەکی پەیامبەردا (ص) دەفەرموێ : (یەکەم شت کە خودا ئافراندی زانست یا ئەقڵ بوو)[٣٦].

---

(*) هەڵبەت نوسەر و وەرگێڕانە ئینگلیزیەکەش بەدرێژایی کتێبەکە لە بری وشەی (کەلامناس) دەستەواژەی (دیالێکتیك)یان بەکارهێناوە، بەڵام دەقە عەرەبییەکە هەر (کەلامناس)ی بەکارهێناوە. (و.ك)

(٣٦) ئەو فەرموودەیە بە کۆی دەنگ (صحیح) نییە. (و.ع).

### ٣- موعتەزیلە و تایبەتمەندییەکانی:

لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا[٣٧] بیروڕاکان زۆر و هەمەجۆربوون، لەسەردەمی یەکەمی عەبباسییەکانیشدا ژمارەیان پتربوو، هەرچەند ئەو بیروڕایانە پڕ لق و پۆپ دەبوو، درزی ناکۆکی نێوان لایەنگرانی و ئەهلی فەرمووده پتر دەبوو، ئیدی دژواربوو ئەهلی فەرمودە بتوانن تیان بگەن.

بەڵام وردە وردە مەزهەبە کەلامیە توندوتۆڵەکان کەوتنە سەرپێ، بەربڵاوترین مەزهەبیش —بەتایبەت لە نێو شیعەکاندا- مەزهەبی موعتەزیلە بوو، کە میراتگری قەدەرباوەڕەکان بوون و مەزهەبەکەشیان لەسەر سیستەمێکی ئەقڵانی دامەزراند. ئەو مەزهەبە هەر لە رۆژگاری مەئمونەوە تا سەردەمی متەوەکل پشتگیری عەبباسییەکانیان بەدەستهێنا، تا بوو بە بیروباوەڕی دەوڵەت، موعتەزیلەکان کە لەسەرەتادا لەلایەن دەسەڵاتەوە رووبەرووی سەرکوت و چەوساندنەوە دەبوونەوە، ئیدی وایان لێهاتبوو بیروباوەڕ و دڵسۆزی خەڵکیان هەڵدەسەنگاند و شمشێریان خستە جێگەی دیالۆگ.

هەر لەوکاتیدا نەیارانیان لە ئەهلی فەرموودە خەریکی بونیادنانی سیستەمێکی (دۆگمایی) بوون، ئەو سیستەمە بیروباوەڕیەش[٣٨] بەگشتی بیروباوەڕێك بوو لە نێوان بیروباوەڕی سادەی خەڵکی عەوام و ئەو بیروباوەڕەی کە لەلایەن کەلامناسانەوە زانست و مەعریفە بوو، ئەو بیروباوەڕەش پێچەوانەی مەزهەبی موعتەزیلە بوو، موعتەزیلە مەیلی بەلای لێکچوواندنی هەموو ئەو شتانە بوو کە پەیوەستبوو بە خوداوە، هەروەها روانگەیەکی

---

(٣٧) لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا ئەو شیعە و خواریج و المرجئە و قەدەرباوەڕییانە دەرکەوتن کە بڕوایان بە سەرپشکی (الحریه الاختیار) هەبوو، لە کۆتایی رۆژگاری ئەمەوییەکاندا واصل بن **عطاء** (ساڵی ١٣١ کۆچی مردووە) موعتەزیلەی دامەزراند. (و.ع).

(٣٨) یەکەم کەس کە مەزهەبێکی پشت ئەستور بە دەقی وەحی و فەرمودەکانی پێغەمبەر دامەزراندبێ و دژایەتی موعتەزیلەکانی کردبێ، عبداللە بن سعید کلاب، هەڵبەت بەر لە لەدایکبوونی أبی الحسن الاشعری کە بە گەورەترین شوێنکەوتەی مەزهەبی لایەنگرانی فەرموودە دادەنرێ. (و.ع).

ماتریالیانەی بۆ مرۆڤناسی و گەردووناسی هەبوو، بۆ نموونە لایەنگرانی ئەم مەزهەبە دەروونییان بە جەستە لەقەڵەم دەدا، هەروەها زاتی خوداییان وەکو مرۆڤ وێنا دەکرد. گەرچی پەروەردە و هونەرە ئیسلامیەکان دژی ڕای کریستیانەکان بوون کە بەلێکچواندن دەیانگوت خودا – باوك، هەندێ لە موسڵمانەکان بیروباوەڕی زۆر لێڵ و تەمومژاویان لەمەڕ فۆرمی خودا هەبوو کە ئەقڵ قبوڵی نەدەکرد. تەنانەت هەندێك واوەتر لەوان دەچوون پێیان وابوو خودا هەموو ئەندامەکانی جەستەی هەیە جگە لە ریش و سمێڵ نەبێت، واتە هەموو ئەو شتانەی کە پیاوێکی رۆژهەڵاتی هەیبوو.

ئەستەمە بتوانین بە دووردرێژی باس لە هەموو ئەو تیپە کەلامیانە بکەین کە لە سەرەتادا وەکو پارتێکی سیاسی دەردەکەوتن، لەرووی مێژووی فەلسەفەوە ئەوەندە بەسە باس لە مەزهەبە موعتەزیلە گەورەکان بکەین، ئەوەش بە گوێرەی گرنگپێدانی توێژەران و خوێنەران.

### ٤- کاری مرۆیی و کاری یەزدانی:

یەکەم بابەت کە کەلامناسان لێیان کۆڵیەوە پەیوەستبوو بە کاری مرۆڤ و ئەو چارەنووسەی بۆی دیاریکراوە، قەدەرباوەڕی پێشینانی موعتەزیلە پێیان وابوو مرۆڤ سەرپشکە ( the freedom of the will)، بەڵام دواتر بەهۆی ئەوەی تیشکیان خستە سەر ئەو کایانەی کە تیایاندا فەلسەفە و کەلام تێکەڵبوون پێیان دەوترا (ئەهلی دادپەروەری) کە دەیانگوت خودا سەرچاوەی خراپە نییە و چاودێری مرۆڤ دەکات و لەسەر کارەکانی سزای دەدات، دوای پێیان وترا (ئەهلی یەکتاپەرستی)، واتە نکۆڵیان لەوە دەکرد خودا خەسڵەتی زیاتر بەسەر خودی خۆیدا بدا.

دیارە لە پتەوکردنی بیروباوەڕەکانیان بە شێوەیەکی رێکوپێك کاریگەربوون بە تیۆرەی ئەهلی لۆژیك و میتافیزیکناسان، لە نیوەی یەکەمی سەدەی دەیەم (چوارەمی کۆچی) موعتەزیلە مەزهەبەکەیان وەکو مەزهەبێکی یەکخودایی (unity of god) دەرخست، دادگەری یەزدانییشیان کە لە هەموو کردەوەیەکی خودادا دەردەکەوێ، خستە پلەی دووەمەوە.

موعتەزیلەکان دانیان بە سەرپشکی مرۆڤدا نا، تا بیسەلمێنن مرۆڤ بەرپرسیارە لە کاروکردەکانی خۆی و لەو رووەوە لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێ، هەروەها بۆ ئەوەی دادپەروەری خوداش بسەلمێنن، کەخودا راستەوخۆ مرۆڤ سزا نادات، وتیان مرۆڤ خۆی بەرپرسی کارەکانی خۆیەتی و بەڵام تەنها داهێنەری کاروکردەوەکانیەتی.

کەمێك لە موعتەزیلەکان بە گومان بوون لە توانای کردنی کار بەگشتی و توانای کاری چاکە و خراپە بەتایبەت، بەڵکو دەیانگوت ئەو دووکردەوەیە لەخوداوە دێن بۆ مرۆڤ، لەوەوەش توێژینەوەی ورد سەریهەڵدا، هاوشان بە رەخنەگرتن لە بیرۆکەی زەمەن لەلای فەیلەسوفان، ئەو توێژینەوانە پەیوەستبوون بەو توانایەی کە خودا لە مرۆڤ خوڵقاندوونی، ئایا کاروکردەوە پێش مرۆڤ بوونی هەبووە یا لەگەڵ مرۆڤدا دروست دەبێ؟ ئەگەر پێش مرۆڤ هەبووبێ، ئەوە یا تا کاتی کردەوەکە دەمێنێتەوە، کە ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە دروست ببێ، یا ئەوەتا بەر لە کردەوەکە دەڕوا، کە دەکرێ کردەوەکە لە مرۆڤ دووربخرێتەوە.

بیرکردنەوەی ئەقلانیانە لە کاروکردەوەی مرۆڤەوە گواسترایەوە بۆ کاروکردەوەکانی سروشت، ئەگەر لە ***قۆناغی یەکەمدا*** بابەتی لێکۆڵینەوە ئەمەبووبێ: ئایا خودا یا مرۆڤ بکەرە؟ ئەوە لە ***قۆناغی دووەمدا***، ئەمەبوو: ئایا بکەر خودایە یا سروشت؟ هێزی چالاك و داهێنەر لە سروشتدا بە ئامراز و هۆکارێکی لاوەکی دادەنرا، هەندێکیش هەوڵیان دەدا بە توێژینەوە تاوتوێی بکەن، وای بۆ دەچوون کە سروشت خۆی وەکو هەموو شتێك لە بووندا، داهێنراو و ئافرێنراوی دەستی خودا و ژێری خودایە. هەروەها هێزی رەهای خودا، سروشتی لە کارکردەوەی خراپ و زیانبەخش پاراستووە، هەرخوداش باشترین شت دەنێرێ.

ئەوان بوونی خراپەیان لەسەر زەوی وەکو ئەنجامێکی دانایی خودایی لە قەڵەم دەدا، چونکە خودا تەنها بە مەبەستی چاککردن خراپە دەخاتە نێو شتێکەوە، گەرنا خراپە کارو مەبەستی خودا نییە.

هەندێ لە نەوەکانی سەرەتای موعتەزیلە پێیان وابوو خودا توانای ئەنجامدانی جەور و ستەمی هەیە، بەڵام نایکات[٣٩]، بەڵام نەوەی دواتری موعتەزیلەکان دەیانگوت خودا توانای کردنی کارێکی نییە دژی کەماڵی خۆی بێت[٤٠].

بەڵام نەیارانی موعتەزیلە دەیانگوت: خودا بەهێزە رەهاکەی و خواستی بێ سنوری خۆی هەموو کاروکردەوە و رووداوێکی ئافراندووە، بۆچوونی موعتەزیلەکانیشیان رەتدەکردەوە و بە مەجوسە دوالیزمیەکانیان دەچواندن[٤١].

---

(٣٩) خاوەنی ئەم قسەیە ابو **الهذیل العلافة**، لە روانگەی ئەمەوە خودا توانای کاری خراپە و ناشرینیشی هەیە، بەڵام لەبەر دانایی و حیکمەتی خۆی و ناشرینیی کارەکان نایانکات. (و.ع).

(٤٠) خاوەنی ئەم قسەیە أبراهیم النڤامە، بەلای ئەمەوە خودا توانای کاری خراپەی نییە. (و.ع).

مەزهەبی نەیارانی موعتەزیلە، یەکتاپەرستیەك بوو دوور لە پشێوی و پێکدژی، ئەوان نەمرۆڤ و نەسروشتیان بە داهێنەری کاروکردەوەکانی خۆیان نەدەزانی، لەپاڵ توانای خودادا توانایان بە مرۆڤ و سروشت دەبەخشی.

## ٥- زاتی ئیلاهی:

لەوەی پێشتر خستمانەڕوو دەردەکەوێ بیروباوەڕی موعتەزیلە لەمەڕ زاتی ئیلاهی جیاوازە لە بیروباوەڕی عەوام و ئەهلی فەرموودە، بەخستنەڕووی بیرکردنەوەی ئەقڵانییانە لەلایەن موعتەزیلەکانەوە ئەو جیاوازییە لەبابەتی خەسڵەتەکانی خوداش دەرکەوت.

لەسەرەتادا ئیسلام زۆر شێلگیرانە جەختی لەسەر زەروورەتی یەکتایی خودا دەکرد، گەرچی ئەو جەختکردنەوەیە نەبووە ڕێگر لەوە هەندێ کەس، چەند ناوێکی مرۆڤ سەرباری سەر ناوە جوانەکانی خودا بکەن و بە زۆر سیفەتی دیکە وەسفی بکەن[٤٢]. هەندێ لەو ناوانە لە ژێر کاریگەری بیروباوەڕی مەسیحاییەوە دروستبوون وەك: زانست، توانا، ژیان، ئیرادە، کەلام، بیستن و بینین، لەو سیفەتانەش هەردوو سیفەتەکەی دوایی، بیستن و بینین، لەسەرەتادا وەپاڵدانی سیفەتی هەستیانە بەخودا ڕەتکرایەوە.

دەرکەوت بڕیاردان لەسەر فرە خەسڵەتی کۆن پێچەوانەی یەکتایی ڕەهای خودایە، کەلامناسانیش لە سێینەی مەسیحیەکان دڵکرمێ بوون، چونکە لەسەرەتادا ئەو سێینە مەسیحانەییە ئاماژەیەك بوو بۆ سێ کەس لە یەك بوونی خوداییدا، بۆ ئەوەی موعتەزیلە لەو تەنگژەیە قوتاریان ببێت بڕێجار هەوڵیان دەدا وا لە هەندێ خەسڵەت بکەن مانای لق و پۆپی خەسڵەتەکانی تر بدات و دەیانکردن بە یەك سیفەت وەك زانایی و توانایی، جاری وایش هەبوو

---

(٤١) ئەوەی موعتەزیلەکان دەیانگوت مرۆڤ لە کار و کردەوەکانیدا سەربەخۆیە و پەیوەستی خودا نییە، بووە هۆی ئەوەی دان بە دوو بکەردا بنێن، یەکێکیان کاری چاکە دەکات کە خودایە، ئەوی دیکەیان کاری خراپە دەکات کە مرۆڤە. دەڵێن قەدەرباوەڕەکان (ئەوانەی بڕوایان بە توانای مرۆڤ لە کردن و دروستکردنی کاروکردەوەکانی خۆیدا هەبوو) بە مەجوسی ئوممەتی ئیسلامی دادەنرێن. (و.ع).

(٤٢) لە خودی قورئانیشدا خودا بە سیفەت و خەسڵەتی کەماڵ وەسفکراوە و هەندێجاریش بەشێوەیەکی مەجازیانە بە سیفەتی مرۆییانە وەسف کراوە. (و.ع).

کۆی خەسڵەتەکانیان بە روخسار و هەلومەرجی زاتی خودایی لەقەڵەم دەدا، ئیدی خەریکبوو وای لیٚ بیٚت خەسڵەتەکان مانای خۆیان لەدەست بدەن.

هەندیٚ جار هەوڵی مانەوەی مانای چەند سیفەتیٚکیان دەدا، ئەوەش لە ریٚگەی گوزارشتی ساختە، بەڵام دەبینین فەیلەسوف ئەو سیفەتانە رەتدەکاتەوە و دەڵیٚ: خودا زانایە بەخودی خۆی، هەر بۆیە دەبینین کەلامناسانی موعتەزیلە دەڵیٚن: خودا زانایە بەزانست و زانستەکەشی خۆیەتی.

ئەهلی سوننەت پیٚیان وابوو ئەو بۆچوونە لەبارەی زاتی خودایی مانای خوداییبونی بەتاڵ دەکاتەوە، موعتەزیلە لە سیفاتە نیٚگەتیڤەکان لەمەڕ خودا واوەتر ناڕۆن، وەکو دەڵیٚن هیچ شتیٚك نییە لە ویٚنەی خودا، خودا لە دەرەوەی شویٚن و کات و جوڵە و ئەو جۆرە شتانەیە، بەڵام بەهیچ جۆریٚ دەستبەرداری ئەو بۆچوونە نەبوون کە خودا ئافریٚنەری گەردوونە، هەروەها پیٚیان وابوو ئیٚمە دەتوانین لە ریٚگەی دروستکراوەکانیەوە خودا بناسین، با لەبارەی خۆیشیەوە کەم بزانین.

بەڵام موعتەزیلە و نەیارەکانی پیٚکڕا بڕوایان بەوە هەبوو، ئافراندن کاریٚکە لە کارەکانی خودا کە جگە لە خۆی کەس تیایدا هاوبەش نییە، هەروەها جیهان لەکاتدا دروست بووە (یا بوونی جیهان لە کاتدایە)، هەروەها زۆر خویٚنگەرمبوون لەسەر دژایەتیکردنی بۆچوونی نەمری و کۆنی جیهان، ئەو بۆچوونە لەسەرجەم وڵاتانی رۆژهەڵات زۆر بەربڵاوبوو کە بە فەلسەفەکەی ئەرەستۆ پشت ئەستوربوو.

### ٦- وەحی و ئەقڵ:

لەوەی پیٚشکەشمان کرد بینیمان کەلامناسان، کەلام یا قسە بە سیفەتیٚك لە سیفەتە کۆنەکانی خودا لە قەڵەم دەدەن، رەنگە بڕوابوون بە نەمری قورئان کە بۆ پەیامبەر هاتووە هاوشیٚوەی مەزهەبی مەسیحاییەکان بیٚت لەمەڕ لۆگۆس، موعتەزیلەکان پیٚیان وابوو بڕوابوون بە کۆنی قورئان لە پاڵ کۆنی خودا هاوبەش پەیداکردنە بۆ خودا و کفرە، هەندیٚ لە خەلیفەکان لە دژی قسەی موعتەزیلەکان قورئانیان کرد بە مەزهەبی وڵاتەکەیان، هەرکەسیٚکیش سەرپیٚچی کردبا لەبەرچاوی خەڵکی سزا دەدرا، گەرچی موعتەزیلە بە جەختکردنەوە لەسەر ئەو بۆچوونە دەیانویست لە نەیارەکانیان پتر لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا بگونجیٚن، بەڵام رۆژگار پشتگیری نەیارەکانیانی کرد، هەروەها خوداپەرستی ئەهلی تەقوا زۆر بەهیٚزتربوو لەوەی دەرئەنجامە ئەقڵیەکان پیٚی دەگەیشتن، زۆریٚك لە موعتەزیلەکان بەوە تۆمەتبار دەکران

لە روانگەی برائایینییەکانیانەوە، مافی خۆییان بە قورئان نەداوە، کە قسەی خودایە، چونکە موعتەزیلەکان ئەگەر قورئان لەگەڵ مەزهەبەکەیان وێك نەیاتەوە ئەوە بە شێوەیەکی جیاواز لە ماناکەی خۆی راڤەی دەکەن. راستیەکەی موعتەزیلەکان پتر لەدەقەکانی قورئان شارەزایی ئەقڵ بوون، موعتەزیلەکان نەك تەنها سێ ئایینە ئاسمانیەکەیان بە یەکتر بەراورد دەکرد، بەڵکو لەگەڵ ئامۆژگارییە ئایینیەکانی فارس و هیند و لەگەڵ بیروباوەڕە فەلسەفییەکانیش بەراوردیان دەکردن. لە رێگەی ئەوەوەش گەیشتنە یاسایەکی خۆرسکی یا ئایینێکی سروشتی کە هەموو بیروباوەڕە ناکۆکەکانی کۆدەکردەوە. ئەو ئایینە یا شەریعەتەش لەسەر ئەو بۆچوونە بونیادنرابوو کە لەمرۆڤدا زانستێکی خۆرسك هەیە کە بە زەروورەت مرۆڤ بەرەو ناسینی خودای تاقانە و داهێنەر و دانا دەبات، کە ئەقڵێکی بە مرۆڤ داوە بەهۆیەوە فێری شت ببێ و چاکە لە خراپە جیابکاتەوە، لەبەرامبەر ئەم ئایینە سروشتییە یا ئەقڵانیە، مەعریفەیەك هەیە کە وەحی دایبەزاندووە، دەستکەوتێکە لە سەرچاوەیەکی دەرەوەی خۆرسکی مرۆڤ[٤٣].

هەر لەسەر ئەم بۆچوونەی دوایی هەندێ لە موعتەزیلەکان تا ئەوپەڕی ئاکامە لۆژیکیەکانی لەگەڵی بوون، بەو کارەشیان خۆیان خستە دەرەوەی ئوممەتی ئیسلامی و مەزهەبەشیان وەهای دوورخستنەوە تاوای لێهات ئەمان لە دۆڵێك و ئایینی خەڵکیش لە دۆڵێکی دیکە.

لەسەرەتادا رای زۆرینەیان بەدەست هێنا، گەرەکیشیان بوو بیروڕاکانیان بکەن بە بیروڕایەکی کۆدەنگی، گەرچی دەسەڵاتی سیاسیش پشتگیری دەکردن، بەڵام ئەم شتە درێژەی نەکێشا و بە ئەزموون پەند و وانەیەك فێربوون کە زۆری تر دوای ئەوان ئەو پەند و وانەیە فێربوون، واتە بۆیان دەرکەوت کۆمەڵی مرۆیی ئامادەیی قبوڵکردنی ئایینێکی هەیە کە لەلایەن خودای مەزنەوە سەپێنرابێ، نەك قبوڵکردنی مەزهەبێك کە لەسەر ئەقڵ بونیاد نرابێ.

---

(٤٣) موعتەزیلەکان کۆکن لەسەر ئەوەی لە روانگەی ئەقڵەوە هەموو زانینێك ماقوڵ و پێویستە، تێڕوانینی ئەقڵیانە هانی ناسینی خودا و سوپاسگوزاری خودا و ناسینی شتە ناشرین و جوانەکان و خۆ لادان لە کارە دزێوەکان و شوێنکەوتی کارە چاکەکان، هەموو ئەمانە پێویستن لەسەر مرۆڤی بیرمەند و کەمتەرخەمیش لەو کارانە پێویستی بە سزایە. (و.ع).

**٧- ئەبو هەزیل:**

دوای ئەو پەلەکردنە، باشتر وایە بەوردی باسی هەندێ لە پێشەوایانی موعتەزیلە بکەین، تا ئەو وێنە گشتیەی بۆ مەزهەبەکەیان کێشاومانە لە تایبەتمەندی تاکەکەسی خاڵی نەبێت.

لەسەرەتاشدا باسی ئەبو هەزیلی عەلاف[٤٤] دەکەین کە نزیکەی لەنیوەی سەدەی نۆیەمی زایینی کۆچی دواییکردووە. ئەبو هەزیل[٤٥] کەلامناسێکی نێوداربووە، یەکەمینی ئەو بیرمەندانەش بووە کە بواری بۆ فەلسەفە رەخساندووە تا کاریگەر بێت بەسەر مەزهەبە کەلامیەکەیانەوە.

ئەبو هەزیل پێی وایە ئەقڵ بە هیچ شێوەیەك وێنا ناکرێ، هەر خەسڵەتێکیشی وەپاڵ بدرێ زیادەیە، چونکە ئەو خەسڵەتە یا خودی خۆیەتی یا شتێکی ترە.

بەڵام هەر سۆراخی رێگەیەکی دەکرد بۆ هەماهەنگی نێوان هەردوولا، ئەبو هەزیل دەڵێ: "خودا، زانایە، دانایە، ژیانبەخشە، زانایە بە زانست و زانستەکەیشی خۆیەتی، زیندووە بە ژیان و ژیانەکەشی خۆیەتی، توانایە بە سەر تواناییدا، تواناییەکەشی خۆیەتی". ئەبو هەزیل ئەو سێ سیفەتە بە روخساری زاتی ئیلاهی دەزانێت، هەر وەك ئەوەی مەسیحیەکانی پێش ئەو کردیان، ئەبو هەزیل هاوڕای ئەوانەبوو کە دەیانگوت بینین و بیستن و خەسڵەتەکانی تر خەسڵەتگەلی ئەزەلی خودان. وەکو چۆن ئاسان بوو بۆ ئەو کەسانەی کاریگەربوون بە فەلسەفەی ئەو چەرخە، بۆ ئەویش ئاسان بوو بە شێوەیەکی دەرە هەستەکی راڤەی ئەو دوو سیفەتە بکات، هەروەك بینینی خودایان لە رۆژی دواییدا[٤٦] راڤە دەکرد، چونکە بە گشتی

---

(٤٤) واصل بن **عطاء الغزال** ساڵی ١٣١ ی کۆچیی مردووە و دامەزرێنەری گرووپی موعتەزیلەیە، لە پاڵ قورئان و سەننەت و کۆدەنگی ئەقڵی بەسەرچاوەی مەعریفەی ئایینی زانیوە. (و.ع).

(٤٥) أبو الهزيل محمد بن الهزيل المعروف بالعلاف، نزيك بە سەدەيەك ژياوە، لەسەردەمی خەلافەتی متەوەکیکدا لە ساڵی ٢٣٥ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

(٤٦) سۆفیگەری هەستی شەشەمیشیان هەبوو بۆ بینینی خودا (نوسەر).

بینین و بیستنیان به کاری روح لەقەڵەم دەدا، ئەبو هەزیل پێی وایە جوڵە دەبینرێ، بەڵام دەستی لێنادرێ، چونکە جەستە نییە.

ئەبو هەزیل ویستی خودایی بە نەمر دانانێ، بەڵکو بڕوای بە وشەی دروستبوونی ڕەها هەیە (فەرمانکردن بە هەموو شتێك: ببە)، کە لە ڕووداوێکدا یا لە وەدیهاتنێکدا گوزارشت لە ویسی ئیلاهی دەکات، هەروەها ئیرادە (کەسی خواستکار و شتی خوازراو) دەگۆڕێ، کەوایە وشەی دروستبوون لە شوێنێکدایە لە نێوان ئافرێنەری ئەزەلی و جیهانی داهێنراوی وەدیهاتوو، ئەو وشانە گوزارشت لە ویستی یەزدانی دەکەن وەکو جەوهەرێکی نێوەند، کە لە ئایدیاکەی ئەفلاتون یا روحی هەسارەکانی دەچێت، بەڵام پتر لە هێزێکی ناجەستەیی دەچێت نەك کەسانی روحانی.

ئەبو هەزیل جیاوازی دەکات لەنێوان مەسەلەی دروستبوون کە لە ناشوێن وەدی دێ، لەگەڵ مەسەلەی ڕاسپاردن کە لە شێوەی ئەمر و نەهی بە مرۆڤ دەدرێت و لە شوێندا ڕوودەدات، گرنگیشی تەنها لەم جیهانە کاروانسەرائاسایەدا هەیە، ملکەچی و یاخیبوون لە ئەمر و نەهیەکانیش  هەر لەم ژیانەدا هەیە، ئەمر و نەهی کە هەڵگری ڕاسپاردنن سەرپشکی مرۆڤ و توانای مرۆڤ لە کردنی ئەوەی پێیخۆشە دەسەپێنن، بەڵام ڕۆژی دوایی ژیانی ڕاسپاردنی شەرعی نییە، سەرپشکبوونی تێدایە، لەوێدا هەموو شتێك دەگەڕێتەوە بۆ ویستی خودا بە تەنها، لەو ژیانی دواییەدا جوڵە نییە، چونکە جوڵە کە سەرەتای هەیە، هەر دەبێ کۆتایشی هەبێ، بەڵکو خامۆشی هەمیشەیی تێدایە، بۆیە پێمان وا نییە ئەبو هەزیل بڕوای بە زیندوبوونەوەی جەستەیی هەبووبێ.

ئەبو هەزیل جیاوازی لە نێوان کردارە ئاکارییە سەرپشکیەکانی مرۆڤ و کردارە سروشتییەکان دەکرد، مەبەستم کردارەکانی دڵ و کرداری ئەندامەکان، هەر کارێك ئەگەر بە ناچاری بیکەین، ئەوە لە ڕووی ئاکارییەوە کارێکی سەرپشکانە دەبێ، دەستکەوتی مرۆڤ خۆیەتی، بە توانای خۆی بەدەستی دەهێنێ، بەڵام مەعریفە لە خوداوە دێت، هەندێکی بە وەحی و ئەوانی تر لە ڕێگەی خۆرسکەوە.

مرۆڤ ملکەچی ئەقڵ و سروشتە، هەروەها ملکەچە بەر لە هاتنی  وەحی، خودا بناسێ و چاکە لە خراپە جیا بکاتەوە، هەروەها چاکە پەسەند بکات وەك ڕاستگۆیی و دادپەروەریی، و بەرەنگاری خراپە ببێتەوە وەك درۆ و ستەم، ئەوەش مانای ئەوەیە بەڕای ئەبو هەزیل مرۆڤ توانادار و سەرپشکە.

**٨- نیزام:**

ئەبو هەزیل هاوسەردەمێکی بەتەمەن بچوکتری هەبوو، نازناوی نیزام(٤٧) بوو کە ساڵی ٨٤٥ز مردووە، وەکو دەردەکەوێ نیزام قوتابی ئەبو هەزیل بووە، ئەم پیاوە شیاوی باسکردنە، **جاحظ** کە یەکێك بووە لە قوتابییەکانی وەکو پیاوێکی زانا، وردبین، بێوەی، لەرێ لانەدان، زمانپاك، پێشبینیکەرێکی باش، نهێنی پارێز، ئازا و خۆشەویست وەسفی دەکات. هەروەها **جاحظ** دەڵێ نیزام لەسەر ئەو بنەمایە دەمایەوە کە شتی پێ دەپێوا، دیارە بە پشت بەستن بە بۆچوون پێشبینی دەکرد. خەڵکی سەردەمەکەی خۆی بە شێت و گومڕایان لەقەڵەم دەدا. زۆرێك لە قسەکانی هەروەکو خەڵکانی دیکەی رۆژهەڵات لە فەلسەفەی ئەنبادۆکلیس و فیساگۆرسەوە وەرگیرابوون. (تەماشای ئەبو هەزیلیش بکە).

نیزام پێێ وابو خودا توانای کاری خراپەی نییە، هەروەها تەنها توانای ئەنجامدانی کارێکی هەیە کە بزانێ بۆ بەندەکانی باش و سودبەخشە، هەروەها خودا توانای ئافراندنی پتر لەوەی کردوویەتی نییە، گەرنا کێ دەتوانێ رێگەی ئەوەی لێ بگرێ لەوەی سەرجەم جوانی و باشیەکانی خۆی دەربخا.

بەڕای ئەو ئیرادە وەکو سیفەتێك وەپاڵ خودا نادرێ، چونکە ئیرادە واتە ئیرادەکار پێویستی بە شتێکە.

بەڵکو ئەگەر خودا وەکو خوازیاری کارەکانی وەسف بکەین ئەوە مانای وایە دروستکەر و ئافرێنەری ئەو کارانەیە، بەڵام ئەگەر وەکو خوازیاری کاروکردەوەی بەندەکانی یا رووداوی شتێك وەسفی بکەین، ئەوە مانای وایە فەرماندار و راگەیەنەری ئەو شتەیە.

هەروەها نیزام دەڵێ: ئافراندن یەك کارە، خودا سەرتاپای دونیای ئافراندووە، مەبەستم ئەوەیە هەموو بوونەوەران بە یەك جار ئافرێنراون، بەڵام هەندێکیان لە هەندێکیاندا حەشاردراون و بەتێپەڕبوونی کات جۆری کانزا و رووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ لە حەشارگەکانی خۆیان دەردەچن.

نیزام هاوڕای ئەو فەیلەسوفانەیە کە تیۆرەی ئەتۆم رەتدەکەنەوە، بەڵام دوای ئەوە ناتوانێ بڕینی رووبەرێکی سنوردار پاساو بدا، مەگەر بە قەڵەمباز نەبێت، ئەوەش بەدابەشکردنی شوێن بۆ بێ سنور، نیزام دەڵێ: تەنەکان لە ڕواڵەت پێکهاتوون نەك گەردیلە (ئەتۆم).

---

(٤٧) أبو أسحاق أبراهيم بن سيار بن هانيو البلخي المشهور **بالنظام**، ساڵی ٢٢١ یا ٢٣١ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

هەروەك ئەبو هەزیل نەیتوانی وێنای ئەگەری بوونی خەسڵەتێكی سەر خود بكات، نیزامیش نەیتوانی وێنای ڕواڵەت بكات تەنها وەكو جەوهەر خۆی یابەشێك لە جەوهەر نەبێت. نیزام پێی وابوو بۆ نموونە: ئاگر و گەرمی لە حاڵەتی بووندا لەناو تەختەدا هەن، بەلێكخشاندنیش دەردەكەون، ئەوەش دوای ئەوەی دژەكەیان نامێنێ كە ساردیە، ئا لێرەدا جوڵە یا ئاڵۆزی ڕەوشی پارچەكان سەبارەت بە یەكتر ڕوودەدات، بەڵام گۆڕان لە چۆنیەتی ڕوونادات، هەروەها نیزام پێیوایە چۆنیەتیە بەرهەستەكانی وەك ڕەنگ و تام و بۆن، تەن یا جەستەن.

بگرە نیزام پێی وایە روحی مرۆڤ تەنێكی ناسكە، روح باشترین شتە لە مرۆڤدا، روح جەستە بە ئەندازەكانیەوە گرێ دەدات، ئامێری جەستەیە، ڕاستیەكەی مرۆڤ هەر روحە، زانست و زانیاری تەنها جوڵەی دەروونن.

بەڵام مەسەلەی بیروباوەڕ و حوكمە شەرعییەكان، نیزام بیانووی كۆدەنگی و پێوەر ڕەتدەكاتەوە، بەڵكو وەكو شیعەكان پشت بە قسەی پێشەوای بێ بەری لە هەڵە (معصوم) دەبەستێ.

بەڕای نیزام دەشێ سەرپاكی موسڵمانان لەسەر گومڕاییەكدا هاوڕابن، هەروەك ئەوەی هاوڕان لەسەر ئەوەی تەنها پەیامبەر بۆ هەموو مرۆڤایەتی نێردراوە، چونكە خودا هەموو پەیامبەرانی بۆ هەموو مرۆڤایەتی ڕەوانە كردووە.

نیزام هاوڕای ئەبو هەزیلە لەمەڕ ئەوەی مرۆڤ خودا دەناسێ و بەهۆی ئەو ئەقڵەوە دەزانێ دەبێ چ بكات، نیزام ناڵێ قورئان بە هۆی هاوسەرواییەكەیەوە موعجیزەیە، بەڵكو پێی وایە پەرجوویی و نەمری قورئان لەوەدایە خودا ڕێی نەدا هاوچەرخەكانی پەیامبەر شتێكی وەكو قورئان دابهێنن.

نیزام لەمەڕ ڕۆژی دوایی هاوڕای موسڵمانان نەبوو لە زۆرێك لەو شتانەی دەیانگوت، بەڵكو نیزام دەیگوت سزای دۆزەخ بە سوتاندنی جەستە كۆتایی دێت.

**٩- جاحف:**

لەلایەن شوێنکەوتوانی نیزامەوە بیروڕای زۆرمان پێگەیشتووە کە کۆکراوەی مەزهەبە جیاوازەکانە، بەڵام ئەو بیروڕایانە هەرهەموویان خاڵی بوونە لە داهێنان.

**جاحظ** ساڵی (٨٧٩) ز کۆچی دواییکردووە[٤٨]، مەزنترین پیاوە کە قوتابخانەی نیزام بۆی بەرهەمهێناوین. **جاحظ** ئەدیبێکی لێهاتوو و فەیلەسوفێکی سروشتباوەڕ بووە، **جاحظ** داوای دەکرد لێکۆڵینەوەیەکی کەلامناسانە و سروشتناسانەی جیهانی راستەقینە بکرێ.

**جاحظ** هەموو شتێکی بە دەستکردی سروشت دەزانی، بەڵام ئاماژە بەوە دەدات لە هەموو ئەو ئافرێنراوانەدا جێ پەنجەی داهێنەری گەردوون دەبینرێ.

بەرای **جاحظ** مرۆڤ دەتوانێ بەهۆی ئەقڵیەوە خودا بناسێ و پەی بە زەروورەتی وەحی ببات کە بۆ پەیامبەران دابەزیوە، بەلای **جاحظ**ەوە بەهاو نرخی مرۆڤ لە ئیرادەدایە، لەلایەکەوە هەموو هەڵسوکەوتێکی مرۆڤ لە نێو تەونێکی رووداوەکانی سروشتدایە، لەلایەکی دیکەوە هەموو کاروکردەوەکانی ناچارەکین و لەسەرەوە بەسەردا دەسەپێنرێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئیرادە گرنگیەکی وەهای نییە، چونکە لقێکی زانینە، **جاحظ** ویستی خودا بە نێگەتیڤ وەسف دەکات، واتە ناکرێ خودا بەهەڵەدا بچێ و شتی لە یاد بچێ، ناشکرێ کاری ناحەز ئەنجام بدات.

لە هەموو ئەو قسانەدا تەنها کەمێك داهێنان هەیە، نموونە باڵای **جاحظ** لە ئەخلاقدا مامناوەندیبوونە، لە لێهاتوویشدا هەر مامناوەندی بووە، بەڵام نوسەرێکی پڕبەرهەم بووە، تەنها لە پڕ بەرهەمیدا مامناوەندبوونی تێپەڕاندووە.

(٤٨) أبن خلکان دەڵێ **جاحظ** ساڵی ٢٥٥ی کۆچیی لە تەمەنی نەوەد ساڵیدا لە بەسرە مردووە. (و.ع).

### ١٠ -موعەممەر و ئەبو هاشم:

موعتەزیلەکان سەرەتا لە ژێر کاریگەری ئەخلاق و فەلسەفەی سروشتیدا بوون، بەڵام موعتەزیلەکانی دواتر کەوتنە ژێر کاریگەری میتافیزیکای تێکەڵ بە لۆژیك، لەم رەوتەشیان بەتایبەت هەست بە کاریگەری مەزهەبی نوێ ئەفلاتونی دەکەین.

سەردەمی ژیانی موعەممەر بە وردی نازانرێ، دەتوانین بێژین نزیك بە ساڵانی (٩٠٠ز)[٤٩] ژیاوە، دەکرێ لە زۆر رووە باسی موعەممەر بکرێ، گەرچی لە رەتکردنەوەی خەسڵەتە یەزدانییەکان لە هەمووان توندتر بوو، چونکە بوونی ئەوخەسڵەتانە پێچەوانەی خودی تەنیایی رەهای خودایە، موعەممەر خودای لەسەرجەم ئەو فرە وێنەییانە داماڵی، هەروەها پێی وابوو خودا نەخۆی دەناسێ و نەهیچ شتێکی تر دەناسێ، چونکە ئەو شتە دەبێتە هۆی فرەیی زاتی خودا. بگرە موعەممەر نکۆڵی لەوە دەکرد خودا پێش زەمەنی بێت، بەڵام خودا داهێنەری گەردوونە، گەرچی تەنها تەن و جەستەکانی ئافراندووە، ئەو تەن و جەستانەش رووداني خۆیان وەدیهێناوە، چ بە پرۆسەیەکی سروشتی بێت یا سەرپشکانە، بەلای موعەممەرەوە رواڵەت (Accident) کۆتایی نییە، چونکە حەقیقەتی ئەو رواڵەتانە تەنها مەسەلەیەکی زەیینی نییە لە ئەقڵی مرۆڤەکاندا.

موعەممەر شوێنکەوتەی رێبازی چەمکباوەڕییە (Conceptualist) جوڵە و خامۆشی و هاوشێوەیی و نالێکچوویی و هەموو ئەو جۆرە شتانە لای موعەممەر شت نین، تەنها بوونێکی ئایدیالی و زەینیان هەیە.

---

(٤٩) لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی رەشیددا ژیاوە (**المنية و الامل لأبن المرتضى ص ٣١-٣٢**)، بێگومان ساڵی ٩٠٠ی ز (واتە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچیی) مێژوویەکی ورد نییە. (و.ع).

دەروون لەلای موعەممەر حەقیقەتی مرۆڤە، تەنها مانا جەوهەرێکی نا جەستەییە، بەڵام بەروونی جیاوازی لەنێوان دەروون و جەستە[٥٠]، دەروون و جەستە و زاتی ئیلاهی، نەکردووە، حەکایەتەکانی لەم بارەوە لێڵ و تەمومژاوین.

مرۆڤ لای موعەممەر ئیرادەکارێکی سەرپشکە، هەروەها ئیرادە تاکە کاری مرۆڤە، بەڵام کارە دەرەکییەکان کاری جەستەن[٥١]. (تەماشای بۆچوونەکانی جاحظ بکە).

موعتەزیلەی بەغدا — وەکو دەزانین موعەممەریش یەکێکە لەوان- شوێنکەوتەی ڕێبازی چەمکباوەڕی بوون، ئەوان دەیانگوت چەمکی گشتی تەنها لە زەیندا بوونی هەیە، جگە لە دوو مانای گشتگیر نەبێت کە ئەوانیش بوون (being) و دەبێ (becoming) (ڕوودان).

بەڵام ئەبوهاشم[٥٢] کە بەسراییە (ساڵی **٩٣٣**ز مردووە)، هەڵوێستی ئەم لەگەڵ ئەوانەدا نزیك بووە کە دەیانگوت (کولیات) بوونێکی دەرەکیانەی حەقیقیانەیان هەیە، ئەبو هاشم سیفەتەکانی خودا و ڕواڵەت و چەمکە گشتیەکان و هەموو ئەوانەی لە نێوان بوون و نەبووندا دادەنا، ناویشی لێنابوون هەلومەرجەکان (conditions).

بەڕای ئەبو هاشم گومان بۆ هەموو مەعریفەیەك پێویستە، هەروەها ریالیزمێکی ساویلکەش نەبوو، بەڵام بیرمەندانی موعتەزیلە لەمەڕ مەسەلەی نەبوون دەمەتەقێی کەلامیانەیان دەکرد، ئەوەش وای لێکردن (نەبوون) بە (بوون) یا (هەبوو) لە قەڵەم بدەن، چونکە نەبوونیش بابەتی بیرکردنەوەیە، کەوایە دەبێ هەروەکو (بوون) هەبێ ، لەوەی (نەبوون) کەمتر لە بوون دەسەلمێنرێ ئەوە پەیوەستە بە بیرکردنەوەوە، دواجار مرۆڤ بیر لە نەبوون دەکاتەوە، کە باشترە لەوەی هەر بیر نەکاتەوە.

---

(٥٠) موعەممەر دەڵێ: مرۆڤ ناوەڕۆك یا جەوهەرێکی بێ جەستەیە، واتە ماددی نییە، "پەیوەندی دەروون بە لەشەوە پەیوەندیەکی کاربەرێکردنە"، جەستە ئامێری دەروونە، دەیبزوێنێ و بەرێوەی دەبات. (مقالات الاسلامیین ص ٣٣١-٣٣٢). (و.ع).

(٥١) موعەممەریش هەر ڕێچکەی فەیلەسوفانی گرتووە لە جیاکردنەوەی دەروون و جەستە، موعەممەر جیاوازی لەنێوان کاری دەروون دەکات کە ئیرادەیە، و کاری جەستە کە بزاوت و خامۆشیە، دەکات. (و.ع).

(٥٢) أبو هاشم عبدالسلام بن ابی علی محمد الجبائی، ساڵی ٣٢١ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

**١١- ئەشعەری:**

لەسەدەی نۆیەمدا (سێیەمی کۆچی) چەند ڕێبازێکی کەلامی دەرکەوتن کە پێچەوانەی مەزهەبی موعتەزیلە بوون، وەك ڕێبازی کەڕامی کە تا دوای سەدەی دەیەم (چوارەمی کۆچی) مایەوە.

بەڵام لە نێو ریزی موعتەزیلەدا پیاوێك دەرکەوت کە پەیامەکەی لە نێو هەموو بیروڕا جیاوازەکان بوو و مەزهەبێك بونیادنا کە لە ڕۆژهەڵات و سەرجەم وڵاتانی ئیسلامی بە مەزهەبێکی ئەهلی سوننە ناسرا، ئەو پیاوەش ئەبو حەسەنی ئەشعەری بوو[٥٣].

ئەشعەری توانی خودا بکاتە ئەو شتەی کە شایانی بوونی خودایە، بەبێ ئەوەی لە مرۆڤبوونی مرۆڤ کەم بکاتەوە، هەروەها نکۆڵی لە هەموو ئەو لێکچواندنە لێڵ و تەمومژاوییانە کرد کە نەیارانی موعتەزیلە بۆی چووبوون.

ئەشعەری خودای لە هەموو ئەو شتانە داماڵی کە پەیوەست بوو بە جەستە و مرۆڤ، بەڵام دەیگوت خودا توانای هەموو شتێکی هەیە و ئافرێنەری هەموو شتێکیشە.

ئەشعەری ئەوەی ڕەتدەکردەوە هەموو کارێك هی سروشت بێت، بەرای ئەو مرۆڤ دەتوانێ ئەوکارانە بۆ خۆی سەربار بکات کە خودا بۆی خوڵقاندووە، مرۆڤ دەشتوانێ ئەو شتانە بە دەستکەوتی خۆی بزانێ.

ئەشعەری لە لێکۆڵینەوەکانیدا نە ستەمی لە مافی روح کردەوە و نە مافی جەستە، ئینجا بڕوای بە زیندبوونەوەی جەستە و بینینی خودا هەبوو.

بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە قورئان، ئەشعەری جیاوازی لە نێوان دوو شتدا دەکرد. کەلامی سەربەخۆیی خودا کە کۆن و ئەزەلییە و ئەو کتێبەی لە ژێر دەستی ئێمەدایە و لە کاتێك لە کاتەکاندا دابەزیوە.

---

(٥٣) أبو الحسن علی بن اسماعیل ...... بن أبی موسی الاشعری، ساڵی ٢٦٠ی کۆچیی لەدایکبووە و ساڵی ٣٢٤ی کۆچیی مردووە. یەکێك بووە لە موعتەزیلە و قوتابی جوبائی بووە، پاشان لە موعتەزیلەکان جیابۆتەوە. (و.ع).

ئەشعەری لە درێژەی مەزهەبەکەیدا لە هیچ روویەکەوە داهێنانی نەکردووە، تەنها ئەو بیروبۆچونانەی کۆکردۆتەوە کە پێیان گەیشتووە و پێکی گونجاندوون، لەم کارەشیدا لە پارادۆکس و ناکۆکی بێ بەری نەبووە.

بەڵام خاڵی جەوهەری لە لێکۆڵینەوەکانیدا لەمەڕ گەردوون و مرۆڤ و ژیانی دوایی لە دەقەکانی سوننە دوور نەکەوتۆتەوە، ئەوەش بۆ دڵچەسپینی بڕواداران، ڕێبازە کەلامیەکەشی جێگەی پەسەندی خەڵکی بوو، تەنانەت گەورە رۆشنبیرانیش پەسەندیان دەدا، ئەوەش چونکە ئەشعەری ئەوەی پەیوەستبوو بە جەستەییبونی زاتی خودا دایماڵی.

ئەشعەری پشتی بە وەحی نێو قورئان دەبەست، ئەو پێی وابوو هەر بیرکردنەوەیەکی ئەقلانی بێ وەحی قورئان نابێتە ڕێگەیەك بۆ زانینی کاروبارە ئیلاهیەکان، بەلای ئەوەوە پەیبردنی هەستەکان هەمیشە فریومان نادەن، بەڵام حوکمدانمان بەسەر ئەو شتانەی هەستەکان پەی پێ دەبەن دووچاری هەڵە دەبێت.

ئەشعەری دەیگوت ئەقڵ توانای پەیبردن بە خودای هەیە، بەڵام ئەقڵ ئامرازێکە تەنها بۆ (پەیبردن)، تاکە ڕێگەی (ناسین)ـی خودا، تەنها وەحیە.

لەلای ئەشعەری، خودا یەکەم داهێنەری هەموو شتەکانە، هەروەها بە هەموو شتێك زانایە، دەزانێ مرۆڤ چ دەکات، یا دەیەوێ چ بکات، دەزانێ چ ڕوودەدات، چۆن ڕوودەدات، یا گەر ئەو شتە ڕووبدات چی ڕوونادات. پاشان ئەشعەری پێی وابوو دەکرێ هەموو خەسڵەتەکانی کەماڵ بۆ خودا سەربار بکرێ، بەڵام بە مانایەکی جیاواز و باڵاتر لە مانای خەسڵەتی دروستکراو، تەنها خودا دروستکەری جیهانە، هەروەها پارێزەری بوونی جیهانە، هەموو ئەو شتانەی لە گەردووندا ڕوودەدەن بەبێ نێوەند، ڕاستەوخۆ لە خوداوە سەرچاوە دەگرن. هەروەها ئەشعەری وای بۆ دەچێ مرۆڤ لە خۆیدا دەزانێ جیاوازی هەیە لە نێوان کارە ناچارییەکانی وەك لەرزین و موچڕك و ئەو کارانەی بە ویست و ئارەزووی خۆی دەیانکات.

### ١٢- مەزهەبیی کەلامیی گەردیلە یا جەوهەری تاك:

دیارترین ئەو تیۆرەیەی کە کەلامناسانی ئیسلام دایانڕشتووە، مەزهەبیی گەردیلە یا جەوهەری تاك. بەڵام لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە تاکو ئێستا بە تەواوی لێڵ و تەمومژاوییە، بەر لە سەردەمیی ئەشعەری، لەلایەن کەلامناسی موعتەزیلە و بەتایبەتیش لەلایەن

نەیارەکانیان دانی پێداهێنراوە، لە میانی قسەکانمانەوە دەردەکەوێ تیۆرەی جەوهەری تاك لەلای شوێنکەوتوانی ئەشعەری ماوەتەوە، دەشێ ئەشعەرییەکان یەکەم کەس بووبن کە پەرەیان پێدابێ.

گومانی تێدا نییە سەرچاوەی کەلامناسانی ئیسلام لە مەزهەبی گەردیلەدا دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی سروشتی یۆنانییەکان، کە لەوان وەریانگرت جا پەرەیان پێدا، چونکە بۆ لێکۆڵینەوە کەلامییەکان و سەرکەوتنی ناکۆکیە مەزهەبییەکان زۆر پێویست بوو، هەمان شتیش لەلای بیرمەندانی جولەکە و بڕوادارانی توندڕەوی کاسۆلیکی تێبینی دەکەین.

ناکرێ بڕوا بەوە بکەین کە موسڵمانان بۆیە مەزهەبی گەردیلەیان وەرگرت، چونکە ئەرەستۆ نەیاری بووە، جێی خۆیشیەتی باسی تێکۆشانی نەپساوەی موسڵمانان بکەین لە پێناو داکۆکیکردن لە پارێزەرانی ئایین، لەو تێکۆشانەشدا لە هەڵبژاردنی چەکەکەی سەرپشك نەبوون، بەڵکو مەبەست و ئامانجێك لە پشت ئەو هەوڵ و تێکۆشانەیان بوو.

موسڵمانەکان وەکو دیاردەیەکی سروشتی و لەمیانی خۆیانەوە تەفسیری دیاردە سروشتیەکانیان نەدەکرد، بەڵکو وەکو چەند داهێنراوێکی خودا تەفسیریان دەرکرد، ئەوان جیهانیان بە سیستەمێکی یەزدانی نەمر لە قەڵەم نەدەدا، بەڵکو بە ئافرێنراوێکی وەدیهاتووی لە نێوچوویان دەزانی، خودا داهێنەر و سەرپشك و تواناداره بەسەر هەموو شتێکدا، بۆیە پێویستە بە (خودا) ناوبرێ نەك (هۆکارێکی سروشتی)، مەبەستم ئەوەیە لە هەموو ئەو خەسڵەتانە داماڵراوە کە وەکو زات نیشانی دەدات: وەك زانست و توانا و ئیرادە و ژیان و هتد)، وەکو ئەرەستۆ دەڵێ: (هیچ بزواتێك نییە بەبێ بزوێنەر)، لەم پێناوەشدا تیۆرەی ئافراندن (یا وەدیهاتنی جیهان کە پێشتر نەبووە) لەسەرەتاوە گەورەترین سیستەمی کەلامناسی ئیسلامی بووە، ئەوەش تا ببێتە هۆی ئەوەی موسڵمانان ئەو مەزهەبە فەلسەفییە بتپەرستییە رەتبکەنەوە کە بڕوای بەنەمری و پێشینەیی جیهان و کارە سروشتییەکان هەبووە.

لایەنگرانی مەزهەبی گەردیلە دەڵێن ئەو شتەی لە جیهانی هەستپێکراودا پەی پێ دەبەین رواڵەتە یا دروسبوونە، هەموو ساتێك دەردەکەوێ و وون دەبێ، شوێنی ئەو رواڵەتە ئاڵوگۆڕانە جەوهەرە جەستەییەکانە، ناشکرێ ئەو جەوهەرانە بە نەبزواو لەقەڵەم بدەین، چونکە لە ناوەوە و دەرەوەیدا شوێنی گۆڕانە، ئەگەر گۆڕاویش بێت ناکرێ بەنەمری لە قەڵەم بدەین، چونکە شتی نەمر و کۆن ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایە، ئەگەر هەموو شتێکیش لە جیهاندا گۆڕاو بێت، ئەوەر دروستکراوی خودان.

ئا ئەمە بنەمای بەڵگەهێنانەوەیان بوو: بونەوەرە گۆڕاوەکان بەگشتی بە بوونی داهێنەرێکی نەمری نەگۆڕاو دەسەلمێنن، بەڵام فەیلەسوفانی دواتری ئەو مەزهەبە لە ژێر کاریگەری فەیلەسوفانی ئیسلام بوونی خودایەکی بەزەروور هەبوو بە وەدیهێنەری ئەگەرەکان دەسەلمێنن.

با بگەڕێینەوە سەر مەسەلەی جیهان، جیهان لە رواڵەت پێکهاتووە، شوێنی ئەو رواڵەتانەش جەوهەرە، جەوهەر و رواڵەتیش یا چۆنییەتی دوو دەستەواژەن دەکرێ بەهۆیانەوە وێنای شتە بەدیهاتووەکانی دەرەوە بکەین. بەڵام دەستەواژەکانی دیکە یا لە ژێر دەستەواژەی چۆنیەتی سەرچاوە دەگرن یا دەگەڕێنرێنەوە بۆ شتە زەینییەکان کە لە واقیعی دەرەوە هاوشێوەیان نییە. هیولیش (مادده) کە (هێز) و (ئەگەرە) لە زەیندا بوونی نییە. زەمەنیش تەنها لێکدانی شتە جیاوازەکانە لە بووندا، یا لێکدانی وێنەی ئەو شتانەیە لە زەیندا، بەڵام شوێن و قەبارەش دەکرێ بۆ جەستە سەربار بخرێن، نەك جەوهەری تاك کە جەستەی لێ پێکهاتووە.

بەگشتی لە رێگەی رواڵەتەوە قسە لەسەر جەستە دەکەین، ژمارەی ئەو رواڵەتانەش لە هەموو جەوهەرێکدا زۆرە، بەڵکو هەندێ پێیان وایە ئەو رواڵەتانە سنوریان نییە، چونکە هەموو جەوهەرێك یەکێك لەو دوو خەسڵەتە پێکدژەی هەر تێدایە بە خەسڵەتە نێگەتیڤەکانیشەوە. رواڵەتی نێگەتیڤیش لە بووندا چانسی کەمتر نیە لە رواڵەتی پۆزەتیڤ، خودا نەبوون و لەنێوچوونی ئافراندووە، بە دڵنیایشەوە دۆزینەوەی جەوهەری ئەو دوو رواڵەتە ئاسان نییە.

لەگەڵ ئەوەی ناکرێ رواڵەت هەبێ، مەگەر بە پشت بەستن بە جەوهەرەکەی نەبێت، هیچ رواڵەتێکیش پشت بە رواڵەتێکی تر نابەستێ، لە واقیعی دەرەوەدا هیچ شتێکی گشتگیر و سەرتاپاگیرتر لە جەوهەر نییە، بەهیچ شێوەیەکیش کولیات لە شتە تاکیەکاندا نییە، بەڵکو تەنها چەمکن.

کەوایە لە نێوان جەوهەرەکاندا پەیوەندی نییە، بەڵکو لێکترجیاوازن، وەکو سەربەخۆیی جەوهەرە تاکەتاکە لێکچووەکان. ئەم شتەش لە بەشە لێکچووەکان (homoeomeries) ی فیساگۆرس نزیکترە لەوەی لە مەزهەبی گەردیلە نزیك بێت.

ئەو جەوهەرە تاكیانە بێ شوێن و جێگەن، بەڵام شوێن داگیر دەكەن، هەروەها بە دانان، شوێن پڕ دەكات. ئەو جەوهەرە تاكیانە چەند یەكەیەكن و درێژ نابنەوە، دەشكرێ وەكو خاڵ وێنایان بكەین، لەو یەكانەشەوە جیهانی جەستەكان دروست دەبن كە شوێنێك داگیر دەكەن.

هەڵبەت هەر دەبێ لە نێوان ئەو جەوهەرە تاكیانە بۆشایی هەبێت، گەرنا جوڵە بەهەموو چەشنەكانیەوە مەحاڵ دەبێت، چونكە جەوهەرە تاكیەكان تێكەڵ بە یەكتر نابن.

هۆكاری هەموو گۆڕانێك پەیوەندی و جیابوونەوە و جوڵە و خامۆشییە لە جەوهەرەكاندا، لەنێوان تاكە جەوهەرێك و تاكە جەوهەرێكی دیكەدا هیچ پەیوەندیەكی كار و كاردانەوە بوونی نییە، جەوهەرەكان هەن و شوێنەواری بوونیان هەیە، بەڵام پەیوەندی لە نێوانیاندا نییە، جیهانیش تۆپەڵە پارچەیەكی لێكجیاجیایە. كاری هیچ بەشێك لە بەشێكی دیكەدا نییە.

پێشنیان بەو شێوەیە زەمینەیان خۆشكرد بۆ تێگەیشتن لە تیۆرەكەیان، ئەوەش بەوەی ژمارە چەند یەكەیەكی سەربەخۆیە، ئایا نەیانزانیوە زەمەن ژمارەی جوڵەیە؟ ئەی بۆچی تیۆرەی ژمارەیان بەسەر شوێن و كات و جوڵەدا پراكتیزە نەكرد؟ كەلامناسان ئەو كارەیان كرد، دەشێ ئەوەش لە ژێر كاریگەری مەزهەبی گومانكارانی كۆن بووبێ، ئەوان زەمەن و شوێن و جوڵەیان دابەشكرد، هەروەكو چۆن جیهانی جەستەیان دابەشكردە سەر چەند بەشێكی سنوردار و چەند ساتێكی بێ مەودا و سنوردار، ئیدی زەمەن بوو بە كۆمەڵێك ساتی سەربەخۆ دوابەدوای یەكداهاتوو، لە نێوان هەر دوو لەو ساتانەدا بۆشاییەك هەیە، هەروەك چۆن لە نێوان دوو جوڵە خامۆشیەك هەیە، جوڵەی خێراش لە رووی خێراییەوە لە جوڵەی هێواش جیاواز نییە، بەڵكو رێژەی ماوەی خامۆشی لە جوڵەی هێواشدا پترە لە جوڵەی خێرا.

بۆ ئەوەی كەلامناسان لە تەنگژەی بۆچونی (بۆشایی) لە زەمەن و شوێن و جوڵە قوتارییان ببێت، پەنایان وەبەر تیۆرەی قەڵەمباز برد، ئەوان جوڵەیان بە قەڵەمبازێك لە خاڵێكەوە بۆ خاڵێكی تر لە قەڵەم دەدا، بەڵام زەمەنیان بە قەڵەمبازێك لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی تر لە قەڵەم دەدا. راستیەكەی ئەوان پێویستیان بەو تیۆرە خەیاڵیە (تیۆرەی قەڵەمباز) نەبوو، ئەو تیۆرەیە تەنها وەڵامدانەوەیەك بوو بۆ رەخنە ساویلكانەكان.

كەلامناسان بەلۆژیكێكی بەپساوەوە جیهانی جوڵاوی ماددییان لە زەمەن و كاتدا دابەشكردە سەر جەوهەرە تاكیەكان كە هەڵگری رواڵەتەكانی خۆیان بوون، هەندێكیشیان وای بۆچوون رواڵەت لە دوو زەمەندا نامێنێتەوە، بەڵام جەوهەر نەمرە، لێ هەندێكی تریان لەو رووەوە جیاوازیان لەنێوان جەوهەر و رواڵەت نەدەكرد، دەیانگوت جەوهەر كە لە حەقیقەتی

خۆیدا بریتیە لە خاڵێك لە شوێنێکدا، لە دوو زەمەندا نامێنێتەوە، هەروەکو رواڵەت، خواش هەمیشە و سەر لەنوێ جیهان دەئافرێنێتەوە، ئا لێرەدا هیچ پەیوەستیەکی زەرووری لەنێوان بوونی جیهان لە ساتی ئێستا و بوونی جیهان لە ساتی پێشتر یا ساتی دواتردا نییە، کەوایە ژمارەیەك جیهانی دوا بەدوای یەك هەیە، جا ئەو داوبەدوای یەکبوونەدا وامان لێدەکات پێمان وابێ یەك جیهان هەیە، گەر واشمان هاتە بەرچاوان کە پەیوەندییەك لەنێوان بکەر و بەرکار لە رووداوەکاندا هەیە، ئەوە خودا بە ئیرادەی خۆی کە ئێمە مەودای ئەو ئیرادەیە بەڵەد نین، هەمیشە ئەو رێرەوە دەسازێنێ کە ئێمە دەیبینین.

رەنگە خودا ئەمڕۆ یا سبەی ئەو رێڕەوە نەپچڕێنێ، بەڵام هەموو ساتێك توانای ئەو کارەی هەیە. بەڵگەش بۆ لەنێوچوونی مەزهەبی گەردیلەی کەلامناسان لەمەڕ هۆکارەکی، ئەو نموونە کۆنە بوو کە هەمیشە دەیانهێنایەوە، نموونەی ئەو پیاوەی کە دەنووسێ، دەیانگوت خودا لە هەموو ساتێکدا ئیرادە لەو پیاوەدا دەخولقێنێ، پاشان توانای نوسین، پاشان جوڵەی دەست، ئینجا جوڵەی قەڵەم، هەر یەکێك لەمانە هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکترەوە نییە و بەتەواوی لێکتر سەربەخۆن.

گەر نەیارێکش بپرسێ: نکۆڵیکردن لە هۆکارەکەی و نکۆڵیکردن لە ملکەچی رووداوەکانی گەردوون بۆ یاسا نەگۆڕەکان، سەرپاکی مەعریفە لەنێو دەبات، جا کەلامناسێکی بڕوادار لە وەڵامدا دەڵێت: خودا ئاگاداری رووداوەکانە بەر لە روودانیان، خودا ئەو رووداوانە دەخولقێنێ و واشیان دەخولقێنێ کە ئێمە وامان بێتە بەرچاوان کە لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە، بەڵکو زانینیشی لە دەروونی مرۆڤدا خولقاندووە، پێویستیشی ناکات لەو زاناتر بین، چونکە خودا باشترین زانایە.

توێژینەوەکانی کەلامناسانی ئیسلامی لە پەیوەندی نێوان خودا و جیهان یا خودا و مرۆڤ واوەتر نەدەچوو. بەڕای کەلامناسان جگە لە خودا هیچ بوویەکی ترە نییە تەنها جەوهەرەجەستەییەکان و رواڵەتەکانیان نەبێت. بەڵام بڕوابوون بە بوونی دەروونی مرۆیی وەکو جەوهەرێکی ناجەستەیی، و بوونی ئەقڵە لێکجیاوازەکان، وەکو ئەوەی فەیلەسوفان و هەندێ لە موعتەزیلەکان بانگەشیان بۆ دەکرد، نەدەکرا لەگەڵ بانگەشەی کەلامناسە ئیسلامیەکاندا وێك بێتەوە کە بانگەشەی تاکایەتی خودا و بێ بەری لە خەسڵەتە دروستکراوەکان و بێ هاوبەشی خودایان دەکرد، ئەوان دەیانگوت: دەروون لە جیهانی جەستەکاندایە، ژیان و هەستەکان وجوڵەکانی دەروون هەموویان رواڵەتن، وەکو رەنگ و تام و بۆن و جوڵە و خامۆشی. لەلای هەندێکیش لە جەستەشدا دەروونێك هەیە پارچەپارچە نابێت. ئەوانی تر وای

بۆ دەچوون چەندین پارچەی پارچەی رووحی هەن پارچە پارچە نابن و تێکەڵ بە جەوهەرەکانی جەستە دەبن. بیرکردنەوە لە هەردوو حاڵەتەکەدا پەیوەستە بە گەردیلەوە.

### ١٣- سۆفیگەری:

بەڵام هەموو موسڵمانان ئارامی و ئۆقرەیی دڵی خۆیان لە کەلامناسیدا چنگ نەدەکەوت، بڕواداران مەیلی ڕێگەی دیکەیان هەبوو بۆ نزیکبوونەوە لە خودا. ئەو ڕەوتە کە لە چەرخی یەکەمی ئیسلامەوە بوونی هەیە و لە ژێرکاریگەری چەند فاکتەرێکی مەسیحایی و فارسی و هیندی بنجی داکوتاوە، پاشان بەهۆی پێشکەوتنی شارستانیەتەوە پتر گەشە و نەشونمای کرد، لەوەشەوە کۆمەڵێك دیاردەی ئایینی دەرکەوتن کە پێیان دەوترا سۆفیگەری[٥٤]. لە سەرهەڵدانی ئەو گرووپە ئەولیا و زاهید و تەرکە دونیایانەی موسڵمانان، دەبینین مێژووی رەبەنە مەسیحی و قەشە و خۆپارێزەکانی شام و میسر و مێژووی رەبەنەکانی هیند خۆی دووبارە دەکاتەوە.

گەر باس لە سۆفیگەری ئیسلامی بکەین، ئەوە باس لە سیستەمێکی پراکتیکی بەبۆن و بەرامەیەکی ئایینی یا رووحی دەکەین، بەڵام سیستەمێکی پراکتیکی کە هەمیشە لە فیکردەوە ئاوێنەیەك وەردەگرێ و خۆی تیادا دەنوێنێ، ئەوەش وای لێدەکات بنەماکانی تیۆری بن.

بۆ ئەوەی مرۆڤ و خوداکەی لێکتر نزیك بکەنەوە، پێویستیان بە چەند کارێکی رازئامێز و چەند کەسێك هەبوو وەك ئەڵقەی پەیوەندی، ئەو کەسانە هەوڵیان دەدا لە نهێنی ئەو کارانە تێ بگەن و بۆ شوێنکەوتوانیانی ئاشکرا بکەن، جا لە پلەبەندیدا پێگەیەك بۆ خۆیان دابنێن و لەو پێگەیە مرۆڤ و خودا بە یەکتر بگەن، بێگومان تیۆرەکانی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونی کاریگەریان بەسەر ئەمەوە هەبووە، هەندێ لەو تیۆریانە لە کتێبە وەپاڵدراوەکانی دیۆنۆسیۆسی ئاریۆپاچی و کتێبەکانی هیرۆتیۆسی قەشە (ستیڤن برسدیلی-یەوە وەرگیراون، پێدەچێ رێبازی یۆگای هیندیش کاریگەرییەکی زۆری بەسەرەوە هەبووبێت، لانی کەم لە وڵاتی فارسدا.

بەڵام سۆفیگەری بەگشتی هەر لە ناو بازنەی ئەهلی سوننەتدا مایەوە، بەڵام چاویان لە پووچگۆیی شاعیران پۆشی.

---

(٥٤) بۆیە پێیان دەوترێ سۆفی چونکە جل و بەرگی دڕی لە سوفچنراویان لەبەر دەکرد. (نوسەر).

کەلامناسان و سۆفیگەراکان کۆکبوون لەسەر ئەوەی لە هەموو شتەکانی بووندا جگە لە خودا هیچ بکەرێکی دیکە نییە، بەڵام سۆفیگەرە توندڕەوەکان لەوەش واوەتر دەچون دەیانگوت لە هەموو شتێکدا جگە لە خودا هیچ شتێکی تر بوونی نییە، واتە لە هەموو شتێکدا خودا هەموو شتێکە.

لەو مەزهەبەی دووەمیشەوە مەزهەبی —تاکبوونیی- سەریهەڵدا کە پێچەوانەی مەزهەبی جەماوەری موسڵمانان بوو، هەر ئەو مەزهەبەیان حەزیدەکرد جیهان بکاتە خەیاڵێکی ناراستەقینە، هەروەك زاتی مرۆیی و زاتی خوداییان یەکانگیر کرد. دوای ئەوەی کەلامناسان بانگەشەی تەنهایی زاتی خوداییان کرد، سوفیگەراکان بانگەشەی یەکێتی سەرتاپاگیری هەموو شتەکانیان کرد، هەروەها دوای ئەوەی ئەوان دەیانگوت بوونی خودا لە شتێکدا هەیە. سۆفیگەری جگە لە زاتی یەزدان بڕوایان بە بوونی شتێکی تر نییە، زۆریش پەرۆشی بینینی خودا بوون. پاشان شیکاری دەروونی هەر لەلای سۆفیگەرەکان سەریهەڵدا، هەروەها پێیان وابوو وێناکاریەکانیان لە دەرەوە دێت بۆ دەروونیان، ئیرادەشیان دەرکەوتنی شتەکانی دەروونیانە لە شێوەی دەرەکیدا، بەڵام لەلای ئەوان حەقیقەتی دەروون چەند چەشن و حاڵەتێکی هەستکردنە بە چێژ و ئازار. گرنگتر لەوانەش خۆشویستنی خودایە، ئەو شتەی بەرزیشمان دەکاتەوە بۆ لای خودا ئەو خۆشەویستەیە، نەك ترس و پاڕانەوە، دڵخۆشی و کامەرانیش مەعریفە و ئیرادە نییە، بەڵکو بە یەکگەیشتنە لەگەڵ خۆشەویست.

ئەو سۆفیگەرانە پتر لە کەلامناسان نکۆڵیان لە چارەنووسی جیهان و کەسایەتی مرۆڤ دەکرد، ئەگەر جیهان لەلای کەلامناسان بوبێتە قوربانی ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ ئافراندن تەنها کاری خودایە، ئەوە جیهان لەلای سۆفیگەرەکان بووەتە قوربانی ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ جگە لە خودا هیچ بوونێکی تر نییە، خودا مرۆڤی خۆشدەوێ و رووناکی هاویشتۆتە دڵیەوە، ئەگەر سۆفیش پەرۆشی دڵدارەکەی بوو، دەبێ دەستبەرداری ئەو شتانە بێت کە هەست و خەیاڵ بۆ دروست دەکەن و سەر لە سۆفی دەشێوێنن. هەموو شتەکانی جیهانی هەستەکی و ئەقڵانی دەگەڕێتەوە بۆ یەك چەق.

گەر رەوتێکیشمان گەرەکبوو پێچەوانەی رەوتی سۆفیگەری ئیسلامی، دەبێ باسی رەوتی رەسەنی یۆنانی بکەین، یۆنانیەکان حەزیان دەکرد لەو هەستانەی هەیانە پتریان هەبێت، تا لەوەی لەمەڕ جوانی گەردوون دەیزانن پتر بزانن، بەڵام ئەو سۆفیانە رەخنەیان لە زۆری هەستەکان دەگرت، چونکە فرە هەستی دەبێتە هۆی تێکدانی کامەرانی و ئاسودەیی.

بەڵام سروشتی مرۆڤ یاسایەکی هەیە ناگۆڕێ، ئەو سۆفیگەرانەش کە دەستیان لە دونیا و شتە بەرهەستەکان هەڵگرتبوو، بۆ دەرخستنی حاڵ و باری خۆیان دەچوونە ئەوپەری ئاسمانی خەیاڵات، بۆیە نابێ سەرمان سوڕبمێنێ لەوەی ببینین زۆرێك لەو سۆفیگەرانە لە بیرکردنەوە لە زانستە بیروباوەڕییەکاندا سەرنەکەوتن، زۆرجار ئاکاری زاهیدان خراپ ئاوەژوو دەبێتەوە.

لێکۆڵینەوە بەدوورودرێژی لە سەرهەڵدانی سۆفیگەری پتر پەیوەستە بە مێژووی ئایین، نەك مێژووی فەلسەفە، گەرچی ئەو توخمە فەلسەفیانەی ئەهلی سۆفیزم وەریان گرتووە، لای ئەو فەیلەسوفانەی ئیسلام دەیاندۆزینەوە کە دواتر لەبارەیانەوە دەدوێین.

## ٤- ئەدەب و مێژوو:

### ١- ئەدەب:

شیعری عەرەبی و شێوازی نوسینی مێژوو، جیاوازبوو لەو رێسا نەگۆڕاوەی زانایان بەکاریان دەهێنا، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات هەروەك چۆن مێژوو نەیتوانی خۆی لە کاریگەری فاکتەرە بیانییەکان بەدوور بگرێ، شیعریش نەیتوانی خۆی لەو کاریگەرییە ببوێرێ، ئا لێرەدا بە چەند تێبینیەك قسەکانی سەرەوە پشت راست دەکەینەوە:

دەرکەوتنی ئیسلام لە نێو عەرەبدا نەبووە هۆی پچڕانی پەیوەندی نێوان خۆیان و ئەو کەلەپورە شیعریەی بۆیان مابۆوە، بە پێچەوانەی ئەوەی مەسیحیەت لە نێو گەلانی جەرمانیدا کردی. ئەدەبی نائاینی تا سەردەمی ئەمەوییەکانیش حیکمەت و داناییەکی زۆریان لە خۆ دەگرت، کە هەندێکیان لە شیعری کۆنی عەرەبییەوە وەرگیرابوون و پێچەوانەی ئامۆژگارییەکانی قورئان بوون.

خەلیفەکانی بەنی عەبباس وەکو مەنسور و رەشید و مەئمون لە کولتوری ئەدەبیدا لە (شاریمان) پتر چانسیان هەبوو، پەروەردەی منداڵەکانیشیان تەنها دیراسەکردنی قورئان نەبوو، بەڵکو بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان ژیاننامەی شاعیرانی کۆن و زانینی مێژووی گەلی عەرەبیان کۆکردەوە.

ئەهلی شیعر و ئەدەب پتر لە خەڵکانی تر لە خەلیفەکان نزیکبوون و خەلیفەکانیش چاوەڕێی ئەوەبوون شتێکیان بۆ بکرێ شیاوی مەملەکەتەکیان بێت. ئا لەوێدا، لە کۆشکی خەلیفەکاندا ئەدەب کەوتە ژێر کاریگەری کولتوری زانستی و بیرکردنەوەی فەلسەفی، گەرچی زۆرینەیجار هەر رواڵەتیانە دەکەوتە ژێر کاریگەرییەوە. ئەوەش بە شێوەیەکی تایبەتی لەو شتانەی کە لەمەڕ شاعیران دەیگێڕنەوە، دەردەکەوێ شاعیران دوڕدونگبوون و قەشمەریان بە پیرۆزترین شت هاتووە، هەروەك لە پیاهەڵدانی ئارەزووە هەستیەکانیشدا دەردەکەوێ. بەڵام لە پاڵ ئەوەشدا حیکمەت و بۆچوونی جیدی و بیروباوەڕی سۆفیگەرانە دەبینین، کە هەر هەموویان لە شیعری عەرەبیدا هەبوون، کە لەسەرەتادا واقیعی بوو بەبۆن و بەرامەی حیکمەتەوە، جا

شیعری هونەری جوانبێژی و یاریکردن بە ووشە و خەیاڵات و هەست و دەستەواژەی بۆش و کێش و سەروادار، جێگەی جوانی سروشت و هەستپاراوی لە وێنەکێشانی شتەکاندا گرتەوە.

## ٢- ئەبو عەتاهیە، موتەنەببی، ئەبو عەلا، حەریری:

ئەبو عەتاهیە[٥٥] (٧٤٨ -٨٢٨ز) لە شیعرەکانیدا شاعیرێکی روحشیرین نییە، چونکە هەمیشە باسی ئارەزووی کلۆڵی و مەرگ دەکات، فەلسەفەی ئەبو عەتاهیە لەوەدا کورت دەبێتەوە کە مرۆڤ بە وریایی و گومانەوە ئەقڵی خۆی بەکار بهێنێت و زوهدیشی کردووە بە قەلغانێکی باشتر بۆ تاوان و گوناه.

بەڵام ئەوانەی شتێك لە دونیا تێگەیشتوون و دەتوانن شیعری سروشت تام بکەن، شیعرەکانی ئەبو عەتاهیە زۆر دڵخۆشیان ناکات کە داوای دوورکەوتنەوە لە دونیای دەکرد.

هەروەها شیعرەکانی موتەنەببیش[٥٦] (٩٠٥-٩٦٥ز) دڵپەسندی ئەو کەسانە نەبوو، چونکە شیعرەکانی ئەم لەشێوەی حیکمەتی پەندی پێشینان دەچوو، بەڵام لە رووی بابەتەوە زۆر کاریگەربوو بەسەر دەروونەوە، ئەوە لەگەڵ ئەوەی موتەنەببی بەگەورەترین شاعیری عەرەبی بێ رکابەر دادەنرا.

هەروەها هەندێ کەس پلە و پایەی ئەبو عەلای مەعەرییان[٥٧] (٩٧٣-١٠٥٨) بەرز کردەوە و بەشاعیرێکی فەیلەسوفیان لەقەڵەم دەدا، پلە و پایەیەکیان پێدا کە شایانی نەبوو،

---

(٥٥) أبو أسحاق اسماعیل بن القاسم بن سوید بن کیسان العتری ناسراو  به أبی العتاهیه، ساڵی ١٣٠ی کۆچیی لەدایکبووە و ساڵانی ٢١١ یا ٢١٣ ی کۆچیی مردووە. (ابن خلکان ج١ ص٨٩-٩٠)، وەکو (oestrup) لە دائرە المعارف الاسلامیه بە یەکەم شاعیری فەیلەسوفی دادەنێ لە ئەدەبی عەرەبیدا. مرۆڤ لە شیعرەکانیدا هەست بە فەلسەفەی ژیان دەکات و تێبینی دەکات لە ژێر کاریگەری دەستەواژەی و چەمکی کەلامناساندایە. (و.ع).

(٥٦) **أبو الطیب أحمد بن الحسین بن الحسن بن عبدالصمد الجعفی الکندي المعروف بالمتنبي**، ساڵی٣٠٣ ی کۆچیی لە کوفە لەدایکبووە و ساڵی ٣٥٤ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

(٥٧) أبو العلاو أحمد بن عبدالله بن سلیمان بن محمد بن سلیمان المعری، ساڵی ٣٦٣ی کۆچیی لە المعرە النعمان لەدایکبووە، ئەبو عەلاو شاعیرە فەیلەسوفێکی رەشبین بووە. راستیەکەی ئەبی عەلاو زۆر شارەزای بیروبۆچوونی یۆنان و هیند و فارس و عەرەبەکان بووە لەمەڕ سروشت و ژیانی مرۆیی و سروشتی مرۆیی. بەڵام

بەڵێ ئەبو عەلا هەندێ جار بۆچوونی ئەقڵانی هەبوو و هەندێ لە شیعرەکانیشی گیانی داهێنانی تێدابوو، بەڵام فەلسەفە نەبوو، شیوازی داڕشتنەکەی فەلسەفی نەبووە، زۆرینەی جار شیعرەکانی لە گوزارشتێکی ئاسایی باوی خراپ پتر نەبوو، کە خرابوونە پلە و پێگەی شیعر.

گەر ئەبا عەلا باشتر لەو ژیانەی تێدابوو ژیابا (چونکە نابینا و هەژاربوو) دەشیا وەکو زمانزان یا مێژوونووسێك لە گۆڕەپانی رەخنەدا شتێکی تازەی بەرهەمهێنابا.

ئەبو عەلا لەبری داوای خۆشویستنی ژیان بکات داوای خۆپاراستنی دەکرد لە چێژەکانی ژیان، ئەبو عەلا زۆر شارەزای کاروباری سیاسی و بیروباوەڕی گشتی ئایین و بۆچوونە تایبەتییەکانی زانست بوو، هەروەها دەرخەری کەموکورتیەکان بوو، گەرچی نەیتوانی لەمەدا نوێکاری بکات.

ئەبو عەلا زۆر بێ بەهرە بوو لە پێك بەستنەوەی شتەکان، هەروەها توانای شیکاری هەبوو، بەڵام لە لێدان و پێکبەستنەوەدا دەستڕەنگین نەبوو.

ئامۆژگارییەکانی ئەبی عەلا زۆر قوڵ بوون، زانستەکەشی وەکو دارێك بوو بنەچەکەی لە ئاسمان بوو، هەروەکو لە هەندێ نامەکانیدا دەڵێ: گەرچی نەیویستووە ئەو شتە لە بارەی خۆیەوە بڵێ.

ئەبو عەلا دوور لە ژن ژیا، و هەرگیز لە ژن نزیك نەبۆوە، هەروەها وەك فەیلەسوفە رەشبینەکان رووەکخۆر بوو، لە شیعرێکیدا دەڵێ:

***إن الشرائع ألقت بيننا إحناً ........ و أودعتنا أفانين العداوات***

واتە: (شەریعەت و یاساکان، هەزاران دووبەرەکی و ئاژاوەیان خستە نێوانمانەوە).

یا دەڵێ:

***فلتفعل النفس الجميل، لأنه...... خيرٌ و أحسن لا لأجل ثوابها.***

واتە: (دەروون با ئەو شتە بکات کە جوانە، چونکە چاك و باشە، بەڵام نەك لە پێناو پاداشت).

---

ئەم ئەو شتانەی وەکو شاعیرێك باس کردووە نەك وەکو فەیلەسوفێك، واتە دانا یا شاعیرێکی فەلسەفەکار بووە نەك فەیلەسوف بە مانای وردی وشەکە. (و.ع).

لە پاڵ ئەو شاعیرانەدا ئەدیبی زۆر دەسترەنگین هەبوون، خاوەنی فەلسەفەی پراکتیکی خۆیان بوون و توانیان لە ژیان تێبگەن و ناوبانگ و پلەوپایەیەك بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

وەکو ئەوەی بە گوێرەی راسپاردەی ئەو حەکیمە دانایە کاریان کردبێت کە بەرێوەبەری شانۆکە لە چیرۆکی (فاوست)ی شاعیری ئەڵمانی (گۆتە — GOETE) کە دەڵێ: ئەگەر ئەدیب فرە بابەت بێت، شتی وا بەرهەم دێنێت جێی دڵخۆشی زۆر کەس بێت.[٥٨]

حەریری[٥٩] (١٠٥٤-١١٢٢ز) باشترین ئەو جۆرە ئەدیبانەیە. پاڵەوانی حەریری ئەبو زەیدی سروجی بووە کە پیاوێکی سواڵکەری گەڕۆك بووە، لەم بەیتانەدا باڵاترین حیکمەتەکانی خۆیمان فێری دەکات:

***عش بالخداع! فأنت في ........ دهر، بَنُوه كأسد بيشه***
***وأدر قناة المكر، حتى......... تستدير رَحَى المعيشه***
***وصِدِ النسور! فإن تعذر ...... صيدها، فأقنع بريشه***
***وأجن الثمار! فإة تفتك....... فَرَض نفسك بالحشيشة.***

واتە: (بە فێڵ و تەڵەکە بژی.... تۆ لە رۆژگارێکدای لە لانەی شێر دەچیٚ./ دەستاڕی فێڵبازی بادە..... تاکو گوزەرانت خۆش بسوڕیٚ/ راوی هەڵۆ بکە....... ئەگەر نەشتتوانی، ئەوە بە پەڕەموچەکەی قایل بە/ بەروبووم بچنەوە.....گەر دەسخەرۆش بووی، ئەوە بە گەڵا و گژوگیا رازی بە).

### ٣- کەلەپوری مێژوویی:

(٥٨) wer vleles bringt, wird manchem etwas bringen.

(٥٩) أبو محمد القاسم بن علي بن محمد بن عپمان الحريري البصري، ساڵی ٤٤٦ی کۆچیی لەدایکبووە و ساڵی ٥١٥ یا ٥١٦ی کۆچیی لە بەسرە مردووە. (و.ع).

مێژوونووسانی کۆنی عەرەب — هەروەك شاعیرانیان- بە توانابوون لە پەیبردنی وردی بەشەکان، بەڵام لە پێکبەستنەوەی گشت بێ بەهرە بوون.

وەختێکیش ئیمپراتۆریەتەکەیان زۆر فراوان بوو، ئیدی ئاسۆی بینینشیان فراوان بوو و بابەتی زۆریشیان بۆ فەراهەم بوو، هەروەها زانیاریشیان لەمەڕ مێژوو و جوگرافیا پتر بوو، چونکە بۆ کۆکردنەوەی فەرموودەکان و بەڕێوەبردنی دەوڵەت یا تەنها بۆ حەزی زانین گەشتی زۆریان کرد، ئەم گەشتانەش پتر لە حەجکردن زانیاری پێ دەبەخشین.

عەرەب میتۆدێکی تایبەت بە خۆیان دروستکرد بۆ بژارکردنی حەکایەتە کۆنەکان، بەو پێیەی ئەو حەکایەتانە بەسەرچاوەیەکی گرنگی زانیاری لەقەڵەم دەدران، پۆلینکردنی بابەتی لێکۆڵینەوەکانیان بۆ بەش و لقی زۆر و پۆلینکردنی ئەو بەش و لقانەش بۆ لق و بەشی دیکە دەستڕەنگینی خۆیان نیشاندا، هەروەك ئەوەی لە رستەسازی و رێزماندا نیشانیاندا، ئەو پۆلینکردنەش تەنها فرە لق و پۆپ بوو نەك روون و رۆشن. لەوەیشەوە مەزهەبێکیان لە لۆژیکی مێژوودا دامەزراند، لە چاوی رۆژهەڵاتیەکاندا لە لۆژیکە بونیادپتەوەکەی ئەرەستۆ جوانتر بوو. عەرەب ئەوەندەی لە رووی تیۆریەوە کولتورەکەی خۆیان بژار دەکرد، ئەوەندە لە رووی زانستیەوە نەیاندەکرد، بۆیە زۆرێك لە زانایانی عەرەب پتر پشتیان بە بینین و ئامرازە هەستیەکان دەبەست نەك بە ئەقڵ، چونکە ئاسانتر بڕوا بە ئاکام و ئەنجامە هەڵەکان دەکرێ.

لە نێو مێژوونوساندا هەمیشە گرووپێك هەبوون بێ لایەنانە حەکایەتە پێکدژەکانیان دەگێڕایەوە، بەڵام ئەوانی تر —بەلەبەرچاوگرتنی داخوازییەکانی رۆژ- دوودڵیان نەدەکرد لە حوکمدان بەسەر رابردوودا، حوکمدانێك چانسی پشت ئەستوریان جیاوازبوو، زۆرجار مرۆڤ ئاسانتر پەند لە ژیانی رابردووی وەردەگرێ، نەك ژیانی ئێستای کە تیایدا دەژی.

پاشان بابەتی نوێ بۆ توێژینەوە دەرکەوتن، هەروەها میتۆدی نوێش بۆ تاوتوێکردنی ئەو بابەتە تازانە سەریهەڵدا، هەندێ فەلسەفەی سروشتیش هاتە نێو جوگرافیاوە وەك جوگرافیای کەش و هەوا، بابەتی مێژوویش هەموو ژیانی ئەقڵی و بیروباوەڕی و ئەدەب و زانستیشی دەگرتەوە، شارەزایی عەرەب بە هەلومەرجی وڵاتی بیانی و گەلانی ناعەرەب، بووە هۆی ئەوە لە زۆر رووەوە خۆیان بەوان بەراورد بکەن، ئینجا تۆخمێکی نێودەوڵەتیانە چووە نێو مێژووەوە، مەبەستم دەرکەوتنی بەهای مرۆڤ و شارستانیەت و بەرهەمە ئەقڵیەکانی مرۆڤە.

### ٤- مەسعودی و موقەددەسی:

مەسعودی ساڵی (٩٥٦ز مردووە)[٦٠]، نوێنەرایەتی ئەو ڕەوتە مرۆڤدۆستیەی دەکرد، کە گرنگی بە هەموو شتێکی مرۆیی دەدا، زۆر بە دروستیش تێیان دەگەیشت، هەر کێی ببینایە زانستی لێوەردەگرت، خوێندنەوەی کتێب کە تەنهایی خۆی پێ پڕ دەکردەوە، بەرهەمی خۆی هەبوو.

مەسعودی لە ژیانی پراکتیکی و ئایینی و بیروڕای خەیاڵیانەی فەیلەسوفان، ماندوو دەبوو، زۆر گرنگی بە مێژوو دەدا، لە دیراسەکردنی مێژوو، دەرمانی دەردەکانی خۆی دەدۆزییەوە، ئەم گرنگیدانەش تا کۆتایی ژیانی لە تاراوگەنشینی لە میسر هەر بەردەوام بوو.

مێژوو لەلای مەسعودی لە خۆگری هەموو زانستەکانە، مێژوو فەلسەفەی مەسعودی بوو کە تیایدا حەقیقەتی هەموو شتێك و هەموو بونەوەرێکی دەدۆزیەوە.

هەروەها مێژووی کردبووە بابەتی خۆی بۆ حیکمەت و مێژووی جیهان، دەیگوت ئەگەر مێژوو نەبووبا ئەوە زۆر دەمێك بوو زانستەکان لە نێوچووبوون، چونکە زانایان دێن و دەچن، بەڵام مێژوو زیرەکی و ژیری ئەو زانایانە تۆمار دەکات و پەیوەندی رابردوو بە ئێستا دەپارێزێت، مێژوو لە بیروبۆچوونی خەڵکی ئاگادارمان دەکات و بێ لایەنانە ڕووداوە قەوماوەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە، بەڵام مەسعودی لە کتێبەکەیدا پێکبەستنەوەی ڕووداوەکانی بۆ خوێنەری وریا جێهێڵاوە، وایشی لە خوێنەر کردووە سۆراخی بیروباوەڕی خودی نوسەر بکات.

دوای مەسعودی زانایەك لە زاناکانی جوگرافیا هات، مەقدیسی یا موقەددەسی[٦١]، کە ساڵانی ٩٨٥ ژیاوە، موقەددەسی شایانی ڕێز و باسکردنە، زۆر وڵات گەڕاوە، شارەزایی لە زۆر کار و پیشەدا هەبووە، تا ژیانی ئەو سەردەمە شارەزا بێت کە تیایدا ژیاوە، موقەددەسی پیاوێکە لە وێنەی ئەبی زەیدی سەروجی، بەڵام ئامانجێکی هەبووە و لەبەرچاوی گرتووە.

---

(٦٠) أبو الحسن علی بن الحسین المسعودی مێژوونووسی بەناوبانگ، ساڵی ٣٤٦ی کۆچیی مردووە، نێودارترین کتێبی ئەم پیاوە (**مروج الذهب و التنبیة و الاشراف**)ە. (و.ع).

(٦١) شمس الدین أبو عبدالله محمد بن أبی بکر البناو الشامی المقدسی ناسراو بە بشاری کە نزیك بە ساڵانی ٣٣٦ یا ٣٨٠ی کۆچیی ژیاوە. (و.ع).

موقەددەسی کارە زانستیەکانی خۆی بە رەخنە و بژارکردن دەستپێکرد، ئەو زانستەی قبولبوو کە لە توێژینەوە و سۆراخکردنی شتێك بەدەست دێ، ئەو شتانەی قبوڵ نەبوو کە بەرهەمی بۆماوە یا بەرهەمی تەنها سۆراخێکی لۆژیکی بوو، موقەددەسی دەیگوت ئەو راستیە جوگرافیانەی لە قورئاندا هاتوون، بەشێوەیەکن لەگەڵ کەم زانیاری و دونیابینی عەرەب بگونجێ، خودا گەرەکی بووە بە گوێرەی رادەی زانیاری خودی عەرەب بیاندوێنێ.

موقەددەسی وەسفێکی بێ لایەنانەی هەلومەرج و رەوشی ئەو وڵاتانەی کردووە کە بەرچاوی خۆی بینیونی، هەروەها زۆر وریای ئەو زانیاریانەش بووە کە سەرنجی تایبەتی خۆی پێیان گەیشتووە و لە پلەی یەکەمی داناون، دوای ئەو لە پلەی دووەمدا زانیاری زانا جێ متمانەکانی داناوە، دواتر ئەو شتانەی داناوە کە لە کتێبەکانەوە وەری گرتوون.

ئێمە ئەم چەند رستەیە وەردەگرین کە موقەددەسی وەسفی خۆی پێ کردوون، لە پێشەکی کتێبەکەیدا دەڵێ: دوای گەڕانێکی زۆر بە وڵاتدا و چوونم بۆ زۆر هەرێمی ئیسلام و بینینی زانایان و بە خزمەتگەیشتنی پاشان و هاونشینی دادوەران و شاگردیکردنی فوقەها و ناکۆکیم لەگەڵ ئەدیب و خوێنەر و فەرمودە کۆکراوەکان، هەروەها تێکەڵبوونم لەگەڵ زاهید و سۆفیەکان، هاونشینیم لەگەڵ هەموو کەسێك، جا ئەم هەموو شتەی لێ بەرهەم هات. زۆر لەو هۆکارانە وردبوومەوە تاکو تێیان گەیشتم، گەڕان و سوڕان لەسەر سنورەکان تا رزگاریم بوو، شەن و کەوکردنی مەزهەبەکان تا فێریان بووم، شارەزابوونم لە زمان و دەنگەکان تا رێکم خستن، لەگەڵ کەیفی هەوا و ریتمی ئاو و ئازارچەشتن و بەخشینی سامان و داواکردنی حەڵاڵ، تەرککردنی تاوان و گوناه و ئامۆژگاریکردنی موسڵمانان لە ئارامگرتن لەسەر کلۆڵی و ئاوارەیی، چاودێریکردن و ترسان لە خودا، خۆلادان لە درۆ و ستەم تانە و تەشەر)

لە شوێنێکی دیکەی کتێبەکەیدا لەبارەی خۆیەوە دەڵێ: (بووم بە فەقێ و بە ئەدەب بووم، بووم بە زاهید و نوێژم کرد، لەسەر سەکۆکان وتارمدا، لەسەر منارەکان بانگمدا، لە مزگەوتەکان بوون بە ئیمام، هاوخوانی سۆفیەکان و خانەقانشینانم کرد، چوومە ریزی چەتە و رێگرەکانەوە، لە هەرد و پێدەشتەکاندا روتکرامەوە و لە بیابانەکاندا وون بووم، سەردەمێك ئاییینپەروەرێکی راستگۆ بووم، حەرامم خوارد، کۆیلە بووم، سەللەم وەسەر سەرنا، زۆر جار چوومە لێواری نقوم بوون، زۆر جار رێگەم پێگیرا، زیندانی کرام، بەسیخوڕ لەقەڵەم درام، لە ژێر بای سوتێنەر و بەسەر بەفریشدا گوزەرم کرد، چوومە کۆڕی پاشایان، لە نێو نەزاناندا

نیشتەجێبووم، چەندین جار پلە و پایەم پێ برا، چەندین جار لە مردن گەڕامەوە، جلی پاشانم پۆشی، پەیوەندی زۆرم پەیدا کرد، پاشان چەندین جاری تر رەش و رووت وهەژار کەوتمەوە).

لەم رۆژگارەدا وا راهاتووین وا بیربکەینەوە کە پیاوی رۆژهەلاتی دلسۆزن بۆ ئەو بیروباوەڕ و نەریتانەی لە باوانیانەوە بۆیان بەجێماوە و هێمنانە تێی رادەمێنن. بەلام ئەو وێناکردنە راست نییە و لەم ساتەدا ئێستا بەسەر موسلماندا پەیڕەو ناکرێ، بۆ چوار سەدەی یەکەمیش هەر زۆر کەمتر بەسەریان پەیڕەو دەکرا، ئەو رۆژگارانە هەولیان دەدا دەست بەسەر هەموو خێر و بێرە ماددیەکانی جیهاندا بگرن، بگرە دەست بەسەر هەموو ئەو شتانەدا بگرن کە ئەقلی مرۆیی بەرهەمی هێنابوون.

## ٣- فەلسەفەی فیساگۆرسی:

## ١- فەلسەفەی سروشتی

**١- سەرچاوەکانی:**

عەرەب توخمی فەلسەفەی سروشتی خۆیان لە بەرهەمەکانی ئۆکلیدیس و بەتلیمۆس و بیکرات و گالینۆس و هەندێ لە کتێبەکانی ئەرەستۆ و لەپاڵ ئەوانەشدا لە چەندین کتێبی هەردوو مەزهەبی نوێ فیساگۆرسییەکان و نوێ ئەفلاتونیەکانەوە، وەرگرت. فەلسەفەی سروشتی، فەلسەفەیەکی بەربڵاو و پڕجەماوەرە، لەلای شیعەکان و زۆر تیپی تر پێشوازی زۆری لێکراوە، سائیبەکانی حەڕانیش پتر لە هەموو کەس کاریان لەسەر بڵاوکردنەوەی کردوە.

بە تێپەڕبوونی کات کاریگەری ئەم فەلسەفەیە کۆڕی پاشایانی تێپەڕاند و کاریکردە سەر گرووپێکی زۆری رۆشنبیران و رووناکبیرانیش. هەروەها چەند بەشێکی هەمەجۆری ئەم فەلسەفەیە لە کتێبەکانی ئەرەستۆی لۆژیکناسەوە وەرگیراون، وەك کتێبی: (میتۆدلۆژی)، (لەبارەی جیهانی ئاژەڵان)، (دەروون) وزۆری تر. بەڵام روحی ئەو فەلسەفەیە بۆن و بەرامەی راسپاردەکانی ئەفلاتون و تێکەڵ بە مەزهەبی فیساگۆرس و راسپاردەی رەواقیەکان و دوای ئەوانیش ئەستێرەناسان و کیمیاگەران لێدەهات.

مرۆڤ بە پاڵنەری ئایینپەروەریی و سروشتی حەزی شت زانینی خۆی، پەرۆشی خوێندنەوەی نهێنی ئەو ئافرێنەرەیە کە لە کتێبی دروستبووندا باسکراوە، خەڵکی سۆراخی پتر لەوەیان دەکرد کە بۆ پێداویستیە پراکتیکیەکان پێویست بوو، ئەو پێویستیانەش تەنها کەمێك ژمێرە بوو کە لە دابەشکردنی باج و سەرانەدا کەڵکیان لێوەردەگرت، هەروەها بۆ کاروباری بازرگانی کەڵکیان لێوەر دەگرت جگە لە ئەستێرەناسی کە بۆ کاتی نوێژکردن سودیان لێوەردەگرت. ئیدی خەڵکی لە هەموو سەرچاوەکانەوە دانایی و زانینیان کۆدەکردەوە، لە نێو ئەو پەرۆشیەشدا رەوتێك دەرکەوت کە مەسعودی بە وردترین شێوە گوزارشتی لێکردووە و دەڵێ:

"نابێ چاکەی چاکەکارێك سوك بکەین، جا دۆست بێ یا دوژمن، لە چاك و خراپ سودی خۆت وەرگرە"

بگرە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب دەڵێ: "دانایی ڕێنیشاندەری بڕوادارە، بۆ خۆت دانایی پەیدا بکە، جا با لە بێ بڕوایانیش بێت".

## ٢- زانستی بیرکاری:

فیساگۆرس مامۆستای عەرەبە لە بیرکاریدا، بەڵێ توخمە یۆنانییەکانیان تێکەڵ بە توخمە هیندییەکان کردوە، بەڵام موسڵمانان بۆ تاوتوێکردنی بابەتەکانی لێکۆڵینەوە، کاریگەربوون بەرەوتی مەزهەبی نوێ فیساگۆرسییەکان. کە دەیگوت مرۆڤ تەنها بە دیراسەکردنی لقەکانی بیرکاری دەتوانێ ببێ بە فەیلەسوف یا دکتۆر، لقەکانی بیرکاریش وەك ژمێرە و ئەندازە و ئەستێرەناسی و مۆسیقا. بەڵام ژمێرەیان دەخستە سەرووی ئەندازە، چونکە ژمێرە کەمتر پەیوەست بوو بە هەستەوە، هەروەها ئەقڵیان زۆر بە نزیك لە جەوهەری شت لە قەڵەم دەدا، تەنانەت فەزڵکردنی ژمێرە وای دەکرد خەیاڵ ئاسانتر بتوانێ یاری بە ژمارەکان بکات.

ئاشکرایە خودا لەلای ئەوان تەنها و مەزن و سەرچاوەی هەموو شتێکیشە، خودا ژمارە نییە، بەڵکو ئافرێنەری ژمارەیە، ژمارە چوار لەلای فەیلەسوفانی سروشتی پێگەیەکی تایبەتی هەبوو، ئەو ژمارەیە ئاماژەبوو بە چوار توخمەکە و شتی تر. ئیدی وای لێهات نە لەبارەی ئاسمانیەکان و نە لەبارەی سەرزەمینیەکانەوە نەدەدوان و نەدەشیانووسی، مەگەر بە قسەی چوار رستەیی یا نامەی چوار بەشی نەبێت.

گواستنەوە لە بیرکارییەوە بۆ ئەستێرەناسی و فەلەکناسی زۆر ئاسان بوو، ئەستێرەناسانی بەنی ئومەییە چاکسازیان لە شێوازی ئەستێرەناسی کۆنی رۆژهەڵاتیانە کرد و پاشان لەسەر دەستی ئەستێرەناسانی عەبباسی پێشکەوتووتر بوو و برەوی زیاتری پێدرا.

ئەستێرەناسی بووە هۆی بیروباوەڕی دژ بە دۆگمایی ئایینی، ئیدی ئەستێرەناسی نەیدەوتوانی پشتگیری و پشتیوانی پارێزەرانی ئایین بەدەست بهێنێ، چونکە لەلای باوەڕداران تەنها دوو جەمسەر هەبوو، ئەوانیش: خودا و جیهان، یا ئەم ژیانە و ژیانی دوایی، بەڵام لای ئەستێرەناسان دوو جیهان هەبوو: جیهانی سەرەوە و جیهانی ژێرەوە، بەڵام خودا و ژیانی رۆژی دوایی دووربوون لە کایەی لێکۆڵینەوەکانی ئەوان.

جیاوازی بیروبۆچوون لەمەڕ پەیوەندی تەنە ئاسمانییەکان بە بونەوەرانی ژێر هەسارەی مانگیشەوە بووە هۆی دەرکەوتنی فەلەکناسییەکی نزیك لە تێگەیشتنی ئەقڵ، یا ئەستێرەناسییەك بابەتەکەی وەهم بوو، بەدەگمەن نەبێت کەس لە وەهمی ئەستێرەناسان رزگاری نەدەبوو، چونکە گەرچی مەزهەبی بەتلیمۆس لەو سەردەمەدا بەسەر زانستدا باڵادەست بوو، بەڵام ئاسان بوو بۆ بۆ پیاوێکی کەم رۆشنبیر گاڵتە بە هیچ و پووچی ئەستێرەناسان بکات، پتر لەوەی پیاوێکی رۆشنبیر بتوانێ وا بکات، ئەستەم بوو پیاوێکی رۆشنبیر بتوانێ بەسەر ئە شتەدا سەربکەوێ (چونکە ئەو کەسە دەیزانی مەزهەبی بەتلیمۆس بنەمای زانستی ئەستێرەناسییە)، ئەو ئەستێرەناسییە پێی وابوو زەوی و بونەوەرانی سەرپشتیشی بەرهەمی کاری هێزێکی ئاسمانیە، روناکیەکە لە روناکییەکی باڵاوە سەرچاوەی گرتووە و زایەڵەی هاوئاهەنگی نێوان ئەستێرەکانە، بەڵام ئەوانەی پێیان وابوو ئەقڵی هەسارە و ئەستێرەکان خەیاڵ و ئیرادەیان هەیە، بەچاودێری یەزدانیان لەقەڵەم دەدا و چاکە و خراپەیان وەپاڵ کاری خودا دەدا، هەروەها هەوڵیان دەدا بەپێی یاسا نەگۆڕەکان و بەگوێرەی شوێنگەی تەنە ئاسمانییەکان، پێشبینی رووداوەکانی ئایندەی سەر رووی زەوی بکەن.

بێگومان هەندێ کەس بەدگومان بوون لەو چاودێرییە لاوەکیەی هەسارەکان، ئەوان لەوەدا پشتیان بەو بەڵگانە دەبەست کە سەرچاوەکەی ئەزموونی هەستی و ئەقڵ بوو، یا مەزهەبی ئەرەستۆ لەمەڕ ئەوەی بونەوەرە ئاسمانیە ئاسودەکان ئەقڵی بیرمەند و پاك و بێ بەرین لە خەیاڵکردن و ئیرادە، هەروەها ئەو بونەوەرانە لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەست بوون بە هەست بەدووربوون، بە شێوەیەك کاریگەری چاودێرییان رووە و خێر و چاکەی هەمووانە نەك تاکەتاکەی بونەوەران.

### ٣- زانستە سروشتییەکان:

زانایانی موسڵمان بابەتی زۆریان لە کایەی زانستی سروشتی کۆکردەوە، بەڵام نەیانتوانی توێژینەوەیەکی زانستی راست و دروستی ئەو شتانە بکەن کە کۆیان کردبۆوە، مەگەر دەگمەن نەبێت، چونکە لە لقەکانی زانستە سروشتییەکان، میتۆدە بۆماوەییەکانیان بەکاردەهێنا. ئێمە ناتوانین لێرەدا شوێنپێی نەشونمای ئەو لقە و بونیادەکەی هەڵبگرین.

زانایای موسڵمان دەیانویست لە تێگەیشتنی دانایی ئافرێنەر و کارەکانی سروشت وردببنەوە، کە بەلای ئەوانەوە هێز و چاوگەیەکی دەروونی گشتگیری جیهانە، ئیدی زانایانی کیمیا ئەزموونەکانی خۆیان دەستپێکرد، جادووگەران سیحر و جادووی خۆیان تاقیکردەوە، توێژەران لە کاریگەری مۆسیقایان بەسەر دەروونی مرۆڤ و ئاژەڵدا توێژییەوە، لە رووخساری مرۆڤدا سۆراخی باری دەروونییان دەکرد، بگرە هەوڵیان دەدا سەیر و سەمەرەکانی خەون و خەونبینین و سەیروسەمەرەکانی جادووگەر و پێشبینیکەر و ئەوانی تریش، لێك بدەنەوە.

بێگومان چەقی توێژینەوەکانیان مرۆڤ بوو، مرۆڤ ئەو جیهانە بچوکە بوو کە هەڵگری سەرجەم هێز و توخمەکانی جیهان بوو، ئەوان دەروونیان بە ماهیەت و حەقیقەتی مرۆڤ لە قەڵەم دەدا، هەروەها پەیوەندی دەروون و دەروونی سەرتاپاگیری جیهان و ئەو رووداوانەی ئاییندەش کە لە خۆیدا حەشاری داوە، کردیان بە بابەتی توێژینەوە، توێنەوەی زۆریش لەبارەی هێزەکانی دەروون ئەنجام دران و دڵ یا مێشك بە بارەگای دەروون دیاری کرا.

هەندێك پابەندی مەزهەبی گالینۆس بوون و ئەوانی دیکەیش ئەو مەزهەیان تێپەڕاند، و وتیان پێنج هەستی ناوەکی هەیە لەبەرامبەر پێنج هەستە دەرەکیەدا، ئەم تیۆرەیە و ئەوەی لەبارەی نهێنییەکانی سروشتەوە ووتراوە، وەپاڵ (بلیناس تەوانی- Apollonius von Tyane) درا.

بێگومان توێژەران کاتێك لەبەرامبەر ئاییندا، بیرکاری و سروشتیان دیراسە کرد، مەزهەبی جیاوازیان بەکاردەهێنا، زانستی بیرکاریش کە پێی دەوترا زانستی پەروەردەیی و سەرەتایی، تاکو نەبووە هەڕەشە بۆ سەر ئایین نەیتوانی سەربەخۆ ببێت، ئیدی زۆر ئاسان بوو تیۆرەی نەمری جیهان و بوونی ماددەیەکی نەمری لە ئەزەلەوە بزواو وەپاڵ فەلەکناسی بدرێ، ئەگەر جوڵەی ئەستێرەکان کۆن و نەمر بێت، ئەوە ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لەسەر زەویش روودەدەن هەر نەمرو کۆنن. لەگەڵ ئەوەی هەندێ کەس پێیان وابوو سەرجەم جیهانی سروشت نەمر و کۆنە، کەچی هەندێکیتر پێیان وابوو رەگەزی مرۆییش هەر کۆنە کە لەبازنەیەکی تایبەت بەخۆی دەبزوێ.

کەوایە هیچ شتێك لە جیهاندا تازە نییە، بیروباوەڕ و بۆچوونی خەڵکیش وەکو هەموو شتەکانی تر خۆیان دووبارە دەکەنەوە، هەروەها هەموو ئەو شتانەی خەڵکی دەیکەن و دەیڵێن و دەیزانن، هەبوون و دەشبن.

لەبارەی خولی شتەکان و زەمەن، قسەی زۆر کرا و نموونەی گومانکارانە هێنرایەوە، بەبێ ئەوەی ئەو شتە ببێتە هۆی پێشکەوتنی زانست.

## ٤- زانستی پزیشکی:

دەرکەوت زانستی پزیشکی زۆر بەسودە، بۆیە خەلیفەکان زۆر گرنگیان پێ دەدا، گرنگیدانی پاشاکان بە پزیشکی، بەهێزترین فاکتەربوو کە وای لە پاشاکان کرد چەندین وەرگێڕیان راسپارد، کتێبە یۆنانیەکان وەربگێڕنە سەر زمانی عەرەبی. لەبەر ئەوە جێگەی سەرسامی نییە کە لە پزیشکیدا کاریگەری تیۆرە بیرکاری و سروشتی و لۆژیکیەکانیش دەرکەوت، ئەگەر پزیشکی ئەو سەردەمە تەنها پشتی بە نوشتەی جادوویی و ئەزموونی بەستبێ، ئەوە کۆمەڵگەی تازە پزیشکی ناچار بە شارەزایی لە فەلسەفەدا دەکرد، ئیدی دەبوا دکتۆری تازەکار شارەزایی لە سروشتی خواردن و دەرمان و فسیۆلۆژی هەبووبا، هەروەها دەبوا شارەزای جوڵەی ئەستێرەکان بووبا لە هەموو حاڵەتەکاندا. دکتۆر برای ئەستێرەناس بوو، زانستی ئەستێرەناسی، پزیشکی ناچار بە رێزگرتن لە خۆی دەکرد، چونکە بابەتی ئەستێرەناسی لە بابەتی پیشەی پزیشکی باڵاتر بوو، پزیشکیش دەبوا لەسەر دەستی کیمیاگەران بیانخوێندبا، و پیشەکەی خۆیشی بە گوێرەی میتۆدی بیرکاری لۆژیکی پراکتیزە کردبا.

رۆشنبیرانی سەدەی نۆهەمی زایینی قایلبوون بەوەی مرۆڤ لە زمان و بیروباوەڕ و هەڵسوکەوتەکانی پابەندی پێوەرێکی پشت بە لۆژیك بەستوو بێ، هەروەها بەڕای ئەوان دەبوا هەر بەگوێرەی پێوەر هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤ بکرێ.

بنەماکانی پزیشکی لە کۆڕی زانستدا لە کۆشکی (وسیق)دا (٨٤٢-٨٤٧ز) لە پاڵ بابەتی کەلام و فیقهدا دەخوێندرا. ئەو لێکۆڵینەوانەش بەگوێرەی کتێبەکانی گالینۆس ئەنجام دەدران، جا چ پزیشکییەك پشتی بە سوننەتی بۆماوەی پێشینان یا بە ئەزموون بەستبێ، یا لە رێگەی ئەقڵەوە پەی پێ بردرابێ یا لە بابەتەکانی بیرکاری و سروشتناسی بەرێگەی پێوەری لۆژیکی، وەرگیرابێ.

### ٥- رازی:

ئەو فەلسەفە سروشتیەی کە لە بارەیەوە دواین، لەلای زانایانی سەدەی نۆیەم لە دەستەواژەی فەلسەفەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەوەش لەبەرامبەر کەلامناسیدا، ئەو فەلسەفەیە وەپاڵ فیساگۆرس دەدرا و تا سەدەی دەیەم مایەوە.

دیارترین نوێنەرانی ئەم فەلسەفەیە رازی پزیشکە (ساڵی **٩٢٣** یا **٩٣٢** مردووە)[٦٢]، رازی لە (ڕەی) لەدایکبووە و پەروەردەیەکی بیرکاریانە کراوە، پاشان پزیشکی و فەلسەفەی سروشتی بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە خوێند، بەڵام رقی لە کەلامناسی بوو، لۆژیکیشی خوێند تا لە شێوە پێوەرە پێشبینیەکانی کتێبی (پێوەر) شارەزابوو. دوای ئەوەی وەکو دکتۆر لە نەخۆشخانەکانی (ڕەی) و بەغدا دەستبەکاربوو، دەستیکرد بە گەشتکردن و سەردانی چەندین کۆشکی پاشاکانی کرد، کۆشکی مەنسوری کوڕی ئیسحاقی سامانیشی بینی[٦٣]، لە ژێر ناوی خۆیشی کتێبێکی لەبارەی پزیشکیەوە نووسی.

رازی پیشەی پزیشکی و پێداویستیەکانی توێژینەوەی ئەو پیشەییەی زۆر گرنگ دەهاتە بەرچاوان، هەروەها زۆر کاریگەربوو بەو حیکمەتەی کە چەندین سەدە بوو ئاخنرابووە ناو سکی کتێبەکانەوە، رازی ئەو حیکمەتەی زۆر لەو ئەزموونە پێ چاکتربوو کە کەسێك لە ژیانی کورتی خۆیدا بەدەستی دەهێنێ، هەروەها ئەو حیکمەتەی پێ باشتربوو لەو ئەنجامە سۆراخکارییە لۆژیکیانەی کە ئەزموون ناتوانێ بەدەستیان بێنێ.

رازی پێی وابوو دەروون لە پەیوەندی نێوان دەروون و جەستە پێگەی یەکەمی هەیە[٦٤]، هەروەها ئەو یادەوەری و ئازارەی تاك بەدەستیەوە دەناڵێنێ، دەکرێ لە میانی رووخسارەوە

---

(٦٢) أبو بکر محمد بن زکریا الرازی، کتێبە پزیشکیەکەی مەزنترین کتێبی پزیشکیە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و کراویشە بە لاتینی، رازی بە بیانوی ئەوەی لە پزیشکیدا ناکۆکی نییە تا سەدەی هەڤدەهەم لە ئەوروپا مایەوە. (و.ع).

(٦٣) أبو صالح منصور بن نوح بن نصر بن اسماعیل بن احمد بن اسد بن سامان فەرمانڕەوای خوراسان و ئەودیوی رووبار کە ساڵی **٣٦٥**ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

(٦٤) رازی دەڵێ: پێویستە پزیشك وا لە نەخۆش بکات کە ساغە و هیوای چاکبوونەوەی پێ بدات، با خۆیشی بڕوای پێی نەبێ، ڕەوشی جەستە پاشکۆی ڕەوشی دەروونە. (و.ع).

پەییان پێ ببردرێ. بۆیە بەلای رازی-یەوە دەبوو پزیشکی جەستە، پزیشکی رووحییش بێت، لەبەر ئەمەش چەند یاسایەکی بۆ پزیشکی روحی دارِشت، شتێك لە شێوەی دەروونناسی. رازی بە یاساغییەکانی شەریعەت وەك مەی خواردنەوە و ئەو شتانە دڵخۆش نەبوو. وای دەردەخست مەیلە ئارەزووبازییەکانی بووەتە هۆی رەشبینیی خۆی. رازی دەیگوت لە بووندا خراپە لە چاکە زۆرترە، هەروەها پێی وابوو چێژ هیچ نییە جگە پشوویەك نەبێت لە ئازار.

گەرچی رازی زۆری پەسەندی ئەرەستۆ و گالینۆس دەدا، بەڵام هیچ ئەزیەتێکی وەبەر خۆی نەدا بۆ قوڵبوونەوە و تێگەیشتن لە بەرهەمەکانیان، لە توێژینەوەی کیمیادا کۆششی زۆری دەکرد و پێی وابوو کیمیا پیشەیەکی راستەقینەیە و پشت بە بوونی ماددەی سەرەکی دەبەستێ.

هەروەها دەیگوت کیمیا پیشەییەکە فەیلەسوف ناتوانێ دەستبەرداری ببێت، پێشی وابوو فیساگۆرس و دیموکریتس و ئەفلاتون و ئەرەستۆ و گالینۆس کیمیاگەربوون.

رازی لەگەڵ شوێنکەوتوانی ئەرەستۆ ناکۆك بوو و دەیگوت جەستە لەناوخۆیدا هەڵگری پرەنسیپی جوڵە و بزاوتە، گەرچی رازی پێی وابوو هەر کەسێك بڕوای بەوە هەبێت و پەرەی پێ بدا، رەنگە ببێتە تیۆرەیەکی بەرهەمدار لە سروشتناسیدا.

مەزهەبی میتافیزیکی رازی پشتی بەو تیۆرەیە کۆنانە دەبەست کە هاوچەرخەکانی خۆی وەپاڵ ئەنکساگۆراس و ئەنبادۆکلیس و مانی و زۆری تریان دەدا، مەزهەبەکەی پێنج پرەنسیپی کۆنی هەبوو: باری تەعالا (خودا)، دەروونی گشتگیر، ماددەی یەکەم، شوێنی رەها، زەمەنی رەها. ئەو پرەنسیپانە بۆ بوونی ئەم جیهانە زۆر پێویست بوون. هەستە تاکەکەسیەکان ئاماژەن بە ماددەی رەها، کۆمەڵبوونی هەستە جیاوازەکانیش پابەندە بە شوێن، پەیبردن بە گۆڕانی ماددەش پابەندی کاتە، بوونی زیندەوەران مانای بوونی دەروونە، بوونی ئەقڵ لە بونەوەراندا و توانای دەستڕەنگینیان، بەڵگەیە لەسەر بوونی ئافرێنەرێك کە شتەکانی بە جوانترین شێوە خولقاندووە.

سەرەڕای ئەوەی رازی بڕوای بە کۆنی پێنج پرەنسیپەکە هەبوو، بەڵام بڕوای بە بوونی ئافرێنەرێکیش هەبوو، بگرە چیرۆکی خەڵقبوونمان بۆ دەگێڕێتەوە کە یەکەم ئافرێنراویش رووناکی روحانی پوخت و سادەیە، واتە ئەو هیولی یا ماددە رەسەنەیە کە دەروونەکانی لەسەر وەستاوە، ئەو شتەش جەوهەری روحانی نورانی سادەیە، ئەو بنەڕەتی نورانی یا هیولی نورانی یا جیهانی باڵا کە دەروونەکان لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە، بە ئەقڵ یا نوری لەخودا سەرچاوە

گرتووەوە ناودەبرێ، بەدوای ئەو رووناکیەشدا تاریکیەك دێ کە دەروونە ئەزەلیەکانی خزمەتکاری دەروونە قسەکەر و ئەقڵەمەندەکانی لێوە دروست بووە.

هەروەها هەر لەسەردەمی بوونی نوری روحانی سادەوە بوونێکی ئاڵۆز و پێکهاتوو هەیە، کە جەستەیە، لە سێبەری ئەویشدا چوار توخمەکە دروستبووە، کە ئەمانەن: گەرمی و سادی و وشکایی و شێ. هەموو جەستە باڵا و نزمەکانیش لەم چوارە توخمە پێکهاتوون، هەموو ئەوانەش لە ئەزەلەوە هەن، زەمەن پێشیان ناکەوێ، چونکە خودا هێشتا نەبووبوو بە ئافرێنەر.

خودی قسەکانی رازی بەڵگەی روونن لەسەر ئەوەی رازی ئەستێرەناس بووە و پێی وابووە تەنە ئاسمانیەکان لە هەمان ئەو توخمانە دروستبوون کە تەنە سەرزەمیینەکانی لێ پێکهاتووە و ئەمەشیان هەمیشە لە ژێر کاریگەری تەنە ئاسمانیەکاندایە.

## ٦- رۆژگارباوەڕی (الدهریه):

رازی بەو قسانەی لە دوو لاوە رەخنەگرێکی هێرشبەرانە بووە: لەلایەکەوە هێرشی کردۆتە سەر یەکتاپەرستی ئیسلامی کە یەکتاپەرستی ئیسلامی نکۆڵی لە بوونی شتگەلی کۆنی وەك دەروون یا ماددەی یەکەم یا زەمەن و شوێن دەکات لە پاڵ خودادا. کە رازی بانگەشەی ئەو شتانەی کردوون، لەلایەکی دیکەوە هێرشی کردۆتە سەر مەزهەبی رۆژگارباوەڕی کە بڕوای بە ئافرێنەری گەردوون نییە.

زۆرجار نوسەرانی موسڵمان باسیان لە مەزهەبی رۆژگارباوەڕی کردووە، هەڵبەت یەکتارپەرستی ئەوانیان رەتکردۆتەوە، هەروەها دەیانگوت گەرچی لەلای زۆر کەسەوە ئەو مەزهەبە قبوڵکراوە، بەڵام لایەنگری گرنگ و بەرچاویان نەبووە.

رۆژگارباوەڕەکان (ب١، ف٢، ق٣) بە مەتریالیست یا هەستباوەڕان یا نکۆڵیکەرانی ئافرێنەر یا ئەهلی دۆنادۆن و ئەو جۆرە ناوانە نێوبراون، بەڵام لەبارەی بیروباوەڕەکانیانەوە شتێك لەوە وردتر نازانین. مەسەلەکە هەر چیەك بێ رۆژگارباوەڕان هەستیان بە پێویستی ئەوە نەکردووە هەموو شتەکانی (بوون) وەپاڵ یەك بنەمای داهێنەری لە ماددە بەدەر بدرێن، بەڵام ئەوانەی هەستیان بە پێویستی ئەو شتە کردووە، ئەو فەیلەسوفە موسڵمانانە بوون کە هیچ رێگەیەکی خۆقوتارکردنیان لەو پرەنسیپە نەبوو، ئەوەش بۆ ئەوەی فەلسەفەکەیان تارادەیەك لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا بگونجێ. فەلسەفەی سروشتی بۆ ئەو مەبەستە گونجاو نەبوو، چونکە ئەو فەلسەفەیە پتر گرنگی بەو رووداو

جۆراوجۆر و پێکدژانە دەدا کە لە سروشتدا روویاندەدا، پتر لەوەی گرنگی بە سۆراخکردنی تاکە هۆکاری یەکەمی ئەم جیهانە بدەن. ئەوەی پتر لەوانی تر پەی بەم ئامانجە دەبرد مەزهەبی ئەرەستۆیی بوو لەبەرگێکی نویێ ئەفلاتونیدا، چونکە ئەو مەزهەبە لە تیۆرە لۆژیکیە ئیلاهیەکاندا هەموو بوونی دەگەڕاندەوە بۆ یەك بوونی بالاَ. یا دەیگوت سەرجەمی شتەکان لە پرەنسیپێکی کارای بالاَتر لە هەموو ئەو شتانە کەوتوونەتەوە.

بەلاَم بەر لەوەی بچینە سەر باسکردنی ئەو ئاراستە فیکریەی کە لەگەلَ سەرەتای سەدەی نۆیەم دەستیپێکرد، هەر دەبێ قسە لەسەر ئەو هەولَی تێکەلَکێشکردنی فەلسەفەی سروشتی بە ئامۆژگارییە ئایینییەکان بکەین، بە شێوەیەك بکرێ بە فەلسەفەی ئایین لەقەلَەم بدرێ. (ئەوەش هەولَی گرووپی ئیخوان سەفا بوو).[٦٥]

(٦٥) دهریەت واتە رۆژگار، بەلاَم رۆژگارێکی سەختی بێ کۆتا. سەیر لەوەدایە هەر یەك لە وشەی (زمەن) و (رۆژگار) لە زماندا بە مانای سەختی و لاوازی و لەنێوچوون و دەردەسەری دێن. لە ئایەتی ٢٤ی سورەتی ٤٥دا هاتووە: {وقالوا ما هی الا حیاتنا الدنیا، نموت و نحیا، و ما یهلکنا الا الدهر}، بەلای هەندێ لە موفەسرینەوە ئەم ئایەتە واتە مانەوەی جۆری مرۆیی یا دۆنادۆن. بەهەر حالَ دهر رۆژگاری رەهایە و لەنێو ناچێ، با دروستکراوەکانیش لەنێو بچن. شاعیرانی جاهیلی لە شیعرەکانیاندا دهریان بە مانای رووداوە گەردوونیەکانی وەك: رۆژگار، زەمەن، شەوگار، مەرگ، مردن، بەلاَ و تد بەکارهێناوە. هەموو ئەوانەش یەك مانایان هەیە، واتە هێزێکی نادیار کە مرۆڤ و شتەکان هەلَدەسورێنێ، دهر واتە هێزێکی ماندوکەر، مەرجیش نییە ئەم هێزە نادیارە هێزێکی پیرۆز و یەزدانی بێت و هەمیشە کارەکانی پڕ حیکمەت بن. **جاحظ لە کتێبی الحیواناتدا (ج٧- ص٥-٦ طبعة القاهرة ١٩٠٦**ز) دەلَێ، دهریستەکان بڕوایان بە ئافرێنەر و پەیامبەر و زیندووبوونەوە و پاداشت و سزا نەبووە و هەموو شتێکیان وەپالَ کرداری هەسارەکان داوە و جگە لە چێژ و قازانج نەبێت، چاکە و خراپەیان نەزانیوە. (و.ع).

## ٢- ئیخوان سەفای بەسره[٦٦]

**١- قەرامیتە:**

لە رۆژهەڵاتدا هەموو ئایینێك لە دەوڵەتێك دەچوو لەناو دەوڵەتێكی دیكەدا، حیزبە سیاسییەكان هەمیشە لە شێوەی گرووپێكی ئایینیدا دەردەكەوتن، ئەوەش بۆ ئەوەی لایەنگر و هەواداری زۆریان هەبووبا.

پرەنسیپی ئایینی ئیسلامی وایە، جیاوازی لە نێوان مرۆڤەكاندا ناكات، بانگەشەی سیستەمی تاییفی و چینی كۆمەڵایەتی ناكات، بەڵام زانست و زانیاری هەمیشە كاریگەری خۆیان بەسەرەوە هەبووە. لە ئەنجامی ئەوەشدا پلە و پایەی خوداپەرستی و ئاستی رۆشنبیری دارێژرا، بەرادەی ئەوەش رێگە بە گرووپ و پارتەكان دران، گرووپی نهێنی دروستبوون كە لە چینی جیاواز و هەمەچەشن پێكهاتبوون، چینی بەرز و چینی خوارتر بیروباوەڕێكی نهێنییان هەبوو، زۆرێك لەو بیروباوەڕانەش لە فەلسەفەی سروشتی نوێ فیساگۆرسیەكان وەرگیرابوون.

ئەو گرووپانە هەوڵی گەیشتن بەدەسەڵاتی سیاسییان دەدا، لەو پێناوەشدا سودییان لە هەموو ئامرازێك وەردەگرت، لایەنگرانیان بە قازانجی بەرژەوەندییەكانی خۆیان تەفسیری قورئانیان دەكرد، بەڵێ، حیكمەتی ئەو نهێنیەشیان دەگەڕاندەوە بۆ پەیامبەران، ئەوانەی ناویان لە قورئان و تەوراتدا هاتووە، بەڵام لە پشتەوە چەند فەیلەسوفێكی بتپەرست هەبوون.

---

(٦٦) ناویان لەخۆ نابوو ئیخوان سەفا هاوڕێیانی وەفا، ئەهلی داد و سوپاسگوزاری، ئەمانە وەكو خۆیان دەیانگوت گرووپێكن هاوڕێیەتی و نزیكایەتی كۆی كردوونەتەوە و پشت ئەستورن بە پیرۆزی و پاكژی و ئامۆژگاری. لەسەدەی چوارەمی كۆچیی لە بەسرە دامەزراون و رێچكەیەكی دیاریكراویان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە و پێیان وایە شەریعەت بە شەبەنگ پیس كراوە و تێكەڵ بە گومڕایی كراوە، ئەمانیش دەیانویست بەهۆی فەلسەفەوە پاكژی بكەنەوە، چونكە وای بۆ دەچوون هەركات فەلسەفەی یۆنانی و شەریعەتی ئیسلامی تەبا بن، كەماڵ وەدی دێت. (و.ع).

فەلسەفە لەسەر دەستی دامەزرێنەرانی ئەو گرووپە نهێنیانە، گۆڕا بە خەونێکی سیاسی، هەندێ لە بیرمەندانی تیۆری پێیان وابوو ئەستێرە و هەسارەکان خاوەن دەسەڵات و ئاوەزی باڵان، ئەو شتەش لە ئادەمیزادەکاندا بەرجەستەبووە بۆ بەڕێوەبردنی سیاسەتی پراکتیکیانەی دونیا. ئیدی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد هاوکاریکردنی ئەو ئەقڵ و ئاوەزانە لە سەقامگیرکردنی دەوڵەتێکی دادپەروەر لەسەر زەوی، ئەرکێکی ئایینییە. شیاوترین شت کە بکرێ لە بارەی ئەو گرووپانەوە بوترێ، ئەمانە لەو گرووپانەی سەردەمی سان سیمۆن[٦٧] دەچوون کە کەڵکیان لە دیاردەکانی سەدەی نۆزدە وەردەگرت، ئەو چەشنە گرووپانە هەمیشە لەو وڵاتانە دروست دەبن تەنگ بە ئازادی فیکر هەڵچنراوە.

عەبدوڵڵای بن مەیمون[٦٨]، رێبەری تیپی قەرامیتە، دامەزرێنەری بزووتنەوەیەکی لەو چەشنەیە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆیەم، ئەو پیاوە بەرچەڵەك فارسە، پسپۆڕی نەخۆشییەکانی چاو بووە و لەسەر مەزهەبی فەیلەسوفە سروشتباوەڕەکان پەروەردە بووە و توانیویەتی ئەهلی باوەڕ و ئەهلی بێ باوەڕان لێك نزیك بکاتەوە.

جا حیزبێکی لێ دروستکردن کە کاری بۆ رووخاندنی دەوڵەتی عەبباسی دەکرد، هەندێ کەسی بە نیشاندانی سیحر و جادوو و کاری سەروئاسایی بەلای خۆدا رادەکێشا، و هەندێ کەسی دیکەیشی بەناوی زوهد و پەرستش و زانستی فەلسەفی بەلای خۆیدا رادەکێشا،

---

(٦٧) سانت سیمۆن Saint Simon سۆسیالیستێکی فەرەنسییە،ساڵی ١٧٦٠ز لە پاریس لەدایکبووە، ساڵی ١٨٢٥ هەر لە پاریس مردووە، دامەزرێنەری سۆسیالیزمی فەرەنسییە، بیروبۆچوونە بنەڕەتییەکانی دژی شۆڕشی فەرەنسی و رەوتە جەنگیەکانی ناپلیۆن بوو. سانت سیمۆن گەرەکیبوو سەرمایەدار و خاوەن کارگەکان فەرمانڕەوای کۆمەڵگەکان بن و ئاراستەکەری روحی کۆمەڵگە لەدەستی کلیسا دەربهێنرێ و بدرێتە دەستی زانایان و هەموو لایەکیش کۆکبن لەسەر رەتکردنەوەی جەنگ و رێکخستنی کاری بەرهەمهێنەرانە لەسەر دەستی پیاوانی لێهاتوو، هەروەها بابەتی هەژاریشی تاوتوێکردووە، بەلای ئەوەوە پێویستە کۆی کۆمەڵگە لەهەوڵی باشترکردنی رەوشی چینی هەژاران بن لەهەردوو رووی ئاکاری و جەستەییەوە. (و.ع).

(٦٨) عبداللە بن میمون القداح (ساڵی ٢٦١ی کۆچیی مردووە)، باوکیشی ناوی ابا شاکر میمون بن دیصان بوو کە خاوەنی کتێبی (المیزان فی نصرە الزندقە)، لە بنەچەدا خەڵکی شارۆچکەیەکە نزیك ئەهواز، بۆیە پێیشی دەوترێ عبداللە بالقداح چونکە چارەسەری چاوی دەکرد. شوێنکەوتوانیشی: حمدان قرمگ و محمد بن الحسینە. قەرامیتەکان لە چەندین بواردا پشێوی و ئاژاوەیان نایەوە. (و.ع)

ئالآكەی رەنگی سپی بوو، چونكە پێی وابوو ئایینەكەی لە رووناكیەكی بێگەرد پێكهاتووە و ئەو دەروونانەی ئەم زەوییە جێ دەهێڵن دەگەڕێنەوە لای ئایینەكەی ئەو. لەگەڵ جەستە و ماددیگەرایی ناكۆك بوو، داوای برایەتی هاوبەشی سەرجەم ئەندامانی گرووپەكەی دەكرد لە خێر و بێرەكاندا! هەروەها بانگەشەی ئەوەی دەكرد ئەندامان لە پێناو گرووپەكەدا خۆیان بكەنە قوربانی و تا مردن مرۆڤ لایەنگر و ملكەچی سەرۆكەكەی بێت، چونكە ئەو گرووپەی ئەو پێكیهێنابوو چین لەسەر چین بوو، لەسەر قوربانی و ملكەچی بەڕێوە دەچوو، پلە و پایە و پێگەی بوون لای ئەم گرووپە بەم شێوەیە بوون: خودا، ئەقڵ، دەروون، شوێن جا زەمەن، بەگوێرەی ئەم پێگە و پایانەش پێیان وابوو روخساری ئیلاهی تەنها لە گەردووندا دەرناكەوێ، بەڵكو لە سیستەمی پلە هەمەچەشنی گرووپەكەشیاندا دەردەكەوێ.

## ٢- ئیخوان سەفا و پەیامە فەلسەفیەكەیان:

مەڵبەندی مەزنی چالاكی قەرامیتە لە بەسرە و كوفە بوو، لە نیوەی دووەمی سەدەی دەیەمی زایینی لە بەسرەدا گرووپێكی بچوكی چوار چین دەبینین، بەڵام بە وردی رادەی سەركەوتنی ئەو ئیخوانانە نازانین لە هێنانەدی ئەو نموونە باڵآیەی كە لە دابەشكردنی گرووپەكەیان هەوڵیان بۆ دەدا، چینی یەكەم گەنجەكان بوون كە تەمەنیان لە نێوان پانزە ساڵی بۆ سی ساڵان دەبوو، دەروونی ئەم چینە بە شێوەیەكی سروشتی پێكهاتبوو، هەروەها لەبەر ئەوەی قوتابی بوون دەبوو ملكەچ و پابەندی یەكجارەكی مامۆستاكانیان بن. بەڵام چینی دووەم ئەو پیاوانەبوون كە تەمەنیان لە نێوان سی بۆ چل ساڵیدا بوون، دەرگای حیكمەتی دونیایان بەروودا ئاوەڵابوو، هەروەها زانیاریان لەمەڕ هەموو شتێك وەردەگرت. چینی سێیەم ئەو كەسانە بوون تەمەنیان لە نێوان چل بۆ پەنجا ساڵیدا بوو، ئەمانە بە گوێرەی پلە و پایەكەیان بە تەواوەتی شارەزایی یاسای یەزدانی بوون. ئەمانە لە ریزی پەیامبەراندا بوون.

پیاوانی سەرووی پەنجا ساڵیش دەچوونە پلەیەكی باڵآتر. حەقیقەتی شتەكانیان وەكو خۆی دەبینی، وەكو فریشتە پیرۆزەكان. لەو پێگەیەشدا دەكەوتنە سەرووی سروشت و شەریعەت و یاساوە.

دوایین شت لەبارەی پەیامی ئەو گرووپەوە پێمان گەیشتبێ ئەوەیە پەیامەكەیان لە ئینسكلۆپیدیایەكی سەرتاپاگیر دەچوو كە سەرجەم زانستەكانی ئەو چەرخەی لە خۆ دەگرت و بە گوێرەی برایان و ئاستی زانیاری و زیرەكیان رێكخرابوو. ئەو پەیامە لە پەنجا و یەك پەیامی

(ڕەنگە لە بنەڕەتدا پەنجا بووبێ) هەمەجۆری بابەت و سەرچاوە پێکهاتبوو، بە شێوەیەك ئەوانەی دانانی ئەو پەیڕەو پرۆگرامەدا بەشداریان کردووە یا کۆیان کردۆتەوە نەیانتوانیوە بەتەواوەتی ئەو زانیارییە کۆکراوانە پێك بگونجێنن. بە گشتی لەو ئینسکلۆپیدیایەدا گسنویەك هەبوو کە لە سەرجەم مەزهەبەکانەوە وەرگیرابوو، کۆڵەکەکانی لەسەر زانستی سروشت هەڵچنرابوو، لە پشت ئەمەشەوە مەبەستی سیاسی هەبوو.

ئیخوان سەفا بەلەبەرچاوگرتنی بیرکاری و یاریکردن بە ژمارە و پیتەکان فەلسەفەکەیان ڕاگەیاند، دوای ئەوەی چوونە سەر لۆژیك و سروشت، هەموو شتێکیان دەگەڕاندەوە بۆ دەروون و هێزی دەروون، لە بانگەشەکانیاندا بەردەوامبوون تا دواجار بەشێوەیەکی سۆفیئاسایانە و سیحریانە لە ناسینی خودا نزیك بوونەوە. لە بیروباوەڕەکانیاندا وا دەردەکەوتن گرووپێکی چەوساوەن، جاروباریش ڕووبەڕووی ناکۆکی سیاسی دەبوونەوە و لەمیانی ئەو ناکۆکیانەشدا چەشتنی ئازار و تێکۆشانی خاوەنی ئەو پەیامانە و سەرکوتی خۆیان و پێشانیان دەبینین. هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێ ئەو ئومێدەی لە دەروونیاندا هەبووە و ئەو لێبوردەیی و سنگفراوانیەی بانگەشەیان بۆ کردوە، واتە لەم فەلسەفەیە ڕوحیەیاندا ئارامیەکیان بوو بۆ دەروون چنگ کەوتووە، واتە خۆیان پێ پاکژ کردۆتەوە، واتە ئەو فەلسەفەیە ئایینیان بووە.

ئەوان بانگەشەی (دڵسۆزی تا مردن)ـیان دەکرد. ڕووبەڕووبونەوەی مەرگ لە پێناو چاکسازی ئیخوان لای ئەوان جیهادێکی ڕاستەقینە بوو، هەروەها ئەوان حەجکردن بۆ مەککەیان بە نموونەیەك دادەنا کە خودا هێناویەتیە بۆ گەڕانی مرۆڤ بەسەر زەویدا. بۆیە بە ئەرکی مرۆڤییان دادەنا کە بەوپەڕی توانا هاوکاری براکەی بکات، هەروەها دەبوو ساماندار بەشێك لە سامانەکەی بدات بە هەژاران، زانا برا نەزانەکەی فێر بکات، گەرچی —وەکو لە پەیامەکەیاندا دیارە- زانست تەنها تایبەتە بە چینەکانی سەرەوەی گروپەکەیان.

وا دەردەکەوێ ئیخوان سەفای بەسرە و لقی گرووپەکەیان لە بەغدا ژیانێکی ئارام ژیاون، پێدەچێ پەیوەندی ئیخوان سەفا بە قەرامیتەکان لە پەیوەندی لایەنگرانی تەعمید بە شوێنکەوتوانی (مەلیکی سەهیۆنی) بچێ کە جەنگ و شۆڕشیان بەرپاکرد و بانگەشەی دووبارە تەعمیدکردنەوەیان دەکرد.

ئیخوان سەفاکانی دواتر، دەگێڕنەوە کە ئەوانەی بەشداری دانانی ئینسکلۆپیدیاکەیان کردووە: ئەبا سولەیمان محەممەد بن معشر البستی ناسراو بە موقەددەسی و، ئەبا الحسن عەلی بن هارون الزنجانی و، محەممەد بن ئەحمەد النهر جوزی و، عەوفی و، زەید بن رفاعە. لە ڕۆژگاری

دەرکەوتنی ئەو ئیخوانانە خەلافەتی عەبباسی لە نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی ناچاربوو دەستبەرداری یەکجارەکی دەسەڵاتی سیاسی خۆی بێت بۆ بنەماڵەی بەنی بویەی شیعی، دەشێ ئەوەش شتێکی گونجاو بووبێت بۆ دەرکەوتنی ئەو ئینسکلۆپیدیایە تا مەزهەبی شیعی و موعتەزیلە و بەرهەمە فەلسەفیەکان کۆبکاتەوە و لە هەموو ئەوانەش مەزهەبێك دابمەزرێنن بۆ هەمووان گونجاو بێ.

### ٣- ڕەوتی پێکەوەنان یا خواستن (Eclecticism):

ئیخوان سەفا لە مەزهەبەکەیاندا دان بە (پێکەوەنان) دەنێن، واتە خواستن لە هەموو مەزهەبە جیاوازەکان[٦٩]، ئەوانە دەیانویست حیکمەتی سەرجەم گەل و ئایینەکان کۆبکەنەوە، پەیامبەری ئیخوان سەفاش ئەمانە بوون: نوح و ئیبراهیم و سوکرات و ئەفلاتون و زەردەشت و عیسا و محەممەد (ص) و عەلی، ئەوان ڕێزی سوکرات و عیسا و حەوارییەکانی عیسا و نەوەکانی عەلییان دەگرت و بەشەهیدی پاکیان دەزانین کە لە پێناو بیروباوەڕە ئەقڵانیەکانیان شەهید بوونە. هەروەها پێیان وابوو شەریعەت بۆ هەمووانە و دەرمانی دەروونە نەخۆش و لاوازەکانە، بەڵام خۆراکی ئەقڵە بەهێزەکان، حیکمەتێکی قوڵی فەلسەفییە.

ئاکامی جەستە مردنە، مردنیش لەلای ئەوان مانای زیندوبوونەوەی روحی مرۆڤەکانە، تا ژیانێکی رووحی پاك بژین، ئەوەش مافی ئەو کەسانەیە کە لە ژیانی سەرزەمیندا تیڕوانینی فەلسەفی لە خەونی نەزانی و بێ ئاگای بە ئاگایی هێناون، ئەوانە زۆر جەختیان لەسەر ئەو ئەفسانە و ئوستورانە دەکرد کە لە یۆنانییەکان و جولەکە و مەسیحیەکانەوە یا لە مەزهەبە فارسی و هیندییەکان وەرگیرابوون.

ئیخوان سەفا هەموو شتە کاتی و ساختەکانی ئەم جیهانەیان بەهێمای شتێکی تر لە جیهانێکی تر دادەنا، هەوڵیان دەدا ئایینی کلاسیکی بەجێماو و بیروباوەڕە ساویلکانەکانی

---

(٦٩) ئیخوان سەفا دەڵێن: "بەگشتی نابێ برایانمان دەست بە زانستێکەوە بگرن یا کتێبێك لە کتێبەکان فەرامۆش کەن یا دەمارگیر بن بۆ مەزهەبێکی دیاریکراو لە مەزهەبەکان، چونکە روانگە و رێچکەکەی ئێمە سەرجەم مەزهەب و زانستەکان لەخۆ دەگرێ" رسائل ج٤ ص ١٠٥. (و.ع).

فەلسەفەی روحی و زانیارییە مرۆییەکان لە ناو ببەن، مەبەستی فەلسەفەکەی ئەوان ئەوەبوو بەگوێرەی وزەی مرۆیی دەروون بەخودا بچوێنن.

ئیخوان سەفا کەمێك بیروباوەڕە رەخنەگرانەکانی خۆیان لە پەیامەکەیاندا دەشاردەوە، ئەوەش لەبەر هەندێ هۆکاری روون و ئاشکرا، گەرچی هەڵمەتەکەیان بۆ سەر کۆمەڵگە و ئایینە کلاسیکیەکان لە کتێبی (ئاژەڵ و مرۆڤ)دا دەردەکەوێ، لەوێدا بەرگێکی سیمبولیانە بەبەر بیروباوەڕەکانیاندا کردووە، هەموو شتێکی دەمی مرۆڤیان لەسەر زمانی ئاژەڵ دەردەبڕی تا گومانی لەسەر بوروژێنن.

## ٤- زانست:

لەبەر ئەوەی ئیخوان سەفا لە هەموو مەزهەبەکانەوە شتیان خواستووە و فەلسەفەکەیان بەبێ لەبەرچاوگرتنی میتۆدێکی باش خستەروو، بۆیە ئەستەمە وێنەیەکی سەرتاپاگیری پتەو و رێکوپێك بخەینەروو. هەرچیەك بێ گرنگترین بیروباوەڕی فەلسەفەکەیان تا ئێستا هیچ پەیوەندییەکی توندتۆڵیان نییە، تا بیخەینە روو، با ئەو خستنەرووە لێك هەڵوەشاندنەوە بێت و ئاسانیشی بکەینەوە.

ئیخوان سەفا پەیامەکەیان لە بواری چالاکی ئەقڵیدا دابەشکردە سەر زانستەکان، پیشەسازی. زانست وێنەیەکی ئاشکرایە لە دەروونی زانادا، یا نموونەیەکی بوونە، زانست باڵاترین و گرنگترین بوونی ئەقڵانی ماددی وەدیهاتووی دەرەوەیە، بەڵام پیشەسازی دەرخستنی ئەو وێنەیەیە کە لە هزری پیشەکاردایە و لە شێوەیەکی ماددیدا دایدەڕێژێتەوە.

زانست لە دەروونی قوتابیدا بەشێوەیەکی خامۆش هەیە، ئەو زانستەش نابێتە زانستێکی کارا مەگەر بە کاریگەری و رێنمایی مامۆستا نەبێت، ئەو زانایەی زانین بە کردار لە مێشکی خۆیدا دادەنێ. بەڵام ئەی زانین لە کوێوە بۆ یەکەم مامۆستا هاتووە؟ ئیخوان سەفا باسی بیروبۆچوونی ئەو فەیلەسوفانەیان دەکرد کە پێیان وابوو زانا بە تێڕامان و هزری خۆی زانین بەرهەمدەهێنێ، هەروەها باسی بیروبۆچوونی ئەو کەلامناسانەیان دەکرد کە دەیانگوت زانا زانینەکەی لەوەحیەوە وەردەگرێ، بەڵام رای خۆیان ئەوەبوو زانست رێگە و شێوازی جیاوازی هەیە، تا دەروون لە پلەی نێوان جیهانی جەستە و جیهانی ئەقڵدا بێت، زانینی مرۆڤ بە زانیارییەکان لە سێ رێگەوە دەبێت، یەکەمیان لە رێگەی هەستەکانەوە دەروون دەزانێ چ

شتێك لە جەوهەری دەروون پوچترە، لە ڕێگەی لۆژیکەوە دەزانێ چ شتێك لە دەروون باڵاتر و چاکترە، پاشان لە ڕێگەی تێڕامانی ئەقڵیەوە خۆی و جەوهەری خۆی دەزانێ یاراستەوخۆ پەی پێ دەبات.

خۆناسینی دەروون پتەوترین و باشترین جۆری زانینە، گەر مرۆڤ هەوڵیدا واوەتر لەوە بچێ لە چەندین ڕووەوە خۆی کۆت و بەندی دەکات، بۆیە پێویستە مرۆڤ لە فەلسەفاندندا سۆراخی بابەتی وەك دروستبوونی جیهان و کۆنی و نەمری جیهان بکات، بگرە پێویستە مرۆڤ هێزی خۆی تاقی بکاتەوە کە لەوە ئاسانترە. دەروون ناتوانێ لە ناسینێکی بێ خەوشی خودا، بچێتە پێش، مەگەر بە زوهد و پشتکردنە دونیا و کاری چاك نەبێت.

**٥- بیرکاری:**

دوای ئەوەی قوتابی، زانستگەلی زمان و شیعر و مێژوو وەردەگرێ، کە ئەمانە زانستی ئایینی نین و دوای ئەوەی زانستە ئایینیەکان و مەزهەبە کەلامیەکانیش وەردەگرێ، پێویستە دەست بە خوێندنی فەلسەفە بکات لە دەستپێکیشەوە بە بیرکاری. لێرەدا دەبینین ئیخوان سەفا هەموو شتێکیان لەسەر شێوەی هیندییەکان و مەزهەبی نوێ فیساگۆرسیەکان تاوتوێ کردووە، بۆیە گەمەیەکی زۆر هەزرەکارانەیان بە ژمارە و پیتەکان دەکرد، واتە (٤×٧)، هەروەها لە بری ئەوەی بەشێوەیەکی واقیعیانە دیراسەی شتەکان بکەن، لە هەموو زانستەکاندا جڵەویان بۆ خەیاڵ شل دەکرد، ئەوەش بە گوێرەی پێوەرە زمانیەکان و پەیوەندی نێوان ژمارەکان.

ئیخوان سەفا لە زانستی ژمێرەدا لە ژمارەیان نەدەکۆڵیەوە وەکو ئەوەی هەیە، بەڵکو لە سۆنگەی مانا و تایبەتمەندییەکانیەوە لە ژمارەیان دەکۆڵیەوە، هەروەها هەوڵیان نەدەدا بە شێوەیەکی بیرکاریانە و ژمارەییانە گوزارشت لە شتەکان بکەن، بەڵکو بەشێوەیەك پاساوی شتەکانیان دەدا کە بگونجێ لەگەڵ سیستەمی ژمارەکاندا. ژمارەناسی لای ئیخوان سەفا زانستێکی ئیلاهی بوو، زانستێك باڵاتر لە زانستی شتە بەرهەستەکان، چونکە بەرهەستەکان لەسەر شێوەی ژمارە دروست دەبن و بنەمای ڕەها بۆ هەر شتێکی ماددی یا زەینی ژمارە(یەك)ـە، بۆیە ژمارە کۆڵەگەی هەموو فەلسەفەیەکە، لە سەرەتا و لە ناوەند و لە کۆتاییەکەشیدا.

بەڵام ئەندازەناسی بە شێوە بینراوەکانیەوە، تەنها هۆکارێکە تێگەیشتن لە فەلسەفە بۆ کەسانی تازەکار ئاسان دەکاتەوە، تەنها ژمێرە، زانستی ئەقڵی راست و دروستە. بەڵام لە ئەندازەشدا ئەندازەی هەستەکی هەیە کە بابەتەکەی هێڵ و رووپەرە، هەروەها ئەندازەی ئەقڵیش هەیە کە بابەتەکەی رەهەندی درێژ و پانی و قوڵی شتەکانە. مەبەستیش لە ژمێرە و ئەندازە رێنماییکردنی دەروونەکان و گۆڕینی بەرهەستەکانە بۆ شتی ئەقڵانی.

ئەندازە و ژمێرە وامان لێدەکەن لە ئەستێرەکان رامێنن. لێرەدا واتە لە ئەستێرەناسیدا لای ئیخوان سەفا تیۆرەی خەیاڵی دەبینین، کە پێکدژن لەگەڵ یەکتر.

جگە لەوەش چاوەڕوانی هیچی تر ناکرێ، ئەوان لە هەموو ئەو شتانەی بڕوایان پێی هەبوو، پێیان وابوو ئەستێرەکان پێشبینی ئایینده دەکەن، بگرە پێیانوابوو هەر بەراستی کاریگەرییەکی راستەوخۆی بەسەر هەموو ئەو شتانەوە هەیە کە دەکەونە ژێر خولگەی مانگ. هەروەها پێیان وابوو خۆشبەختی و کامەرانی بونەوەران و بەهەرستەکانیان لە ئەستێرەکانەوە سەرچاوە دەگرن، هەسارەی موشتەری و زوهرە و خۆر سەرچاوەی کامەرانین، زوحەل مەریخ و مانگ سەرچاوەی بەدبەختین، بەڵام عەتتارد تێکەڵەیە، هەم سەرچاوەی خۆشبەختی و هەم سەرچاوەی بەدبەختیە و چاکە و خراپەی زانست و زانیاریش بۆ مرۆڤ دێنێ.

هەموو هەسارەکان بەشێوەیەك لە شێوەکان کاریگەری خۆیان بەسەر مرۆڤەوە هەیە، ئەگەر مرۆڤ بە پاڕانەوە چارەسەری نەکات، ئەوە دەکەوێتە ژێر کاریگەری سەرجەمی تەنە ئاسمانیەکان دانە دانە، مانگ هاوکاری لەش دەکات بۆ گەشە و نەش و نما، عەتتارد ئەقڵ گەشە پێدەدات، پاش ئەوانە مرۆڤ دەکەوێتە ژێر کاریگەری زوهرە، خۆریش سەرچاوەی نیعمەتی منالّ و سامان و پلەوپایەیە، مەریخیش ئازایەتی و بوێری و سەربەرزی بە مرۆڤ دەبەخشێ، پاشان بە رێنوێنی مشتەری ئامادە دەبێت بۆ گەشت بەرەو ژیانی دوایی، ئەوەش بە پەرستش، جا لە ژێر سایەی زوحەلدا ئارام دەگرێ و پشوو دەدات.

بەڵام زۆرینەی خەڵکی تەمەنیان ئەوەندە درێژ نابێت، یا بۆیان نارەخسێ بەبێ پشێوی، فەزیلەتەکانی سروشت تەواو بکەن، بۆیە خودا نەرمونیانیان لەگەڵ دەکا و پەیامبەریان بۆ دەنێرێ، ئەگەر بە گوێرەی ئامۆژگارییەکان هەڵسوکەوتیان کرد ئەوە لە ماوەیەکی کورتدا فەزیلەتی دەروونیان تەواو دەکەن، با تەمەنیان کورت بێ یا هەلومەرجی ژیانیان لەبار نەبێت.

**٦- لۆژیك:**

لۆژیك، لەلای ئیخوان سەفا، خزمایەتیەكی نزیكی لەگەڵ بیركاری هەیە، بیركاری لە بەرهەستەكانەوە دەمانگەیەنێ بە ئەقلانیەت، بەڵام لۆژیك دەكەوێتە نێوان زانستی سروشتی و زانستی ئیلاهی، ئەوەش لەبەر ئەوەی زانستی سروشتی لە جەستەكان دەكۆڵێتەوە، بەڵام ئیلاهیات لە روحانیەتی پوخت دەكۆڵێتەوە، كەچی لۆژیك لە مانا ئەقلانیەكانی ئیلاهیات و لە وێنە دەروونیەكانی سروشتناسی دەكۆڵێتەوە، بەڵام لۆژیك لە پلە و پایە و لە بابەتدا لە ژێر بیركارییەوەیە، چونكە بابەتی بیركاری تەنها ئەڵقەی پەیوەندی نێوان بەرهەست و شتە زەیینیەكان نییە، بەڵكو جەوهەری هەموو (بوون)ــە، لە كاتێكدا لۆژیك زۆر بێ توانایە لە وێنە زەینیەكانی نێوان بەرهەست و شتە زەیینیەكان. نموونەی شتەكان ژمارەكانن، بەڵام نموونەی وێنە و ماناكان شتە بەرهەستەكان.

لۆژیكی ئیخوان سەفا لەسەر بنەمای پێشەكیەكەی فرفۆریۆس و كەتەگۆریەكان و كتێبی شیكاری و ئەنالۆتیكای ئەرەستۆ دامەزراوە. لۆژیكەكەشیان هیچ داهێنانێكی تێدا نەبوو، گەر هەبوویێش زۆر كەمە.

ئیخوان سەفا دەستەواژەیەكی دیكەیان خستە سەر پێنج دەستەواژەكەی فرفۆیۆس كە دەستەواژەی (تاكەكەس بوو)، لەو شەش دەستەواژەیەشەوە سێ دانەیان ئاماژەبوون بەبەرهەستەكان: رگەز، جۆر و تاكەكەس. سێ دانەكەی دیكەش ئاماژەبوو بە مانا: جیاوازی و تایبەتمەندی و رواڵەت (accident)..

دە كەتاگۆریەكە ناوی رەگەزەكان، یەكەمیان جەوهەرە و نۆیەكەی دیكەش روخسار و رواڵەتی ئەو جەوهەرەن. پاشان ئیخوان سەفا (بەبەكارهێنانی پۆلینكاری جۆرەكان) سیستەمی چەمك و كەتەگۆریە گشتیەكانیان تەواوكرد.

لە پاڵ ئەو پۆلینكردنەش سێ میتۆدی لۆژیكی دیكە هەبوو، ئەویش شیكاری و پێناسەكردن و سەلماندن، شیكاری میتۆدی تازەكارانە، چونكە پەیوەستە بە زانینی كاروبارە بەشەكیەكانەوە، بەڵام پێناسەكردن و سەلماندن وردتر و روونتر و دەرخەری شتە زەیینیەكان بوون، بەهۆی پێناسەكردنەوە حەقیقەتی جۆرەكان دەناسین، بە سەلماندنیش حەقیقەتی رگەزەكان دەناسین.

هەستەکان بوونی ماددیانەی شتە بەرهەستەکانمان پێ دەناسێنن، بەڵام ماهیەت و حەقیقەتی شتە ماددیەکان بە تێڕامان و بیرکردنەوە پێیان دەگەین. ئەو مەعریفەیەی لە ڕێگەی هەستەکانەوە پێیان دەگەین زۆر کەمن، ئەو زانیاریانە بەبەراورد بە زانیارییە ئەقلانیەکان وەکو ئەو پیتانەیە کە ناویان لێ پێکدێت. ئەو حوکمانەی کە ئەقڵی مرۆیی لەو پرەنسیپە ئەقڵیانە بەرهەمیان دێنێ باڵاترین جۆری مەعریفەن، مەعریفەیەکی هەڵێنجانیە کە ئەقڵ خۆی بەدەستیان دەهێنێ و جیاوازیشە لەو مەعریفەیەی کە لە خۆرسکەوە یا لە وەحی ئیلاهیەوە بەدەست دێ.

### ٧- جیهان و خودا:

جیهان هەمووی لە خوداوە سەرچاوەی گرتووە، واتە بونەوەری باڵا، پاك و بێگەرد، بەدەر لە کەسیبوون و پێکدژی، تەنانەت پێکدژی نێوان جەستەیی و روحیش، ئەوەش لە ڕێگەی لێوەدەرچوونەوە (صدور)، ئەگەر ئیخوان سەفاش هەندێجار باسی دروستبوونیان کردبێ ئەوە هەر بە شێوازی کەلامناسان بووە، پێگەکانی (لێوەدەرچوون) (emanatio) ئەمانەن: (١) ئەقڵی چالاك، (٢) ئەقڵی پاسیڤ یا دەروونی گشتگیر، (٣) ماددەی یەکەم، (٤) سروشتی کارا کە هێزێکە لە هێزەکانی دەروونی گشتگیر، (٥) جەستەی رەها بە ماددەی دوەمیشی پێدەوترێ، (٦) جیهانی هەسارەکان، (٧) توخمەکانی جیهانی خوارەوە، (٨) کانزا و رووەك و ئاژەڵی پێکهاتوو لەو کانزایانە، ئەو هەشت جەوهەرە و خودا یا زاتی رەها کە لە هەموو شتێکدا و لەگەڵ هەموو شتێکدایە، کۆمەڵە جەوهەرەکەی یەکەم تەواو دەکەن کە هاوشێوەی نۆ ژمارەیەکە.

ئەقڵ و دەروون و ماددەی یەکەم و سروشت، جەوهەری سادەن. بەڵام لە جەستەوە جیهانی ئاڵۆزەکان دەست پێدەکات، هەموو شتێك لەم جیهانە یا ماددەیە یا زەینیە، جەوهەرە یا رواڵەت، جەوهەرەکانی یەکەم ماددە و وێنەن، رواڵەتەکانی یەکەم شوێن و جوڵە و زەمەنن، هەروەها بە گوێرەی مەزهەبی ئیخوان سەفا دەکرێ دەنگ و تیشکیشی بخەینە سەر.

ماددە یەك شتە، بەڵام بەگوێرەی فۆرم و وێنەکانی جیاواز دەبێت، بە جەوهەر دەوترێت فۆرمی ماددی ئاڵۆز، بەروخساریش دەوترێ فۆرمی ئەقڵی تەواوکاری. لەم بارەی ئەم بابەتانەوە لای ئیخوان سەفا قسەیەکی روون نابینین، بەهەرحاڵ جەوهەر لە گشتدایە نەك بەش، وێنەش پێش ماددە دەکەوێ، وەکو وێنەیەکی جەوهەری هەموو ئەو کەسانە دەترسێنێ

سەرقاڵی توێژینەوەن لە ماددەن ، بە ئارەزووی خۆی، لە جیهانی ماددەی خوارەوە هاتوچۆ دەکات، هیچ بەڵگەیەکیش نییە لەسەر بوونی پەیوەندی نێوان مادده و وێنە لە جەوهەردا، ئەو دووانە لێکتر سەربەخۆن، نەك تەنها لە زەیندا بەڵکو لە واقیعی دەرەوەشدا.

خوێنەر دەتوانێ بۆ خۆی بیرۆکەیەك لەمەڕ مێژووی سروشت بخاتەروو، وەکو ئیخوان سەفا پێیان وابوو، بۆیە هەندێ لە توێژەران بەناوی داروینیزمی سەدەی دەیەمی زایینی، وەکو ئەوانیان کرد.

بەڵێ پێیان وابوو جیهانەکانی سروشت زنجیرەیەکی هەڵکشاوی پێك بەستراون، گەرچی پەیوەندی نێوان ئەو جیهانانە لەسەر پێکهاتەیەکی جەستەیی هەموو جیهانەکان هەڵنەچنراوە، بەڵکو بە گوێرەی وێنەی ناوەکی یا خودی جەوهەر دیاری دەکرێت. وێنە زۆر بە نهێنی لە بونەوەرەکانی خوارەوە سەردەکەوێ بۆ سەرەوە، جا لەسەریشەوە بۆ خوارەوە، بەڵام ئەم هاتوچوونە بەگوێرەی یاسای ناوەکی گەشەسەندن نییە، هەروەك وێنە لە میانی هاتوچۆکەیدا لەگەڵ هەلومەرجی دەرەکیدا ناگونجێ، بەڵکو بە گوێرەی کاریگەری ئەستێرەکان دێ و دەچێ، هاتوچونەکەشی بەتایبەت لە مرۆڤدا دەوەستێتە سەر رەفتاری تیۆری و پراکتیکی مرۆڤ، بەڵام هەلومەرجی مێژووی پەرەسەندن، بەمانای تازەی ئەو وشەیە، زۆر دوورە لە زەینی ئیخوان سەفا، ئەوان بێ پەردە دەیانگوت ئەسپ و فیل پتر لە مرۆڤ دەچن نەك مەیمون، با جەستەی مەیمون پتر لە ئەسپ و فیل لە جەستەی مرۆڤ بچێت. راستیەکەی جەستە لە مەزهەبی ئیخوان سەفا پلەیەکی کەمی هەبوو، مردنی جەستەش لە دایکبوونەوەی روح بوو، تەنها روحیش ناوەڕۆکێکی کاریگەرە و جەستە بۆخۆی دروست دەکات.

### ٨- دەروونی مرۆیی:

لەوەی خستمانەروو دەبینین بیروبۆچوونەکانی ئیخوان سەفا لەبارەی سروشتەوە خەریکبوو دەگۆڕا بە توێژینەوەی دەروونی، با لێرەدا قسەکانمان بەسەر دەروونی مرۆییدا کورت بکەینەوە.

دەروونی مرۆڤ دەکەوێتە نێوەندی سەرجەم بونەوەران، هەروەك دەڵێین ***جیهان مرۆڤێکی گەورەیە و مرۆڤیش جیهانێکی بچوکە.***

دەروونی مرۆیی لە دەروونیی گشتیەوە یا دەروونی جیهانیەوە سەرچاوەی گرتووە، دەروونی تاکەکان جەوهەرێك پێکدەهێنن کە دەکرێ پێی بوترێ مرۆڤی رەها یا دەروونی مرۆیی.

هەروەها دەروونی مرۆڤ لە دەریای ماددەدا مەلە دەکات، هەر دەبێ وردە وردە ببێ بە ئەقڵ، دەروون هێزێکی زۆری هەیە کە هاوکاری دەکەن بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، باشترینشیان هێزی بیرکردنەوەیە، چونکە دەیگەیەنێت بە مەعریفە، مەعریفەش ناوکی ژیانی دەروونی.

دەروونی مناڵ لەسەرەتادا وەکو لاپەڕەیەکی سپی وایە، هیچی لەسەر نەنەخشێنراوە، هەموو ئەو شتانەی پێنج هەستەکە دەیخەنە سەری، هێزی خەیاڵ کۆیان دەکاتەوە و تاوتوێیان دەکات، ڕێڕەوی ئەو هێزەش پێشەوەی مێشکە، پاشان پاڵی پێوە دەنێت بەرەو هێزێکی بیرکەرەوە — کە مەڵبەندەکەی ناوەڕاستی مێشکە — جا ئەو هێزە بیرکەرەوەیە ئەو شتانە لێکتر جیا دەکاتەوە و باش لە خراپە دادەبڕێ و دەینێرێ بۆ یادەوەری، کە ڕێڕەوەکەی کۆتایی مێشکە، هێزی قسەکردنیش ئەو شتەی لە دەروونداپە بە وشەی دەنگدار دەری دەبڕێ، یا دەینوسێ، جا دەروون دەبێت بەخاوەنی پێنج هەستی ناوەکی لەبەرامبەر پێنجی دەرەوەکیدا.

لە هێزە دەرەکیەکاندا هێزی بیستن دەکەوێتە پێش هێزی بینین، چونکە بینین پەیوەستە بەو ساتەوەختەی کە تیایدا دەبینێ، ئەو شتەی هەستیشی پێ دەکات سەرقاڵی دەکات، بەڵام بیستن لەو شتە تێ دەگات کە پێشتر بیستویەتی، هەروەها دەتوانێ ئاوازی ئەستێرەکان ببیستێ، بیستن و بینین دوو هەستی روحین، توخمی زەمەنیش ناچێتە ناو کارەکانیانەوە.

لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە هەستە دەرەکیەکاندا لەگەڵ ئاژەڵدا هاوبەشە، بۆیە تایبەتمەندییەکانی ئەقڵی مرۆیی لە حوکمدان بەسەر شتەکان و لێکترجیاکردنەوەیان و بەکارهێنانی زمان و سەرجەم هەڵسوکەوتەکاندا دەردەکەوێ.

ئەقڵ حوکم بەسەر کاروکردەوەکاندا دەدات و بە چاك یا خراپ لە قەڵەمیان دەدات، ئیرادەش بەگوێرەی ئەو حوکمە ئاراستە دەکرێ، هەروەها پێویستە پلە وپایەی زمانیش لە کایەی زانیارییەکانی خەڵکیدا بخەینەروو، ئەو بیرۆکەیەی ناتوانین بە وشەکانی زمانێك دەری ببڕین، ناکرێ ئەو بیرۆکەیە بکرێتە بابەتی فیکر، دەستەواژەش وەکو جەستەیە بۆ مانا، کەوایە ناکرێ لێکتر سەربەخۆ بن.

بەڵام ئەستەمە ئەم بۆچوونە لەمەڕ پەیوەندی نێوان دەستەواژە و مانا لەگەڵ بیروڕاکانی دیکەی ئیخوان سەفا بگونجێنین.

### ٩- فەلسەفەی ئایین:

ئامۆژگارییەکانی ئیخوان سەفا لە دوایین فۆڕمیدا فەلسەفەی ئایینە، ئامانجەکەشی تەباکردنی زانست و ژیان، فەلسەفە و ئایینە، لەمەشدا خەڵکی زۆر لێکتر جیاوازن، عەوامی خەڵك ناتوانن پەرستنی خودا لە هەستدا کورت بکەنەوە، هەروەك چۆن دەروونی رووەك و ئاژەڵان لە دەروونی عەوامی خەڵك نزمترە، دەروونی عەوامی خەڵکیش لە دەروونی فەیلەسوفان و پەیامبەران نزمترە، فەیلەسوفان و پەیامبەران لە ریزی فریشتەکانن، گەر دەروونیش گەیشتە پێگەی باڵای خۆی دەکەوێتە سەرووی ئایینی بۆماوە بەردەوام و هەموو ئەو وێنە و شێوە هەستیارانەی کە تیایدایە.

دەشێ ئیخوان سەفا مەسیحیەت و زەردەشتیان بەدوو ئایینی نزیك لە کەماڵ زانیبێ، دەیانگوت: پەیامبەرمان بۆ گەلێکی نەخوێندەواری بەدەوی بیابانن‌شین رەوانەکراوە کە هیچ شتێکیان لەبارەی ئەم جیهانەوە نەزانیوە و نەیانتوانیوە پەی بە جیهانی دوایی ببەن، قسەکانی نێو قورئان بە وێنە هەستەکیەکانیشەوە لە ئاستی رادەی تێگەیشتنی ئەو گەلە بووە، بۆیە دەبوو ئەو کەسەی لەوانە زاناترە راڤەیەکی وای بکات سیفەتی هەستەکی لێ لاببات.

لای ئیخوان سەفا حەقیقەتێك نییە بەدەر لە خڵت و خاش، تەنانەت لە ئایینی میللەتانی دیکەشدا[٧٠].

هەروەها پێیان وابوو ئایینێکی ئەقڵانی هەیە لە سەرووی هەموو ئایینەکانەوەیە، هەوڵیشان دەدا بە شێوەیەکی ئەقڵانی و میتافیزیکی ئەو ئایینە هەڵێنجێنن. دەیانگوت لە نێوان خودا و ئەقڵی کارادا کە یەکەم بونەوەری خودایە، یاسایەکی ئیلاهی هەیە کە هەموو شتێك دەگرێتەوە، وەکو پرەنسیپی سێیەم، ئەو یاسایە هیی خودای بەبەزەییە و نایەوێ خراپە بە کەس بگەیەنێ.

---

(٧٠) پێدەچێ نووسەر مەبەستی ئەو ئایینانە بێت کە پەیوەستن بە ئیسلام و مەسیحی و جولەکە، کە دەکەونە بەرامبەر ئایینە ئەقڵییەکان. (و.ع).

ئیخوان سەفا دەیانگوت بانگەشەکردنی ئەوەی خودا تووڕە دەبێت و سزای ئاگرینی هەیە و ئەو جۆرە شتانە، شتگەلێکن ئەقڵ وەریان ناگرێ، هەروەها دەیانگوت ئەو بیروباوەڕانە دەروونی بڕواداران ئازار دەدات، پێیان وابوو دەروونی نەزانی پێشەوایان لەم دونیایە و لەهەمان ئەو جەستەیەدا بە دۆزەخی خۆی دەگات کە تێی دایە، ***زیندوبونەوە جیابوونەوەی دەروونە لە جەستە***. بەڵام هەڵسانەوەی گەورە لە رۆژی دواییدا جیابوونەوەی دەروونی گشتیە لە جیهان و گەڕانەوەیەتی بۆ لای خودا، ئەو گەڕانەوەیەش ئامانجی سەرجەم ئایینەکانە.

### ١٠- بیروڕاکانیان لەمەڕ ئاکار:

مەزهەبی ئیخوان سەفا لە ئەخلاقدا مەیلی بەلای روحانیەت و زوهددایە، گەرچی ئەو مەزهەبەیان لەسەرجەم مەزهەبەکان دروستکردووە. مرۆڤ گەر بەگوێرەی سروشتی راستەقینەی خۆی کاربکات، چاکەکارە، کاری چاکەش ئەو کارەیە کە دەروونی ئازاد و سەرپشك دەیکات، کارە باشەکان ئەو کارانەن کە لە روانگەیەکی ئەقڵانیەوە سەرچاوە دەگرن.

کاری شایان بە پاداشت ئەو کارەیە کە پابەندی حوکمی یاساکانی ئیلاهیە، بەڵام پاداشت بریتیە لە گەڕانەوە بۆ لای مەلەکوتی ئاسمان.

بەڵام بێگومان دەروون تامەزرۆی گەڕانەوەیە بۆ جیهانی سەرەوە، بۆیە خۆشەویستی باڵاترین چاکەیە، ئەو چاکەیەی ئامانجەکەی فەنابوونە لە ناو خودادا، واتە خۆشەویستی یەکەم. ئەو خۆشەویستیە لەم دونیایەدا لەسەر شێوەی لێبوردەیی بەخشندانە و بەگیانی ئایینپەروەری و رازیبوون لەسەرجەم بوونەوەراندا دەردەکەوێ، ئەو خۆشەویستیە سنگ دەمەیێنێ و دڵ لە شوێنی خۆی ئازاد دەکات و لە کۆی جیهاندا ئاشتی سەقامگیر دەکات، ئەو شتە لە ژیانی دواییدا دەروون دەبات بەرەو نوری ئەزەلی.

نابێ سەرسام بین لەوەی ئیخوان سەفا زۆر سوك سەرنجی جەستەیان داوە، ئەوان دەیانگوت مرۆڤ دەروونە، پێویستیشە باڵاترین ئاوات و ئامانجمان ئەوە بێت لەگەڵ سوکراتدا بژین و پشت بە ئەقڵ ببەستین، لەگەڵ مەسیحدا بژین کە یاسای خۆشەویستیمان فێر دەکات، بەڵام پێویستە گرنگی بە جەستەش بدەین و پلەوپایەی بەرز بکەینەوە، تا دەروون بەکاوەخۆ تیایدا دەگات بە کەماڵی باڵابوونی خۆی.

بەو روحیەتەوە ئیخوان نموونەیەکی مرۆیی بۆ کەماڵ دروست دەکەن کە تایبەتمەندیەکانیان لە تایبەتمەندی میللەتە جیاوازەکانەوە خواستووە، نموونە باڵای پیاوێکی تەواو مۆراڵی ئەوەیە: بەرچەڵەك فارس بێت، بە ئایین عەرەب بێت، بە ئەدەب عیراقی بێت، بەزرنگی عیبرانی بێت، بە میتۆد مەسیحی بێت، بە تەرکەدونیایی شامیی بێت، بەزانست یۆنانی بێت، بە تێرامان هیندی بێت، ژیانێکی سۆفیانە و ئەخلاقێکی پاشایانە و بیروباوەڕێکی رەبانی و زانیارییەکی ئیلاهی هەبێت.

**١١- کاریگەری ئینسکلۆپیدیای ئیخوان سەفا:**

بەو شێوەیە ئیخوان سەفا هەوڵیاندا ئایین و زانست تەبا بکەن، بەڵام ئەو شتە لەلای ئەهلیی ئایین و ئەهلی زانستی پەسەند نەبوو، کەلامناسان بەچاوێکی قێزەوە سەرنجی راڤەی ئیخوان سەفایان بۆ قورئان دەدا، هەروەك چۆن پیاوانی ئایینی مەسیحی ئەمڕۆ ئیدانەی راڤەکەی (کۆنت تۆڵستۆ) بۆ (ئینجیل) دەکەن. هەروەها لایەنگرانی توندڕەوی مەزهەبی ئەرەستۆ وا سەرنجی وەرگرتنی بیروبۆچونەکانی ئەفلاتون و فیساگۆرس لەلایەن ئیخوان سەفاوە دەدەن، وەکو چۆن مامۆستایەکی فەلسەفەی نوێ سەرنجی روحانیەکان و غەیبگۆکان دەدات.

گەرچی بیروباوەڕ و پەیامی ئیخوان سەفا کاریگەرییەکی زۆری کردۆتە سەر زۆرینەی رۆشنبیران، باشترین بەڵگەش ئەوەیە ئێمە دەستنوسێکی بێ ئەژماری پەیامەکانیان دەبینین کە زۆرینەی ئەو دەستنوسانەش تازەن، بیروڕاکانی ئیخوان سەفا سەرلەنوێ لەلایەن چەندین تیپ لە جیهانی ئیسلامدا دەرکەوت، وەك: باطنیة و ئیسماعیلیەکان و حەشاشیەکان و دروز و ئەوانی دیکە. حیکمەتی یۆنانی لە رێگەی ئیخوان سەفاوە توانی لە رۆژهەڵاتدا سەقامگیر ببێ، لەکاتێکدا فەلسەفەی قوتابخانەی ئەرەستۆتالیسیی خەریکبوو بێ بەرهەم بمێنێتەوە، تەنها لەو کەش و هەوا دەستکردەدا نەبێت کە ئەمیرەکان بۆیانیان رەخساندبوو.

ئیمام غەزالی فەلسەفەی ئیخوان سەفای وەلانا و بە فەلسەفەی عامەی خەڵکی لە قەڵەم دەدا، گەرچی پێی وابوو ئاساییە کە هەندێ شتی باشیشی لێوەربگیرێ، ئیمام غەزالی پتر لەوەی دانی پیا ناوە قەرزاری فەلسەفەی ئیخوان سەفایە.

زۆری تر لە ئامادەکردنی پەیامەکانیان کەڵکیان لە پەیامی ئیخوان سەفا وەرگرتووە، تا ئێستا ئەو پەیامە لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا کاریگەری خۆی هەیە، گەرچی هەندێ کەس هەوڵ

و تەقەڵلای بێ سودیان دا بۆ لەناوبردنی ئەو پەیامە، ئەوەش لە رێگەی سوتاندنی کتێبەکانیان لەگەڵ نوسینەکانی ئیبن سینادا ساڵی ١١٥٠ لە بەغدا.

## ٤- ئەرەستۆتالیستە نوێ ئەفلاتونیەکانی رۆژهەڵات.

**١- کیندی:(٧١)**

کیندی لە زۆر رووەوە پەیوەندی بە کەلامناسانی موعتەزیلە و فەیلەسوفانی سروشتی سەردەمی خۆی کردووە، ئەوانەی لەسەر رێچکەی مەزهەبی نوێ فیساگۆرسی بوون، تەنانەت کاتێك باسی ئەو فەیلەسوفانە دەکەین پێش (رازی) دەتوانین باسی (کیندی) بکەن.

گەرچی هەموو گەواهییەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کیندی یەکەم کەس بووە چووەتە سەر مەزهەبیی ویست (ئیرادە) لە ئیسلامدا (peripatetic)، لەو قسانەی دواتریش لەم بارەوە دەیانلێین رادەی راستی ئەو قسەیە پشت راست دەبێتەوە، ئەوەش بە گوێرەی ئەو زانیاریە کەمەی لە رێگەی نوسین و پاشماوەکانی ئەو فەیلەسوفەوە لەمەڕ خۆی دەیزانین، کە هیچ کەسێك نەبووە بە تەواوی گرنگی بە پاراستنی بەرهەمەکانی بدات.

کیندی ناوی (ئەبو یەعقوبی ئیسحاقی کیند)یە لە هۆزی کیندیە و عەرەب رچەڵەکە، بۆیە نازناوی (فەیلەسوفی عەرەب)ی پێدراوە، تا لەو فەیلەسوفە ناعەرەبانەی دیکە جیای بکەنەوە کە سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی حیکمەتی ئەقڵی بوون.

کیندی رچەڵەکی خۆی گەڕاندۆتەوە سەر پاشاکانی کیند، ئێمە لێرەدا کارمان بە درۆخستنەوە و پشت راستکردنەوەی ئەو قسەیە نیە. هەرچیەك بێت هۆزی کیندە کە بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ باشوری دووڕگەی عەرەب، لە هۆزەکانی دیکە شارستانیتر بوون، زۆرێك لە ئەندامانی ئەو هۆزە بەرەو عیراق هەڵکشاون و لەوێ نیشتەجێبوون. کیندی لەسەرەتاکانی سەدەی نۆیەمی زایینی لەدایکبووە، هەڵبەت لە کوفە کە باوکی ئەمیری ئەوێ بووە.

---

(٧١) بڕوانە وتارێکم لەمەڕ (کیندی و قوتابخانەکەی) ( Zu Kindi und seiner schule, in saints archive fur geschichte der philosophie, XIII, S, 158 ff.) لەو وتارەوە زۆر شتم بەبێ دەستکاری وەرگرتووە. (نوسەر).

وادەردەکەوی کیندی لەبەسرە و پاشان لە بەغدا هەندێ زانستەکانی بەدەست هێنابێ، واتە لە کۆرسەکانی سەردەمی خۆی، لێرەدا کیندی کولتوری فارس و حیکمەتی یۆنانی دەخاتە سەرووی ئایین و فەزیلەتی عەرەب. هەروەها پێی وابوو (قەحتان) باپیرە گەورەی عەرەبی باشور، برای یۆنانە کە رچەڵەکی گریگ لەوەوە کەوتوونەتەوە. دەشێ لە کۆشکەکانی بەنی عەبباسیش لە بەغدا ئەو بیروباوەڕە باسکرابێ، لەوێدا کەس گرنگی بە رگەز نەدەدا، هەمووان بەچاوی سەرسامییەوە لە یۆنانی کۆنیان دەڕوانی.

نازانین کیندی چەندە لە کۆشکی خەلافەت ماوەتەوە، ناشزانین لەوێدا پلەوپلەیەی چی بووە، دەڵێ لەوێ کتێبە یۆنانیەکانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها پێداچوونەوە و هەڵەچنی هەموو ئەو کتێبانەی کردووە کە خەڵکانی دی وەریان دەگێڕا، هەروەك ئەوەی لەگەڵ ئەو کتێبە وەپاڵدراوەی ئەرەستۆ کردی بەناوی (تیۆلۆژیای ئەرەستۆتالیس)، هەروەها ناوی چەندین هاوکار و خوێندکاری دەهێنێ کە وادەردەکەوێ لە ژێر سەرپەرشتی ئەودا خوێندوویانە، دەشێ کیندی لە کۆشکی خەلافەتدا کاری ئەستێرەناسی و پزیشکیشی کردبێ، هەروەها لە دیوانی داهاتیش کاری کردووە، گەرچی لە کۆتایی رۆژانی ژیانی بەهۆی گەڕانەوە بۆ مەزهەبی ئەهلی سوننە لە کۆشکی خەلافەت دوورکەوتۆتەوە و دووچاری دەردی ئەوانی پێش خۆی بووە، ئەمە لە رۆژگاری خەلیفە (متەوەکیلدا -٨٤٧-٨٦١ز)، سەردەمێکی زۆر کتێبەکانی یاساغ کران، لەبارەی خەسڵەت و سیفەتەکانیەوە دەڵێن زۆر قرچۆك و پیسکەبووە[(٧٢)]، ئەم جۆرە قسانە بە زۆر کەسی دیکەی هۆگری کتێب و رۆشنبیران وتراوە.

ئێمە نازانین کیندی لە چ ساڵێکدا لەدایکبووە و لە ساڵێکیشدا مردووە، وادیارە دوای وەدەرنانی لە کۆشکی خەلافەت کۆچی دوایی کردبێ، یا لانی کەم دوای ئەوەی لەوێدا پلەوپایەی هاتە خوارەوە، زۆریش سەیرە وێڕای ئەوەی مەسعودی زۆری رێز لە کیندی دەگرت، کەچی هیچی لەو بارەوە نەگوتووە، ئاشکرایە دوای ساڵی (٨٧٠ز) کە کیندی هێشتا لە ژیاندا بووە، مەسعودی سودی لە کتێبی زانستی ئەستێرەناسی وەرگرتووە. لەو مێژووەدا رۆڵی

(٧٢) أبن النديمیس بە قرچۆك وەسفی دەکات، هەروەها أبن أبی أصبعیە (ج١ ص ٢٠٩) دەڵێ کیندی لە ئامۆژگاریەکی کوڕەکەیدا دەڵێ: (دینار گەرمە هەر خەرجت کرد دەمرێ، درهەمیش حەپسە هەر کە دەرتهێنا دەفرێ، خەڵکیش لە خشتەبەرن، شتیان لێوەر بگرە و شتەکەی خۆشت هەڵگرە)، زۆرێك لە مێژوونوسان و ئەدیبانیش (وەك **جاحظ**)یش باسی ئەو قرچۆکیەی کیندیان کردووە. (و.ع).

بچوکی فەلەکناسی لە نێوچووندابوو، (قەرامیتەکان)یش ئەو شتەیان قۆستەوە بۆ رووخاندنی دەوڵەتی عەبباسی، کیندی کە لایەنگری دەوڵەت بوو لەو سەردەمەدا پێشبینی کرد دەوڵەت تەنها پەنجاو چوار ساڵی دیکە بەردەوام دەبێت، گەرچی بەهۆی نزیکبوونەوەی ئەستێرەکان لە ژێر هەرەشەدا بوو، دەشێ ئەوەش هەر بووبێتە هۆی ئەوەی لایەنگرانی دەوڵەت لە کیندی خۆشبن، رۆژگاری پێشبینیەکە کیندی سەلماند و نیو سەدە تێپەڕی نەکرد و خەلافەتی عەبباسی رووخا.

## ٢- هەڵوێستی کیندی لەمەڕ کەلامناسی:

کیندی پیاوێك بوو لەبارەی هەموو زانستەکانەوە شارەزایی هەبوو، نوێنەرایەتی هەموو زانستەکانی سەردەمی خۆی دەکرد، بەڵام وێڕای ئەوەی لەبارەی جوگرافیا و مێژووی شارستانیەت و پزیشکی خاوەنی بیروباوەڕ و تێبینی تایبەت بەخۆی بوو، بەڵام لە هیچ روویەکەوە بلیمەتێکی داهێنەر نەبوو.

بۆچوونەکانی کیندی لە بابەتە کەلامیەکاندا مەیلێکی موعتەزیلانەی هەبوو، لەبارەی توانای کاری (Ther Power of Action) مرۆڤ و سەردەمی بوونی ئەو هێزەوە شتی نوسیوە، ئایا ئەو توانایە پێش ئەو کارە هەبووە یا لەگەڵ ئەو کارەدا دروست دەبێ، هەروەها جەختی کردۆتە سەر دادپەروەری و یەکتایی خودا، کیندی دژی تیۆرەیەك بوو کە ئەوکات وەپاڵ هیندیەکان یا براهمیەکان دەدرا، ئەو تیۆرەیە دەیگوت ئەقڵ بەتەنها بەسە بۆ سەرچاوەی زانیارییەکان، بەڵام داکۆکی لە وەحی دەکرد، هەوڵیشی دەدا وەحی و ئەقڵ تەبا بکات، بەرادەیەك شارەزایی مەزهەبی سەرجەم گرووپە جیاوازەکان بوو، هەوڵی دەدا بەراوردی یەکتریان بکات. دواجار بۆی دەرکەوت هەر هەموو ئەو مەزهەبانە، کۆکن لەسەر ئەوەی جیهان لە یەك هۆکاری ئەزەلیەوە سەرچاوەی گرتووە و زانیارییەکانی ئێمە ناتوانێ لەوە پتری لە بارەوە بزانێ.

بەڵام پێویستە هەموو بیرمەندێك بڕیار لەسەر ئیلاهیەت و خودایەتی ئەو یەکەمین هۆکارەدا بدات، خودا بەرەو ئەو ڕێگایە رێنوێنیمان دەکات و پەیامبەرەکانیش وەکو شاهیدێك بەسەر خەڵکەوە دەنێرێ، هەروەها فەرمان بە پەیامبەرانیشی دەکات هەر کەس

ملکەچ و گوێڕایەك بوو مژدەی خۆشبەختی و بەهەشتی پێ بدەن، هەر کەسێکیش یاخی و گومڕا بوو هۆشداری سزایەکی هەمیشەیی پێ رابگەیەنن.

### ٣- بیرکاری:

فەلسەفەی راستەقینەی کیندی، هەروەك فەلسەفەی هاوچەرخەکانی، لە بیرکاری و فەلسەفەی سروشتیدا کورت دەبۆوە، کە تیایدا نوێ ئەفلاتونی تێکەڵ بە نوێ فیساگۆرسی دەکرا، لەلای کیندی مرۆڤ تا بیرکاری نەخوێنێ نابێ بە فەیلەسوف، لە زۆرینەی نوسینەکانیدا دەبینین جڵەوی بۆ خەیاڵ شلکردووە یاری بە وشە و ژمارەکان کردووە.

کیندی لە توێژینەوە پزیشکیەکانیدا، واتە لە تیۆرەکەی لەمەڕ دەرمانە پێکهاتووەکاندا کەڵکی لە بیرکاری وەردەگرت، راستیەکەی ئەو دەرمان و مۆسیقایشی هەر لەسەر بنەمای هاوڕێژەیی ئەندازە دادەڕشت، شتێك لە دەرماندا هەیە لەگەڵ چۆنیەتیە هەستیەکاندا دەگونجێ، وك: گەرم، سارد، تەڕ و وشك. گەر بتەوێ دەرمان لە پلەی (١) گەرم بێ، ئەوە دەبێ گەرمیەکی دووهێندەی مامناوەندی هەبێت، گەر بشتەوێ دەرمان لە پلەی (٢) گەرمیدا بێت، دەبێ چوار هێندەی گەرمی ئاسایی بێت، ئیتر ئا بەم شێوەیە. وا دەردەکەوێ لەم مەسەلەیەدا کیندی پشتی بە هەستەکان بەستبێ، بەتایبەتیش هەستی تامکردن، تەنانەت دەتوانین لە فەلسەفەکەیدا تێبینی بیرۆکەی گونجانی نێوان هەستەکان و بابەتەکانی بکەین، بەڵام ئەو ڕایە ئەگەر داهێنان بێت، ئەوە لای ئەو تەنها یاریکردن بووە بە خەیاڵی بیرکاری.

(کاردان- cardan) یەکێك لە فەیلەسوفانی چەرخی رێنسانس، پێی وایە: کیندی بە دانانی ئەو تیۆرەیە بوو بە یەکێك لە دوانزە بیرمەندە ئەقڵمەندەکە.

### ٤- خودا، جیهان، دەروون:

کیندی پێی وابوو جیهان ئافرێندراوی خودایە، هەروەها کاری خودا لە جیهان لە رێگەی چەند ناوەندێکەوەیە، کە باڵا کاریگەرە بەسەر ژێرەوەی خۆی. بەڵام بەرکار ناکەوێتە ژێر کاریگەری هۆکار کە لە پلەی بووندا لەو باڵاترە، هەموو شتەکانی گەردوون پەیوەندییەکی هۆکار و بەرهۆیان بە یەکترەوە هەیە. بەشێوەیەك دەکرێ لە رێگەی ناسینی (هۆکار) وەك تەنە

ئاسمانیەکان (بەرهۆ) بناسین وەك رووداوەکانی ئاییندە، پاشان کاتێك بە تەواوی شتێك دەناسین ئەو شتە دەکەین بە ئاوێنەیەك کە سەرجەم بوونەوەرەکانی دیکەی جیهانی لێوە دەبینین.

هێنانەدی کەماڵ کاری ئەقڵە، هەموو کارێکیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەقڵ، بەڵام ماددە بەو وێنەیە وێنا دەکرێ کە ئەقڵ پێی دەدا.

پێگەی دەروون لە نێوان ئەقڵی ئیلاهی و جیهانی ماددیدایە، هەر لە دەروونیشەوە جیهانی ئەستێرەکان سەرچاوە دەگرێ، هەروەها دەروونی مرۆییش لەو دەروونەوە سەرچاوە دەگرێ، دەروون بە سروشتی خۆی — بەو شێوەیەی کە کاروکردەوەی لێوە بەرهەمدێ- پەیوەستە بە میزاجی جەستە، بەڵام بەو پێیەی جەوهەرەکەی روحە، بۆیە سەربەخۆیە لە جەستە. دەروون لە ژێر کاریگەری ئەستێرەکاندایە، چونکە کاریگەری ئەستێرەکان بەسەر کاروبارەکانی سروشتدا سنوردارە.

هەروەها کیندی پێی وایە دەروونی مرۆڤ جەوهەرێکی سادەی نەمرە، لە جیهانی ئەقڵەوە دابەزیوە بۆ جیهانی هەست، بەڵام بە یادەوەری ژیانی رابردووی کۆمەك دەکرێ، لەم ژیانەدا دڵئارام نییە، چونکە پێویستی و داواکاری جۆراوجۆری هەیە کە بێ رەزامەندی ئەو دەگۆڕدرێن، ئەوەش هاوشانە بە ئازار.

راستیەکەی لەم جیهانەدا هیچ شتێك بەردەوامی نییە، ئەم جیهانە جیهانی دروستبوون و لەنێوچوونە، لە هەر ساتێکدا بێت چ شتێك لامان ئەزیزە لێمان دەستێنێتەوە، بەردەوامی و جێگیری تەنها لە جیهانی ئەقڵدایە. گەر چاومان لە مانەوەی شتە ئەزیزەکانمان بێت و نەمانەوێ دونیا شتەکانمان لێ زەوت بکات، ئەوە پێویستە چاکە هەمیشەییەکانی ئەقڵ و پەرستنی خودا قبوڵ بکەین و لەسەر داواکردنی زانست و کاری چاکە ئارام بگرین، بەڵام گەر بە تەنگی خێر و بێرە ماددییەکان نەدەبوون و پێمان وابوو دەتوانین بیانپارێزین و بیان هێڵینەوە، ئەوە بە دوای مەحاڵێك کەوتووین کە لە بووندا بوونی نییە.

### ٥- تیۆرەی ئەقڵ:

تیۆرەی کیندی لە مەعریفەدا، هاوشانە لەگەڵ ئەو دوالیزمیەی کە کۆڵەگەکانی شتە بەرهەستییەکان و شتە زەینییەکان و مەیلی ئاکاری میتافیزیکی هەیە. هەروەها کیندی پێی وایە مەعریفەکانمان یا هەستیانەن یا ئەقڵانین، بەڵام ئەو شتانەی لەنێوان هێزی هەستی و ئەقڵی دەروونین، ئەوە هێزیکی خەیاڵی یا وێناکاریانەیەن، کە کیندی ناوی لێناوە هێزی ناوەند، هەستەکان

پەیبەرێکی بەشەکین، واتە پەیبەری فۆڕمە مادییەکانن، بەڵام ئەقڵ پەیبەرێکی گشتییە، هەروەها جۆرەکان و رگەزەکانیش دەناسێ، واتە وێنەی ئەقڵی. هەروەك شتە بەرهەستەکانی دەروون هەر هەستن، بەهەمان شێوە شتە زەیینیەکانیش هەر ئەقڵن و یەك شتن.

لێرەدا بۆ یەکەمجار تیۆرەی ئەقڵ لە وێنەیەکدا دەردەکەوێ کە لای فەیلەسوفانی پاش کیندی پێگەیەکی مەزن بۆ خۆی بونیاد دەنێ، بێ ئەوەی گۆڕانی گەورەی بەسەردا بێ، ئەو تیۆرەیەش تایبەتمەندییەکە کە فەلسەفەی ئیسلامی بە درێژایی مێژووی خۆی پێ جیا دەکرێتەوە. بەڵام ئەگەر تیۆرەی ئەقڵ لە ناکۆکی زانایانی سەدە ناوەڕاستینەکانی مەسیحیەت لەمەڕ مانای گشتی گرنگیدان بە واقیعی سروشتی دەربکەوێ، ئەوە یەکەم شت کە لە توێژینەوە فەلسەفییەکانی موسڵمان لەمەڕ ئەقڵ دەردەکەوێ، پێویستی و خواستی ئەوان بووە بۆ کولتوری ئەقڵانی.

کیندی ئەقڵ دابەشی سەر چوار بەش دەکات: ***یەکەمیان:*** ئەو ئەقڵەی کە هەمیشە بەردەوامە و هۆکاری سەرجەم ئەقڵ و شتە زەیینیەکانە، ئەم ئەقڵە لای کیندی بێگومان خودایە یا یەکەم ئەقڵی خولقێنەرە، ***دووەمیان:*** ئەو ئەقڵەیە بەهێز لە دەروونی مرۆڤدایە، ***سێیەمیان:*** ئەقڵی خوو و عادەتە (Habitus)، کە وەکو کردار لە دەروونی مرۆڤدایە، مرۆڤ هەرکات ویستی دەتوانێ بەکاری بهێنێ، وەکو هێزی نوسینی نوسەر، ***چوارەم:*** جۆری ئەقڵ، کردارێکە بەهۆیەوە دەردەکەوێ کە دەروون بە کردار چی تێدایە.

دوایین ئەقڵ لای کیندی کاری خودی مرۆڤە، بەڵام پێی وایە گۆڕانی هێز بۆ خوو و عادەت یا دەرچوونی ئەقڵ لە هێزەوە بۆ کردار، ئەوە کرداری هۆکاری یەکەمە، واتە ئەو ئەقڵەیە کە هەمیشە کردارە.

ئەو ئەقڵەی لە هێزەوە دەبێ بە کردار خەڵاتی خودایە، بۆیە ئەقڵی سێیەم پێی دەوترێ ئەقڵی کەڵکبەخش (cintellevtus adapetus sive asquisitns)، ئەمەش ئەو بۆچوونە سەرەکیەیە کە پێشینان دانیان پێدا ناوە—هەموو ئەو شتانەی لەبارەی بوونەوەرانەوە دەیزانین لە سەرچاوەیەکی دوورەوە پێمان دەگات- لە دووتوێی فەلسەفەی عەرەبی لە وێنەی ئەقڵی کەڵکبەخشدا شکڵی گرتووە، پاشان پەڕیوەتەوە بۆ فەلسەفەی مەسیحیەت. گەرچی ئەم بۆچوونە سەبارەت بەو فەلسەفەیە تارادەیەك راستە، چونکە ئەقڵی کارا وەکو زانایانی مەهەبی نوێ ئەفلاتوونی دەڵێن ئەرەستۆ داهێنەریەتی.

بەڵام مرۆڤ هەمیشە خودا یا خوداکەی خۆی دەکاتە باشترین و چاکترین بونەوەر لای خۆی، کەلامناسانی ئیسلامیش کارە ئەخلاقیەکانی مرۆڤ بێ ناوەند[٧٣] دەگەڕێننەوە بۆ خودا، بەڵام لای فەیلەسوفان، زانست باڵاترە لە کار، هەروەك کار پەیوەستە بە جیهانی بەرهەستی بنەوە، رێی تێدەچێ دەستکەوتی مرۆڤ بێ. بەڵام زانستە باڵاکەی یا ئەقڵی پوخت لە جیهانی باڵاوە سەرچاوەی گرتووە، واتە لەلایەن خوداوە.

ئاشکرایە تیۆرەی ئەقڵ —وەکو لای کیندی دەیبینین- دەگەڕێتەوە بۆ تیۆرەی ئەقڵی ئەسکەندەری ئەفرۆدیسی لە کتێبی دووەمیدا (لەبارەی دەروونەوە)، بەڵام ئەسکەندەر بەشێوەیەکی گومانهەڵگر جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەقڵ لای ئەرەستۆ سێ بەشە.

بەڵام کیندی دەڵێ ئەو نوێنەرایەتی بیروبۆچوونەکانی ئەفلاتون و ئەرەستۆ دەکات، هەروەها لای کیندی، نوێ ئەفلاتونی تێکەڵ بە نوێ فیساگۆرسی کراوە، کەوایە دەبێ ژمارە (٤) لە هەموو شتێکدا و لە تەبابوونی نێوان ئەفلاتون و ئەرەستۆشدا باس بکرێ.

## ٦- کیندی وەکو ئەریستۆتالیسێك:

ئێستا ئەوەی وتمان با کورتی بکەینەوە: کیندی کەلامناسێکی موعتەزیلی و فەیلەسوفێکی سەر بە مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکانە، هەندێجاریش مەزهەبی نوێ فیساگۆرسییەکان، نمونە باڵای کیندی سوکراتە، سوکراتی شەهید، کیندی کتێبی زۆری لەسەر سوکرات و بیروباوەڕ و چەرمەسەرییەکانی ئەو نوسیوە، هەوڵیشیداوە بەشێوازی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان سوکرات و ئەرەستۆ تەبا بکات.

وێڕای ئەوەش کیندی یەکەم کەس بووە مەزهەبی ئەرەستۆی وەرگرتووە و لە نوسینەکانیدا چاوی لێکردووە، بێگومان ئەو قسەیەش بنەمای راستی هەیە، چونکە ئەرەستۆ پێگەیەکی دیاری لە کتێبەکانی کیندیدا هەبووە، تەنها بە وەرگێڕانی کتێبەکانی ئەرەستۆ وازی

---

(٧٣) ئەهلی سوننەت دەیانگوت هەموو کاروکردەوەیەك دروستکراوی خودایە و خوداش ستەمکار نییە، بەڵام موعتەزیلەکان دەیانگوت مرۆڤ خۆی خولقێنەری کار و کردەوەکانی خۆیەتی بە چاك و خراپەوە، لەسەر ئەو کار و کردەوانەشی پاداشت و سزا دەدرێ. (و.ع).

نەهێناوە، بەڵکو لەو کتێبانەشی توێژیوەتەوە کە وەریگێڕاون و هەوڵیداوە چاکیان بکاتەوە و ڕاڤەشیان بکات.

مەسەلەکە هەرچۆنێك بێت کتێبەکەی ئەرەستۆ لەمەڕ سروست بە ڕاڤەکانی ئەسکەندەری ئەفرۆدیسشەوە کاریگەریەکی زۆری کردۆتە سەر کیندی، پشت ڕاستکردنەوەی ئەم قسەیەمان ئەوەیە کیندی دەیوت جیهان وەکو هێز کۆتایی نییە نەك وەکو کردار، جوڵەش کۆتایی نیە، بەڵام لەبارەی ئەم مەسەلانەوە فەیلەسوفە سروشتییەکانی ئەو ڕۆژگارە و ئیخوان سەفا دەیانگوت جوڵەش وەکو ژمارە کۆتادارە.

کیندی لەو فەلسەفەیەی سەردەمەکەی، خۆی گێل کرد کە دەیویست نهێنیەکان ئاشکرا بکات، بەجۆرێك دەیوت کیمیاگەری زانستێکی فریودەری ساختەیە، دەیوت مرۆڤ ناتوانێ کارێك بکات کە تەنها سروشت بتوانێ بیکات. ئەو پیاوەی سەرقاڵی تاقیکردنەوەی کیمیاگەرییە — بەرای کیندی- یا خەڵکی فریودەدات یا خۆی لە خشتە دەبات. رازی پزیشك هەوڵیدا ئەو بۆچوونەی کیندی پوچەڵ بکاتەوە.

### ٧- یاوەرانی کیندی:

کاریگەری کیندی وەکو نوسەر و مامۆستا زۆرینەی جار لە ڕێگەی کتێبەکانییەوە بوو، لەمەڕ بیرکاری و حوکمی ئەستێرەکان و جوگرافیا و پزیشکی.

دڵسۆزترین و مەزنترین قوتابیەکانی کیندی ئەحمەدی کوڕی محەممەد تەیبی سەرخسییە[٧٤] کە ساڵی ٨٩٩ز کۆچی دوایی کردووە، هەروەها هاوڕێی خەلیفە (موعتەزید) بووە، لە حکومەتەکەشیدا پۆستی ئیداری وەرگرتووە، بەڵام دواجار بوو بە قوربانی هەڵەشەییەکانی موعتەزید.

سرخسی سەرقاڵی کیمیاگەری بوو، کۆششی ناسینی حیکمەتی خودا و توانای خودا لە ئافرێنراوە سەرسوڕهێنەرەکانی دەکرد، وێڕای ئەوەش سەرقاڵی خوێندنی جوگرافیا و مێژوو بوو.

لەنێو قوتابییەکانی کیندی ئەوانەی لە سرخسی پتر باس بکرێ، ئەبو مەعشەرییە[٧٥] کە ساڵی٨٨٥ز مردووە، هۆکاری ناودارییەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ شارەزابونی لە ئەستێرەناسی،

---

(٧٤) أبو العباس أحمد بن محمد بن مروان السرخسي، أبن اصبعیە دەڵێ: ساڵی ٢٨٦ی کۆچیی کوژراوە. (و.ع).

دەڵێن لە تەمەنی چل و حەوت ساڵیدا سەرسامی کیندی بووە، کە تا ئەوکات دژی فەیلەسوفە دەمارگرژەکان بوو. مەعشەری خوێندنێکی نیوەچڵی بیرکاری خوێند و ئیدی چووە سەر خوێندنی زانستی ئەستێرەناسی، جا چ ئەوە راست بێت یا قسەی گێڕەوەکان خۆیان بێت، ئەم جۆرە شێوازەی فێربوون، تایبەتمەندی عەرەب بوو لە بەدەستهێنانی زانست لەسەدەکانی سەرەتادا کە وێڕای ئەوەی پەرۆش و تامەزرۆی زانست بوون، بەڵام لاقرتێیان بە زانستێك دەکرد ئەگەر بە تەواوی تێی نەگەیشتبان.

قوتابیەکانی کیندی بە شێوەیەك لە شێوەکان لە بیروباوەڕی مامۆستاکەیان لایان نەداوە، بیروباوەڕی ئەوانمان بەتەواوی پێ نەگەیشتووە، تەنها کەمێك لە گوڵچنی کتێبە جۆراوجۆرەکانیان نەبێت، دەشێ هەندێ لە بیروباوەڕەکانیان لە ئینسکلۆپیدیای ئیخوان سەفادا پارێزرابێ، گەرچی ناتوانین بە پێی زانیارییەکانی ئێستامان ئەو بڕەی نێو ئەو ئینسکلۆپیدیایە بە وردی دیاری بکەین.

## ٢- فارابی(٧٦)

### ١- لۆژیکزانان:

لۆژیکزان و میتافیزیکناسانی سەدەی دەیەمی زایینی لە فەیلەسوفانی سروشتناسی جیادەکرانەوە، ئەوانەی یەکەم لە لێکۆڵینەوەکانیاندا میتۆدێکی ورد و توندوتۆڵتریان لە میتۆدی کەلامناسان دەگرتە بەر، هەروەها هەر ئەو لۆژیکزان و میتافیزیکناسانە هەندێ مەسەلەیان تاوتوێ دەکرد کە جیاوازبوو لە بابەت و کایەی سروشتناسان، ئەوان مەیلیان بەلای مەزهەبەکەی فیساگۆرسدا بوو، بەڵام رەخنەیان لە ئەرەستۆ دەگرت کە فەلسەفەکەی ئەمیان لە بەرگێکی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەوە پێگەیشت.

---

(٧٥) أبو معشر جعفر بن محمد البلخی، أبن الندیم دەڵێ لە رەمەزانی ساڵی **٢٧٣**ی کۆچیی لەسەرووی تەمەنی سەد ساڵییەوە مردووە. (و.ع).

(٧٦) زۆرێك لە نوسەران و مێژوونوسانی ئیسلام فارابی بە فەیلەسوفی راستەقینەی عەرەب لەقەڵەم دەدەن، دیتریگی (dieterici) دەڵێ: (فارابی دامەزرێنەری فەلسەفەی عەرەبییە). (و.ع)

لێرەوە دەکەوینە بەرامبەر دوو ئاراستەی زانست، کە هەردوو گرووپەکە گرنگیان پێداوە.

فەیلەسوفانی سروشتی گرنگیان بە دیراسەکردنی دیاردە مادییە زۆروزەبەندەکانی سروشت دەدا، هەروەك زانستی جوگرافیا و میللەتناسی. ئەوان هەمیشە گرنگیان بە شوێنەوار و لێکەوتەی شتەکان دەدا، چونکە پێیان وابوو زانینی ناوەڕۆکی شتەکان تەنها بە زانینی لێکەوتەکانیان دەرەخسێ، ئەوە ئەگەر لە لێکۆڵینەوەکانیان سروشت و ئەقڵ و دەروونیان تێپەڕاندبێ و گەیشتبنە زاتی خودایی. ئەوان لەو پێناسەیە لایان نەدا کە دەڵێ خودا هۆکاری یەکەم یا ئافرێنەری دانایە و حیکمەت و دانایی و چاکەخوازیەکەی لە ئافرێنراوەکانیدا دەردەکەوێ، ئەوان ئەم پێناسەیەییان لەوانی دیکە پێ باشتر بوو.

بەڵام لۆژیکزانان میتۆدێکی تەواو جیاوازیان لەوەی سروشتناسان گرتەبەر، بەلای ئەمانەوە شتی بەشەکی پێگەیەکی لاوەکی هەبوو، شت یا رواڵەتی بەشەکی تەنها درێژبووەیەکی گشتیە، دەکرێ لەو گشتەوە هەڵبهێنجرێ.

لە کاتێکدا فەیلەسوفانی سروشتی دیراسەکردنی لێکەوتە و شوێنەواری شتەکانیان کردە بنەمای لێکۆڵینەوەکانیان، کەچی لۆژیکزانان هەوڵیان دەدا لە رێگەی هەڵێنجانی ریشەی شتەکانەوە پەی بە خودی شتەکان ببەن، ئەمان لە هەموو لێکۆڵینەوەکانیاندا ناوەڕۆك و حەقیقەتی شتەکانیان دەختە بەرباس، لە بچوکترین شتەوە تا زاتی خودا. جا بۆ ئەوەی مەزهەبی لۆژیکزانان و مەزهەبی سروشتناسان جیا بکەینەوە، بە نموونە دەڵێین لە روانگەی گرووپی یەکەمەوە خەسڵەتی خودا بوونێکی خۆبەدیهێنە (الموجود الواجب الوجود)، لەکاتێکدا لای فەیلەسوفانی سروشتناسی سەرەتا، سیفەتی خودا ئەوەیە کە ئافرێنەرێکی ژیر و دانایە.

لۆژیکزانەکان دوای سروشتناسەکان دەرکەوتن، هەر وەك کەلامناسانی موعتەزیلە سەرەتا سەرنجیان خستە سەر کارەکانی خودا، پاشان چوونە سەر توێژینەوەی خودی خودا. زانیمان رازی گەورەترین نوێنەری رەوتی فەلسەفەی سروشتیە، بەڵام ئەو کایە میتافیزیکیانەی کە میتۆدی لۆژیکی تێدا بەکارهێنا و کیندی و ئەوانی دیکە زەمینە خۆشکەری بوون، نوێنەرایەتیەکەی لەگەڵ پیاوێکی هاوسەردەمی رازی دەگاتە چڵە پۆپە، ئەو پیاوە بە تەمەن لە رازی بچوکتر بوو، واتە ئەبوو نەسری محمد بن محمد بن تەرجان بن ئۆزلگی فارابی بوو.

### ٢- ژیانی فارابی:

له بارەی ژیان و چۆنیەتی ژیانی فارابی بە تەواوی شارەزا نین، پیاوێکی کپ و ئارام بووە، ژیانی هەموو تێڕامانی فەلسەفی بوو، پاشاکان بەدەسەڵاتەکانیان پشتگیریان کردووە، دواجار لە ئەهلی سۆفیەکاندا گیرساوەتەوە.

دەڵێن باوکی فارابی سەرکردەی سوپابووە و بەرچەڵەك فارس بووە، فارابی خۆی له (وەسیج) لەدایکبووە، وەسیج گوندێکی بچوکی قەڵایین بووە و دەکەوێتە ویلایەتی فارابی لە وڵاتی تورکانی ئەودیو دەریا.

فارابی لە بەغدا خوێندویەتی، هەندێ لە وانەکانی لای مامۆستایەکی مەسیحی خوێندووە، کەناوی یوحەننای ئیبن حەیلان بووە[٧٧].

هەروەها لە خوێندندا زۆر شارەزای ئەدەب و بیرکاری بووە، کە دەکەونە بەرامبەر هەردوو بابەتی سێینە (Trivium) و چوارینەی (Quadrivium)ی مەسیحیەکانی سەدە ناوەڕاستینەکان. لە هەندێ لە نوسینەکانی و بەتایبەت لە مۆسیقادا بۆمان دەردەکەوێ بیرکاری خوێندووە و دەشڵێن هەموو زمانەکانی جیهانی زانیوە (حەفتا زمان)[٧٨]، هەروەها لە کتێبەکانیدا دەردەکەوێ زمانی تورکی و فارسی زانیوە، کە ئەمەش شتێکی ئاساییە و شیاوە. جگە لەوانەش بە زمانێکی عەرەبی رەوان نوسینی کردووە. سەرەڕای ئەوەی لە وشە و رستەی هاومانادا دەستڕەنگین بووە، لە گوزارشتە فەلسەفیەکانیشیدا ورد بووە.

---

(٧٧) لە رۆژگار و سەردەمی خەلیفە موقتەریدا لە مدینە السلام مردووە. (و.ع).

(٧٨) ئیبن خەلەکان حەکایەتی هاتنی فارابی بۆ لای سیف الدولە دەگێڕێتەوە کە فارابی حەفتا زمانی زانیوە، بگرە لە موسیقادا بەرادەیەك لێهاتوو و شارەزا بووە، توانیویەتی ئامادەبوان بخاتە پێکەنین و پاشان بیانخاتە گریان، ئینجا بیانخەوێنێ و جا رۆیشتووە، ئەم قسەیەك تا رادەیەك لە ئەفسانە دەچێ، کەچی بیهقی و الشرزوری لە کتێبەکانی خۆیاندا باسی ئەو بەسەرهاتەیان کردووە. (و.ع).

ئەو فەلسەفەیەی کە فارابی لێوە دەستی پێکرد دەگەڕایەوە بۆ قوتابخانەی (مرۆ)، وادەردەکەوێ ئەندامانی ئەو قوتابخانەیە پتر لە ئەهلی حەڕان و بەسرە گرنگیان بە مەسەلەی ئیلاهیات (یەزدانناسی) داوە، چونکە ئەهلی حەڕان و بەسرە گرنگیان بە فەلسەفەی سروشتی دەدا.

دوای ئەوەی فارابی لە بەغدا ژیاوە و سەردەمێکی زۆر لەوێ کاریکردووە، ئینجا چووە بۆ حەلەب، بێگومان دەرچوونی لە بەغدا بەهۆی پشێوی و نائارامی سیاسییەوە بووە، فارابی چووەتە حەلەب و لە ئەنجومەنی پێشکەوتووی سیف الدولە[٧٩] نیشتەجێبووە، بەلاّم وا دەردەکەوێ فارابی دوایین ڕۆژەکانی ژیانی لە کۆشکدا بەسەرنەبردووە، بەڵکو بە تەنهاییی و لەنێو دیمەکانی سروشت بەسەریبردووە، دواجار لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە، کە ساڵی ٩٥٠ز هاوسەفەری سیف الدولەی ئەمیر بووە.

دەڵێن ئەمیر جلی سۆفی پۆشیوە و نوێژی لەسەر کردووە، هەروەها دەڵێن فارابی هەشتا ساڵ ژیاوە، بێگومان پیاوێکی بەساڵداچوو بووە، ئەبو شەری مەقا کە یەکێك بووە لە هاوسەردەم و هاوپۆلەکانی خوێندنی، بیست ساڵ پێش فارابی مردووە، هەروەها ئەبا زەکەریای یەحیای ئیبن عودەی کە قوتابی ئەو بووە ساڵی ٩٧١ ز مردووە و تەمەنی هەشتا و یەك ساڵ بووە.

## ٣- هەڵوێستی فارابی لەمەڕ ئەفلاتون و ئەرەستۆ:

کەس ریزبەندی مێژووی کتێبەکانی دیاری نەکردووە، گەر راست بێ چەند نامەیەکی بچوکی هەبێ و میتۆدی کەلامناسان و فەیلەسوفانی سروشتی گرتبێتەبەر و گەر راستیش بێ بەو شێوەیە بێ کە بە ئێمە گەیشتووە، ئەوە ئەو کتێبانەی بۆ خەڵکی عەوام و کەسانی وەك خۆی نوسیوە لە تەمەنی گەنجیدا. کاتێکیش پێگەییوە و بیری رسکاوە چووەتە سەر دیراسەکردنی ئەرەستۆ، بۆیە خەڵکی رۆژهەلاّت ناویان لێناوە (مامۆستای دووەم)، بەو پێیەی ئەرەستۆ مامۆستای یەکەمە.

لە رۆژگاری فارابیدا ئاماری هەموو کتێبەکانی ئەرەستۆ و هەموو ئەو کتێبانەش کراوە کە وەپاڵی درابوون، هەڵبەتە هەر بەو شێوەی جاران پۆلینکرانەوە، بەلاّم بە شێوازی فارابی لێکدانەوە و شرۆڤەیان بۆ کراوە. یەکەم هەشت کتێبە لۆژیکیەکان کە ئەمانەن: کتێبی کەتەگۆریەکان

---

(٧٩) أبو الحسن علی بن عبدالله بن حمدان، ساڵی ٣٠١ی کۆچیی لەدایکبووە، ساڵی ٣٥٦ی کۆچیی لە حەلەب مردووە. بەنو حەمدان بە زمانپاراوی و لێبوردەیی و ئەقڵکراوەیی بەناوبانگن. (و.ع).

(categories)، کتێبی رستەسازی (the hermenutics)، کتێبی پێوەر ( the first analytics)، کتێبی سەلماندن (the second analystic)، کتێبی تۆپیکا (the topics)، کتێبی سۆفستیکا (قسەلێلان) (sophistics)، کتێبی گوتاربێژی (rhetoric)، کتێبی شیعر (Poetics). بەڵام ئیساگۆژی فرفۆیۆس (کولیات) پێشەکی ئەو کتێبانەیە. دوای ئەوانە، هەشت کتێبی دیکە هەن کە باس لە سروشتییەکان دەکەن و ئەمانەن: بیستنی سروشتی (ausculatic physica)، کتێبی ئاسمان و جیهان (de coele et munde)، کتێبی گەردوون و لەنێوچوون ( de genratione et corruptione)، کتێبی مێترۆلۆژی (meteorologic)، کتێبی دەروون (psychology)، کتێبی هەست و بەرهەست (de sensu et sensate)، کتێبی رووەك (the plante)، کتێبی ئاژەڵ ( the animals)، دوای ئەوانە کتێبەکانی دواتری ئەرەستۆ دێن کە باس لە میتافیزیکا و ئەخلاق و سیاسەت و هتد دەکەن.

فارابی کتێبی وەپاڵدراوی ئەرەستۆ (تیۆلۆژیای ئەرەستۆتالیس) بە کتێبێکی راستەقینەی ئەرەستۆ لەقەڵەم دەدات. هەولێش دەدا بیسەلمێنێ کە ئەرەستۆ و ئەفلاتوون تەبان، ئەوەش هەر لەسەر شێوازی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان و تارادەیەکیش هاوشان بە عەقیدەی ئیسلامی.

فارابی حەزی بەو رەخنەگرتنە نەکردووە کە شتەکان لەیەکتر جودا دەکاتەوە، بەڵکو هەستی دەکرد پێویستی بەوەیە وێنەیەکی تەواوی جیهان لە دەروونیدا دەربکەوێ، فارابی مەیلی تێرکردنی ئەو ئارەزووەی هەبوو کە پتر رووحی ئایینی تێدابوو نەك روحی زانستی، ئەوە وای لێکرد ئەو جیاوازییانە تێپەڕێنێ کە مەزهەبە فەلسەفییەکانی لێکتر جیا دەکردەوە. فارابی پێی وابوو ئەرەستۆ و ئەفلاتون لە میتۆد و زمانەوانی و ژیانی زانستیدا لێکتر جیاوازن، بەڵام مەزهەبە فەلسەفیەکەیان هەر یەك شتە، لای فارابی هەردووکیان پێشەوا و رابەری فەلسەفەن، لەبەر ئەوەی فارابی پێی وابوو ئەفلاتون و ئەرەستۆ دوو بیرمەندی داهێنەری سەربەخۆن، بۆیە کۆدەنگیان لەسەر بۆچوونەکان لە عەقیدەی سەرجەم ئوممەتی ئیسلامی پتەوترە، کە کوێرانە دوای یەك پێشەوا یا ئیمام دەکەون.

### ٤- فەلسەفە:

فارابی لە ریزی پزیشکان دادەنرێ، بەڵام وادیارە دەستی نەداوەتە کاری پزیشکی، بەڵکو هەموو ژیانی لەسەر کاری پزیشکی دەروونی وەستاوە، فارابی پێی وابوو خاوێنی دەروون لە لیێڵ و تەمومژ، مەرجی سەرەکی هەموو تێڕامان و بەرهەمێکی فەلسەفییە، هەروەها داوای خۆشەویستی حەقیقەتی دەکرد، با پێچەوانەی مەزهەبی ئەرەستۆش بووبا.

گەر ویستمان لە زانستە سروشتییەکان و زانستە ئەقڵانیەکان بکۆڵینەوە، ئەوە دەبێ حوکمەکانمان لە زانستی ئەندازە و لۆژیکدا تاقی بکەینەوە و پتەویان بکەین.

فارابی زۆر گرنگی بە زانستە تایبەتی و پسپۆڕیەکان نەدەدا، بەڵکو هەموو هەوڵی خۆی لە لۆژیك و میتافیزیك و بنەمای سروشتناسی کۆکردبۆوە. فەلسەفە لای فارابی پەیبردن بوو بە کۆی بوون وەکو ئەوەی هەیە، ئێمە بە بەدەستهێنانی فەلسەفە وەکو خودامان لێدێت.

هەروەها فەلسەفە لای فارابی تاکە زانستێکە کە وێنەی تەواوی جیهانمان بۆ دەخاتە بەرچاو.

فارابی رەخنەی لە کەلامناسان دەگرت لەوەی بەڵگەکانیان لەسەر هۆشیاری و بۆچوونی باو بونیاد دەنێن، بێ ئەوەی تاقی بکەنەوە، هەروەها فەیلەسوفانی سروشتیشی وەبەر تیری رەخنە دەدا لەوەی هەمیشە گرنگی بەو کردارانە دەدەن کە لە شتەکانەوە سەرچاوە دەگرن و لەجیهانی رووداوە پێکدژەکان واوەتر نەدەچوون و وێنەیەکی سەرتاپاگیری بوونیان بەدەست نەدەهێنا، فارابی پێچەوانەی پێشینان هەوڵی دەدا بنەمایەکی راست و پتەو بۆ فیکر دابڕێژێ، هەروەها پێچەوانەی خەڵکانی دی دەیویست لەو هۆکاری یەکەمە بکۆڵێتەوە کە سەرچاوەی هەموو بوونە.

بەهۆی پێگەی ئایینی و مێژوویی فارابی، جێی خۆیەتی قسە لەسەر لۆژیکەکەیشی بکەین، پاشان مەزهەبە میتافیزیکیەکەی بخەینە بەر باس، دواجار بچینە سەر مەزهەبە سروشتیەکەی و فەلسەفە پراکتیکیەکەی.

### ٥- لۆژیك:

لۆژیکی فارابی تەنها شیکارێکی پوختی بیرکردنەوەی زانستی نییە، بەڵکو لە پاڵ ئەوەشدا چەندین تێبینی زمانەوانی و توێژینەوەی تیۆرە مەعریفیەکانیش دەگرێتەخۆ. زمانەوانی پەیوەستە بە زمانی یەك میللەت، بەڵام لۆژیك یاسایەکە بەزمانی ئەقڵی مرۆیی سەرجەم میللەتان. لە توخمە سادەکانی زمانەوە دەست پێدەکا بۆ ئاڵۆزترینیان، لەویشەوە بۆ رستە جا بۆ دۆسیە.

لۆژیك لە رووی پەیوەندی بابەتەکەی بە شتە دەرەکیەکان، دابەش دەبێتە سەر دوو بەش، ***یەکەم:*** بابەتی مانا و پێناسە لەخۆ دەگرێ، ئەمەیان بەشی وێنەکارییە، ***دووەمیان:*** بابەتی دۆسیە و پێوەر و سەلماندنی لەخۆدەگرێ، ئەمیان بەشی سەلماندنە. ئایدیا یا وێناکاری —کە لە پێناسەکردن واوەتر دەچێ بێ ئەوەی پەیوەندیەکی پتەوی پێوەی هەبێت — هیچ پەیوەندییەکی بە دەرەوە نییە، مەبەستم ئەوەیە نە بە درۆدەخرێتەوە و نە پشت راستیش دەکرێتەوە. فارابی مەبەستی لە وێناکاری سادەترە لەوەی لە دەروونداً دەکێشرێ، واتە سادەتر هەر یەك لە وێنە بەشەکیەکان کە هەست بەدی دەهێنێ و ئەو مانا سەرەکیانەی بەخۆرسك لە زەیندا هەن، وەکو مانای پێویستبوون و بوون و ئەگەر. ئەو وێنە و ئایدیایانە یەقینێکی سەرەکین کە ئەقڵی مرۆڤ دەتوانێ ئاراستەیان بکات و دەروونی مرۆڤ چاودێرییان بکات، بەڵام ناتوانێ بیانسەلمێنێ و ناشکرێ وەکو ئەوەی هەیە هەڵبهێنجرێ، چونکە خۆی، خۆی دەردەخا و تا ئەوپەڕی رادەش یەقینیە.

دۆز و دۆسیەکان بەرهەمی پەیوەستی وێناکانن بە یەکترەوە. ئەو دۆسیانە ئەگەری راستی و درۆبونیان هەیە. هەروەها ئەم دۆسیانە پشت بە دۆسیە سەرەکیەکانی ئەقڵ دەبەستن کە بە هۆی پێوەر و سەلماندنەوە بەدەست دێن. ئەو دۆسیە سەرەکیانەش خۆیان خۆیان وەدی دێنن و پێویستیان بە سەلماندن نییە و هەڵگری سەلماندنیش نین.

ناکرێ دەستبەرداری ئەو دۆسیە سەرەکیانە ببین لە بیرکاری و میتافیزیکا و ئەخلاقدا کە بنەما و بنەچەیەکی سەرەتایین. لای فارابی ئەو شێوازە سەلماندنەی کە بەهۆیەوە لە زانراوێکی یەقینیەوە دەگەین نەزانراوێك، ئەو شێوازە لۆژیکە. سۆراخی مانا و پێناسەکان واتە (کەتەگۆریەکان) و دروستکردنی دۆزەکان (ئارمینۆتیکی) و پێوەر (ئەنالۆتیکی یەکەم) لێیان، تەنها زەمینەخۆشکردنێکە بۆ سەلماندن. گرنگترین مەبەستەکانی سەلماندن گەیشتنە بە

یاساکانی زانستێکی پتەو کە بکرێ لەسەرجەم کایەکاندا پراکتیزە بکرێ، ئەو زانستەش دەبێ فەلسەفە بێ.

بالآترین ئەو یاساییانە لای فارابی ئەو یاسا دژکارەیە کە بەهۆیەوە راستگۆیی یا ناراستی یا مەحالێ دۆسیەیەك بۆ ئەقڵ دەردەخات، ئەوەش لەیەك کاتدا و بە یەك کرداری ئەقلانی. کەوایە پێویستە دوالیزەمەکەی ئەفلاتون (dichotomie) کە دەکرێ بکرێ بە میتۆدێکی توێژینەوەیی زانستی، بخەینە سەرووی پۆلیتۆمی ئەرەستۆ (polyatomic).

فارابی لە توێژینەوەی سەلماندندا بەلایەنی وێنەیی و ئایدیایی قایل نییە، بەڵکو پێی وایە پێویستە سەلماندن پتر بێت لەوەی تەنها رێگەیەکی راست بێت بۆ گەیشتن بە مەعریفەی راستەقینە. هەروەها پێویستە بەداهێنانی زانست و نوێکردنەوەی زانست، خۆی بگەیەنێت بە حەقیقەت. بابەتی سەلماندن تەنها مامەڵە لەگەڵ دۆسیەدا ناکات وەکو بابەتێکی پێوەر، بەڵکو گرنگی بە راستگۆیی لەو دۆسێیانە دەدا لە هەموو لقەکانی زانستدا، سەلماندن لای فارابی تەنها ئامێرێکی فەلسەفە نییە، بەڵکو بەشێکیشە لە فەلسەفە.

لەوەی خستمانەروو دەردەکەوێ تیۆرەی سەلماندن بە زانستێکی پتەو کۆتایی دێت هاوشان بە بوونێکی زەرووری، بەلآم لە پاڵ ئەو زەرووریەشدا، جیهانێکی فراوانی ئەو ئەگەرانە هەیە کە ناتوانین پەی پێ ببەین، مەگەر بە مەعریفەی شیمانەیی نەبێت.

لە بابەتە جەدەلیەکاندا فارابی لە رادە جیاوازەکانی شیمانەیی (أحتمال) (Probable) دەکۆڵێتەوە، یا لەو شێوازانە دەکۆڵێتەوە کە دەکرێ بەهۆیانەوە مەعریفەی شیان (possible) بەدەست بهێنرێ، سۆفیستایی و وتاربێژی و شیعریش بەوانەوە دەبەستێتەوە کە گرنگترین شتی ئامانجی زانستین، بەلآم فارابی دەیانخاتە ناو چوارچێوەی بابەتە دیالێکتیکیەکانەوە. فارابی دەڵێ: زانستی راستەقینە تەنها لەسەر حوکمە سەرەکیەکانی کتێبی سەلماندن (ئانالۆتیکای دووەم) بونیاد دەنرێ، بەلآم شیمانەیی دەکەوێتە نێوان بابەتی دیالێکتیکی و بابەتی شیعری، بە حەقیقەتێکی فریودەر لەقەڵەم نادرێ، بەلآم شیعر دەست بۆ هەموو جۆرەکانی مەعریفە دەبات، بۆیە بەڕای فارابی شیعر تەنها قسەی پوچ و بێ کەڵکە.

فارابی لە ژێر تیشکی ئیساگۆجی فرفۆریۆس بیروبۆچوونی خۆی لەمەڕ (کۆ) دەخاتە روو، (بەش)یش لای فارابی لە تەنها تاکە دەرەکیەکان و بەرهەستەکان نییە، بەڵکو لە زەینیشدا هەیە. هەروەها (کۆ) تەنها بونێکی رووکەشانەی لە تاکەکانی دەرەوە نییە، بەڵکو بونێکی حەقیقیشی هەیە لە زەیندا. ئەقڵی مرۆیی (کۆ) بەشێوەی داماڵین لە (بەش) دەردەهێنێ، گەرچی (کۆ)

سەربەخۆیە و دەکەوێتە پێش بوونی (بەش)ـەوە، کەوایە فەلسەفەکەی فارابی سێ مەزهەب لە خۆ دەگرێ کە پەیوەستن بە مانای (کۆ)وە و ئەمانەن: ئەو بۆچوونەی دەڵێ: (١): کۆ دەکەوێتە پێش بەشەوە، (٢): ئەو بۆچوونەی دەڵێ کۆ پشت بە بەش دەبەستێ، (٣): ئەو بۆچوونەی دەڵێ کۆ دەکەوێتە دوای بەشەوە. بەڵام خودی بوون خۆی دەخرێتە ریزی مانا گشتیەکانەوە؟ فارابی لەمەڕ ئەم بابەتە کە ناکۆکی زۆری لەنێوان فەیلەسوفاندا هەڵگیرساندووە، وەڵامێکی راست دەداتەوە و دەڵێ: بوون بریتیە لە پەیوەندیەکی زمانەوانی یا لۆژیکی، بەڵام کەتەگۆری مانای فیعلی بە هیچ شتێك نادات، بوونی هەر شتێك تەنها مانای خودی ئەو شتەیە.

### ٦- هەبوو، خودا:

رەوتی لۆژیکی فارابی لە مەزهەبە میتافیزیکەشیدا دەردەکەوێ، ئا لێرەدا لە بری بیرۆکەی (هاتنەبوون) و (ئەزەلی)، بیرۆکەی (ئەگەر — Possible) و (پێویست) دەبینین.

فارابی پێی وایە هەموو (بوویەك) یا بوونێکی خۆ بەدیهێنە یا بونێکی ئەگەرانەیە، جگە لەو دوو نموونەیەی بوون، هیچ شتێکی دیکە بوونی نییە[٨٠]. بەڵام هەموو (ئەگەرێك) هەر دەبێ هۆکارێکی هەبێت کە لێوەی هاتبێتە بوون. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی ناکرێ (هۆکرد) بێ سنور درێژەی هەبێ، ئەوە دەبێ دان بە بوونی هەبوویەکی خۆبەدیهێن بنێن کە بۆ بوونی خۆی پشتی بە هیچ هۆکارێك نەبەستووە. ئەو بوونە کەماڵێکی باڵایە و لە هەموو روویەکیشەوە سەربەخۆیە، و ئاڵوگۆڕیشی بەسەردا نایە. ئەقڵی بێگەرد، چاکەی پوخت، هۆشمەندێکی بێخەوش، ئەم سێ شتە لەو بوونەدا هەر یەك شتن، هەروەها ئەو بوونە ئامانجی کەماڵ و جوانی و چاکێتی هەیە و مەزنترین ئاسودەیشی بەخۆی هەیە، پێویستی بە هیچ بەڵگەیەکیش نییە، بەڵکو خۆی بەڵگەی سەرجەم شتەکانە، ئەو بوونە هۆکاری یەکەمی سەرجەم بوونەکانە، دەستنیشانکردنیشی هەر دەستنیشانکردنی خۆیەتی.

مانای هەبوویەکی خۆبەدیهێن لە زاتی خۆیدا هەڵگری بەڵگەیەکە کە دەبێ تاقانەیەکی بێ شەریك بێت، ئەگەر دوو (هەبوو) هەبن، هەردووکیان لەخۆوە هاتبنە بوون یا خۆیان خۆیان بەدی هێنابێ، یا لە روویەکەوە هاوشێوە بن و لەروویەکی دیکەوە جیاواز بن، بێ جیاوازیش

---

(٨٠) فارابی لەگەڵ ئەوەی هەبووی دابەشی سەر ئەو دوو جۆرە کردووە، لەلایەکی تریشەوە واجبیشی دابەشکردۆتە سەر هەبوویەکی سەربەخۆی زەروور و هەبوویەکی ناسەربەخۆی زەروور، ئەمەیان ئەگەرە. (و.ع).

هیچ لێکچوونێك نییە، کەوایە هیچ یەکێکیان تەنها نین، کەوایە ئەو هەبووەی ئامانجی کەماڵی هەیە دەبێ (تەنها) بێت.

ئەو (یەکەم هەبووە) تاك و تەنها و وەدیهاتووە ناونراوە خودا، ئەگەر ئەو خودایەش تەنها بێت و هیچ شتێکی دیکە هاوبەشی نەبێت و رەگەزیشی دیاریکراو نەبێت، ئەوە ناکرێ پێناسە بکرێ، گەرچی مرۆڤ ناوی لێناوە (خودا) و (داهێنەر) کە باشترین ناوە و بەڵگەیە لەسەر ئەوپەڕی کەماڵ، هەروەها ئەگەر مرۆڤ خودای بەهەندێ خەسڵەت وەسفکرد، ئەوە ئەو خەسڵەتانە ئەو مانایانە نابەخشن کە دەبێ بیبەخشن، بەڵکو مانای باڵاتر و بەرێزتر دەبەخشن کە تایبەتن بە خودا. هەندێ خەسڵەتی پێدەبەخشن کە وەکو ئەوەی هەیە، هەندێ خەسڵەتیشی پێدەبەخشن لە رووی پەیوەندی بە جیهانەوە. هەڵبەت بێ ئەوەی ئەو خەسڵەتانە پێچەوانەی زاتی ئیلاهی بن، بۆیە دەبێ سەرجەم ئەو خەسڵەتانە مەجازی بن و تەنها بە شێوەی نواندن بکرێ پەی بەماناکانیان ببردرێ. کاتێك (خودا یا داهێنەر) باڵاترین (بوونەوەرە) ئەوە دەبێ شارەزاییمان لەمەڕ ئەو باڵاترین شارەزایی بێت، چونکە بۆ نموونە: شارەزابوونمان لە بیرکاری پڕکەماڵترە لە شارەزاییمان لە سروشتناسی، ئەوەش بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی بابەتی یەکەم کامڵترە لە بابەتی دووەم. بەڵام ئێمە لەبەرامبەر هەبوویەکی کامڵترین وا دەزانین لەبەرامبەر بە تینترین رووناکین، چونکە لاوازی چاومان ناتوانێ بەرگەی ئەو رووناکیە بگرێ، ئەو لاوازیەش کە پەیوەستە بە هەلومەرج و رەوشی ئێمەوە، دەبێتە هۆی کۆسپ و رێگر لەبەردەم تێگەیشتنمان.

### ٧- جیهانی باڵا:

ئێمە پتر لە میانی ئەو شتانەوە خودا دەناسین کە لە خوداوە یا لە یەکترەوە سەرچاوەیان گرتووە، نەك خودی خودا خۆی. هەموو شتێك لە خودای تەنهاوە سەرچاوە دەگرێ، زانینەکەی بریتیە لە توانای مەزنی خۆی، لە میانی پەیبردنی خودا بەخۆی، جیهان هاتووەتە بوون.

هۆکردی سەرجەم شتەکان ویستی داهێنەری توانا نییە، بەڵکو زانیارییەکانی خودا لەمەڕ خۆی هۆکردی هەموو شتەکانە.

لە پلەی یەکەمدا نەمری شێوەی شتەکانی هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ خودا، هەر لەوەوەش نەمری وێنەی خۆی وەردەگرێ، کە پێی دەوترێ (بوونی دووەم) یا ئەقڵی یەکەم، ئەو بووەش گەردوونی مەزن هەڵدەسوڕێنێ.

دوای ئەو ئەقڵە، ئەقڵی هەشت هەسارە پاشکۆکە دێن کە لە یەکترەوە سەرچاوە دەگرن و هەر یەکێکیشیان بۆ خۆی جۆرێکی تایبەتە. ئەو ئەقڵانە ئەوانەن کە تەنە ئاسمانیەکانیان لێوە بەدیهاتووە، نۆ ئەقڵە کۆبووەوەکەش —کە پێیان دەوترێ فریشتەکانی ئاسمان- بریتین لە پلەی دووەمی بوون.

لە پلەی سێیەمیشدا ئەقڵی کارای مرۆڤ هەیە، کە روحی پیرۆزیشی پێدەوترێ، ئەم ئەقڵەیە کە جیهانی خوارەوە بە جیهانی سەرەوە دەبەستێتەوە.

هەر یەك لە ئەقڵ و دەروون هەر لەسەر یەك حاڵەت نامێننەوە، بەڵکو بە زۆربوونی مرۆڤەکان، ئەوانیش زۆر دەبن.

لە پلەی پێنجەمیشدا وێنە و فۆرم هەیە

لە پلەی شەشەمیشدا ماددە هەیە.

بەو دوو پلەیەش ئەو زنجیرە هەبووانە کۆتاییان دێت کە بێ جەستەن. سێ پلەکەی یەکەم: خودا و ئەقڵی هەسارەکان و ئەقڵی کارا، خۆیان نەجەستەن و نەجەستەشیان هەیە.

بەڵام سێ پلەکەی دواتر: دەروون و وێنە و ماددە گەر خۆیشیان جەستە نەبن، ئەوە لە شتی تردا بەرجەستە دەکرێن.

بەڵام جەستەکانیش — کە دەستکردی جەستە هێزێکی خەیاڵیە لە ئەقڵدا- شەش رگەزن، لەبەرامبەر شەش پلەکەی ئەقڵ، شەش رەگەزەکەی جەستەش ئەمانەن: تەنە ئاسمانیەکان، مرۆڤ، ئاژەڵ، رووەك، کانزا، توخمەکان، واتە: (ئاو و هەوا و خۆڵ و ئاگر).

لەم قسانەی فارابییەوە دەردەکەوێ فارابی بە مامۆستا مەسیحیەکان کاریگەر بووە، هەڵبەت لە پۆلینکردنی سێ بەشیی. لای مەسیحیەکان ژمارە ***(سێ)*** هەمان پلەوپایەی ژمارە (***چوار***)ی هەبووە لای فەیلەسوفە سروشتناسەکان. ئەو چەمك و دەستەواژانەی فارابی بەکاری هێناون دەیسەلمێنێ کە بە مامۆستا مەسیحیەکانی کاریگەر بووە.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش فەلسەفەی فارابی هەر بەڕووکەش نییە، چونکە جەوهەری ئەو فەلسەفەیە دەگەڕێتەوە بۆ مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان، بۆیە دەبینین ئافراندن یا سەرچاوەگرتنی جیهان لە خوداوە وەك سەرچاوەگرتنە لە ئەقڵێکی ئەزەلیەوە، هەرکات ئەقڵی یەکەم، داهێنەری خۆی ناسی، ئەوە ئەقڵی دووەمی لێوە دێتە بوون، هەر بوویەکیش پەی بەخۆی برد واتە زانی چی لە ناوەڕکدایە، ئەوە دەبێ بوویەکی خوارتر لەخۆی هەبێ، سەرچاوەگرتنی ئەقڵەکان لە یەکترەوە بەزەرووڕەت بەردەوام دەبێت، تا دەگاتە خوارترین

هەسارە کە هەسارەی مانگە، ئەو سەرچاوەگرتنەش لەگەڵ سیستەمی هەسارەکانی بەتلیمۆس تەبایە — کە هەموو خوێندەوار و رۆشنبیرێك لە کتێبی کۆمیدیای یەزدانی (دانتی)ـدا ئەو شتەی بەرچاو کەوتووە- لە مەزهەبی نویٚ ئەفلاتونیەکانیشدا لەسەر تیۆرەی مەزهەبی لێوەسەرچاوەگرتن(الصدور) بەردەوام دەبێت.

پێکەوەبوونی هەسارەکان زنجیرەیەکی نەپساو پێکدەهێنن، چونکە بوون یەك شتە. ئافراندنی جیهان و پاراستنی بوونی جیهان یەك شتن. جیهان تەنها رواڵەتی یەکێتی زاتی خودایی نییە، بەڵکو لە سیستەمە دلفرێنەکەی جیهانیش بەڵگەی دادپەروەری خودایە، رێکخستنی جیهان پشتی بە سیستەمی سروشتی و ژیری بەستووە.

## ٨- جیهانی خوارەوە.

جیهانی خوارەوە کە دەکەوێتە ژێر هەسارەی مانگ، بە تەواوەتی پشتی بە جیهانی فەلەکە ئاسمانییەکان بەستووە، گەرچی کاریگەری ئەو جیهانەی سەرەوە بەسەر سەرجەم جیهانی خوارەوە، دیارە لەوەی کە دەبیٚ جیهانی خوارەوە سیستەمی تێدا هەبیٚ، بەکاریگەری بەشەکان بەسەر یەکترەوە پشت بەکردەی سروشتی دەبەستیٚ، مەبەستم ئەوەیە بەگوێرەی ئەو یاسایەی کە بەهۆی ئەزموونەوە فێری دەبین.

فارابی ئەستێرەناسی بەدرۆ دەخاتەوە کە هەموو هاتنەبونێك و هەموو شتێکی ناباو دەگەڕێنێتەوە بۆ کاری هەسارەکان و پاشکۆکانیان. چونکە (ئەگەر) گۆڕانئامێزە و ناکریٚ بە یەقین بناسریٚ. فارابی دەڵیٚ —هەروەك ئەرەستۆ پێشتر ووتویەتی- زۆر شت لەسەر زەوی روودەدەن کە تایبەتمەندی (ئەگەری)یان هەیە، هەڵبەت لەو شتانەدا ئەگەر بە رادەی جیاواز دەردەکەویٚ، بەڵام جیهانی سەرەوە سروشتێکی دیکەی هەیە و کامڵترە لە جیهانی خوارەوە و بە گوێرەی یاسا زەرورییەکان بەڕێوەدەچیٚ، جگە لە کاری چاکە ناتوانیٚ چیتر بە جیهانی خوارەوە بدات.

بۆیە بەبۆچوونی فارابی هەڵەیەکی گەورەیە کە کەسانێك پێیان وایە هەندیٚ ئەستێرە خۆشبەختی دێنن و ئەوانی دیکە بەدبەختی، چونکە سروشتی ئەستێرەکان یەك سروشتە و ئەو سروشتەش هەمیشە چاکەیە.

ئەو ئاکامەی فارابی لەکۆی هەموو ئەو بۆچوونانە پێی گەیشتووە، ئەمەیە: مەعریفەیەکی بەڵگەداری یەقینی تا ئەوپەڕی رادەی دڵنیایی، هەیە و لە ئەستێرەناسی فێرکاریدا

دەیدۆزینەوە، بەڵام دیراسەکردنی تایبەتمەندییەکانی ئەستێرەکان و کارەکانیان لە جیهانی خوارەوە هیچی لێ هەڵناکرێنرێ، تەنها مەعریفەیەکی گوماناوی نەبێت، بانگەشەی ئەستێرەناسان و پێشبینیەکانیان تەنها شیاوی گومان و دووڕدونگیە.

ئەگەر جیهانی ئەستێرەکان سادە بێت، ئەوە ئەو جیهانەی دەکەوێتە ژێر مانگ جیهانی چوار سروشتەکەیە، ئەو شتەی لەو جیهانەش دەکەوێتەوە پێکدژ و گۆڕانئامێزە. بەڵام هەموو بونەوەرانی ئەم جیهانە گەرچی زۆریشن هەر لە بونەوەرەکانی خوارەوە —توخمەکان- تا دەگات بەوانەی سەرەوە —مرۆڤ- یەك کۆمەڵن، گەرچی تاکەکانی لە رووی پلەوپایەوە جیاوازن.

فارابی لەم بابەتەدا بە کەمی شتی نوێ و تایبەت بە خۆی داهێناوە، هەروەها لە پاڵ رەوتە لۆژیکیەکەی زۆر گرنگی بە لقەکانی سروشتناسی نەداوە، هەروەك بێ دوودڵیش زانستی کیمیاگەری داوەتە پاڵ ئەو زانستانە، بێگومان لەوەشدا پشتی بە گریمانەی بوونی یەك ماددەی یەکەم بەستووە کە سەرجەم جەستەکان تیایدا هاوبەشن. ئێستا با بچینە سەر بۆچوونی فارابی لەمەڕ مرۆڤ و دەروونی مرۆیی، دیارە ئەو بۆچوونانەش جێی بایەخ و گرنگین.

### ٩- دەروونی مرۆیی:

بە بۆچوونی فارابی، هێز و بەشەکانی دەروونی مرۆیی یەکسان نین، بگرە هەندێ لەو هێز و بەشانەی دەروون هێز و بەشی دیکەی دەروون پێشکەوتووترن، بەشێوەیەك هێزی نزم وەکو ئەوەی هێزی باڵایە و هێزی باڵاش وەك وێنەی هێزی نزمە. باشترین هێزی دەروونیش هێزی بیرکەرەوەیە و ماددەی هیچ هێزیکی دیکەش نییە، هەروەها وێنەیەکە بۆ هەموو ئەو وێنانەی دەکەونە خوار خۆیەوە.

دەروون بەهۆی هێزی خەیاڵکردنەوە لە بەرهەستەوە سەردەکەوێ بۆ ئەقڵانی، گەرچی هێزی دەروونی بە گشتی مەیل و ئیرادەیە، لەبەرامبەر هەموو زانینێکدا کردار هەیە و رقلێبوونەوە و خۆشویستنی شتێك پابەندی هەستەکانن و هەرگیز لێی جیا نابنەوە. دەروون لە هەمبەر ئەو وێنە زەینیانەی وێنایان دەکات یا هەڵوێستی پەسەندکردن یا رەتکردنەوە وەردەگرێ.

دواجار هێزی بیرکەرەوە جوان و ناشیرین لێکجیادەکاتەوە، هونەر و زانست وەردەگرێ، ویستێکی ئیرادیانەشی لەهەمبەر ئەو شتانە هەیە کە تێیان دەگات. هەموو وێناکردنێك و هەموو هەستێکردنێك و هەموو بیرکردنەوەیەك مەیل و خواستی بەدوادا دێ، ئەوەش ئاکامێکی زەروریە و بەرهەمی ئەو هەستانەیە، هەروەك چۆن گەرمی زادەی جەوهەری ئاگرە.

دەروون کەماڵی جەستەیە، بەڵام کەماڵی دەروون ئەقڵە، راستیەکەی مرۆڤیش هەر ئەقڵە.

**١٠- ئەقڵی مرۆڤ:**

مەسەلەی ئەقڵ زۆر جێگەی باس و خواسە، ئەگەر شتە ماددیەکان بوون بە شتگەلی زەیینی و هزری، ئەوە لە ئەقڵدا نموونە باڵایەکیان دەبێ و ئەو کەتەگۆریانەیان بەسەردا ناسەپێ کە بەسەر شتە ماددیەکانی دیکەدا جێبەجێدەکرێن، ئەقڵ لە دەروونی منالڵدا تەنها وەکو هێزێك هەیە، دوای ئەوەی بەهۆی هەستەکان و هێزی وێناکردنەوە پەی بە وێنە جەستەییەکان دەبات، جا دەبێت بە ئەقڵێکی کارکرد.

گەرچی ئەو گواستنەوەیە لە هێزەوە بۆ کردە، کاری مرۆڤ نییە، بەڵکو کاری ئەو ئەقڵە کارایەیە کە لە پلەدا لە ئەقڵی مرۆیی باڵاترە، واتە ئەقڵی ئەستێرەی کۆتاییە، ئەستێرەی مانگ.

مەعریفەی مرۆیی بەهەوڵ و کۆششی ئەقڵ بەدەست نایەت، بەڵکو لە شێوەی ئیلهامێك لە جیهانی سەرەوە دەردەکەوێ، ئەقڵی ئێمە لە ژێر تیشکی ئەقڵی کارادا دەتوانێ پەی بە وێنەی گشتی جەستەکان ببات، بەو کارەش سنوری ئەزموونی هەستەکی فراوان دەبێت و دەبێ بە مەعریفەیەکی ئەقڵانی.

ئەزموونی هەستەکی تەنها وێنەکانی جیهانی ماددی وەردەگرێ، بەڵام وێنە و مانای باڵاتر و لە پێشتر لە شتە ماددییەکان، ئەوەش لە ئەقڵی بێگەردی هەسارەکاندا هەیە.

مرۆڤ لەو ئەقڵانەوە یا لەو (وێنە پەرتانە)ەوە زانیاری وەردەگرێ و بەهۆی ئەو شتەوە نەبێت ناتوانێ پەی بە شتەکان ببات، ئەقڵەکانیش کاردەکەنە سەر هەموو ئەقڵەکانی دوای خۆیان، بەمانای ئەوەی هەر یەکێك لەوانە کاریگەری سەرووی خۆی وەردەگرێ و کاریش دەکەنە ئەوانەی خوار خۆیان، ئەو کاریگەریەش لە ئەقڵی باڵاوە کە خودایە دەست پێ دەکات تا بە ئەقڵی مرۆیی کۆتایی دێت.

ئەقڵی کارا، ئەقڵی هەسارەی خوارەوەیە و پێی دەوترێ: کارا یا کاریگەر، جا ئەقڵی مرۆڤیش کە لە ژێر کاریگەری ئەو ئەقڵە کارایەیە کە پێی دەوترێ ئەقڵی سودبەخش (العقل المستفاد)، گەرچی ئەو ئەقڵە کارایە هەمیشە کارا نییە، چونکە ماددە کارەکانی کۆت و بەند دەکات، بەڵام ئەو ئەقڵەی کە هەمیشە کارایە و هەمیشە وەدیهاتووە، ئەوە خودایە.

ئەقڵ لە مرۆڤدا سێ ڕەهەندی هەیە: یا ئەقڵێکە وەکو هێز، یا وەکو کردار، یا لە ژێر کاریگەری ئەقڵی کارادایە، ئەوەش لە فەلسەفەی فارابیدا واتە لە مرۆڤدا ئامادەباشیەك یا ئەقڵێك وەکو هێز هەیە، جا بەهۆی مەعریفەیەکی بەدەستهاتوو لە پەیبردنی شتەکان، دەگۆڕێ بە ئەقڵی کارکرد. دواجار دەگۆڕێ بە مەعریفەیەکی نامادی کە لەسەرووی هەستەوەیە و دەکەوێتە پێش هەموو ئیدراکەکان و خۆی دەبێتە هۆی ئەو ئیدراکانە.

ئا لێرەدا پلەکانی ئەقڵ و مەعریفەی ئەقڵی، هاوشانی پلەی بوونەوەران دەبن، بوونەوەرانی خوارەوە مەیلی پەرۆشی ئەوانەی سەرووی خۆیان هەیە، ئەوانەی سەرەوەش ئەوانەی خواری خۆیانەوە بەرز دەکەنەوە بۆ ئاستی خۆیان.

ئەقڵی کارا کە وێنە و فۆرم بە هەموو بونەوەرانی خوارەوە دەبەخشێ، کار بۆ کۆکردنەوەی ئەو وێنە و فۆرمە پەرتانە لە یەکەیەکدا دەکات و خۆشەویستی لە نێوانیاندا دروست دەکات. ئەو کارەش سەرەتا لە ئەقڵی مرۆڤدا ئەنجام دەدا. ئەقڵی کارا کە وێنە بە ماددەکان دەبەخشێ، ئەوە ئەگەری بەدەستهێنانی مەعریفە لەلایەن مرۆڤەوە و راستی و دروستی ئەو مەعریفانە، دەوەستێتە سەر ئەوەی ئەقڵی کارا ئەو وێنە و فۆرمانە بە مرۆڤ بناسێنێ. پاشان وێنەی پەرش و بڵاوی شتە زەمینیەکان هەمووی لە ئەقڵی مرۆییدا کۆ دەبێتەوە، جا ئەو شتە ئەقڵی مرۆڤ دەخاتە سەر شێوەی ئەقڵی هەسارەی خوارەوە. ئامانج و خۆشبەختی ئەقڵی مرۆیی ئەوەیە لەگەڵ ئەقڵی ئەستێرەدا یەکبگرێ، ئەو یەکگرتنەش مرۆڤ لە خودا نزیك دەکاتەوە.

بەڵام ئەگەری ئەو یەکگرتنە بەر لە مردنی مرۆڤ لای فارابی جێی گومانە و بە تەواوی نکۆڵی لێدەکات، باڵاترین شت کە بکرێ لەم جیهانەدا پێی بگەین مەعریفەی ئەقڵیە.

جیابوونەوەی دەروونی بیرکەرەوە لە جەستەکەی دەبێتە هۆی ئازادی ئەقڵ، بەڵام ئایا هیچ دەروونێك هەیە سەربەخۆ بێت؟ یا بەشێکە لە ئەقڵی گشتی؟ لەم خاڵەدا بۆچوونی فارابی لێڵە، لە کتێبە جیاوازەکانیشیدا پێکدژی هەیە. فارابی دەڵێ جەستەکان لە نێو دەچن، دەروونیش بە مردن کۆتایی دێ، نەوە دوای نەوە دێن، هەموو دەروونێك دەچێتە پاڵ دەروونەکانی هاوشێوەی خۆی، هەر دەروونێك لە سیستەمی خۆیدا دەخولێتەوە، لەبەر ئەوەی دەروونی بیرکەرەوە جەستەی نییە و شوێنیش داگیر ناکات، ئەوە بەبێ سنور زیاد دەکات، و پەیوەندی بە یەکترەوە دەکەن، هەروەك چۆن ئەقلەکان پەیوەستی ئەقڵەکان دەبن و هێزیش پەیوەستی هێز دەبێت، هەموو دەروونێك خۆی و دەروونەکانی دیکەی هاوشێوەی خۆی دەناسێ، هەرچەندە ئەو ناسینەش پتر بێت، چێژەکەی پتر دەبێت.

### ١١- ئەخلاق:

ئێستا دەچینە سەر فەلسەفەی پراکتیکی فارابی، بیروباوەڕە ئەخلاقی و سیاسیەکانی فارابی لە ژیان و بیروباوەڕی موسڵمانان نزیکترە، ئێستا بە کورتی لەمەڕ بیروباوەڕە گشتیەکانی فارابی دەدوێین.

هەروەك چۆن زانستی لۆژیك، یاساکانی مەعریفە رەنگرێژ دەکات، ئاکارناسیش ئەو یاسا بنەڕەتیانە دادەڕێژێ کە مرۆڤ لە هەڵسوکەوتی خۆیدا پەیڕەوییان لێدەکات، گەرچی پلەوپایەی کردار و ئەزموون لە ئەخلاقدا پترە وەك لە لۆژیکدا. فارابی لە تاوتوێکردنی ئەخلاقدا جارێك هاوڕای ئەفلاتونە جارێکی تر هاوڕای ئەرەستۆیە. جاروباریش بیروباوەڕەکانیان تێدەپەڕێنێ و رەوتێکی سۆفیگەرانە و زاهیدانە بەخۆوە دەگرێ.

زۆرجار فارابی جەختی کردۆتە سەر ئەوەی ئەقڵ دەتوانێ حوکم بەسەر هەر کارێکدا بدا بەوەی چاکە یا خراپە. فارابی لەم بۆچوونەیدا لەگەڵ کەلامناساندا ناکۆکە، کەلامناسان دەڵێن مەعریفە سەرچاوەکەی ئەقڵە، بەڵام پێیان وایە ئەقڵ مافی ئەوەی نییە یاساکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی دابڕێژێ، لێ ئەگەر ئەقڵ لە جیهانی سەرەوە سەرچاوەی گرتبێ و مەعریفەش لوتکەی فەزیلەکان بێت، بۆچی ئەقڵ یاساکانی ئەخلاق دانەڕێژێ، فارابی لەم رووەوە بیروباوەڕێك دەردەبڕێ کە بەڵگەیە لەسەر بۆچوونەکانی. فارابی دەڵێ ئەو پیاوەی هەموو شتەکانی ناو کتێبەکانی ئەرەستۆ شارەزا بێت و بەگوێرەی ئەو مەعریفەیەش نەجوڵێتەوە، هێشتا چاکترە لەو پیاوەی کە بە گوێرەی راسپاردەکانی ئەرەستۆ دەجوڵێتەوە و لە مەعریفەکانی ئەرەستۆش بێ ئاگایە، لای فارابی مەعریفە پلەیەکی باڵاتری هەیە لە کار و هەڵسوکەوت، گەر وانەبێت ناتوانین حوکم بەسەر هەڵسوکەوتە ئاکارییەکاندا بدەین.

دەروون بە سروشتی خۆی مەیلی هەیە، دەروون ئەگەر هەست و خەیاڵکردنی نەبووایە ئەوە وەکو سەرجەم ئاژەڵانی دیکە خواستی دەبوو، گەرچی تەنها مرۆڤ سەرپشکە، چونکە

سەرپشکبوون پشت بە روانگەی ئەقڵانی دەبەستێ[٨١]، کایەکەش کایەی بیرکردنەوەی بێگەردە، ئازادی پشت بە هۆکارەکانی فیکر دەبەستێ، هەم وەکو ئەوەی ئازادی بێت، هەم ناچاری، چونکە ئازادی بەگوێرەی بنچینەی یەکەمی خۆی، خودا بڕیاری لەسەر دەدات، لەم رووەوە فارابی لایەنگری سەپاندنە (جەبریەت).

گەر بەو شێوەیە لە سەرپشکبوونی مرۆیی تێ بگەین، ئەوە بە شێوەیەکی کەموکورت دەتوانێ بەسەر ئارەزوودا زاڵ بێت، چونکە مادده دەبێتە کۆسپی سەر رێگەی. کەوایە ئازادی دەروونیی بیرکەرەوە کامڵ نابێت تا لە کۆت و بەندەکانی مادده یا گومڕایی قوتاری نەبێت، واتە کاتێك دەروون دەبێتە ئەقڵ. ئا ئەوەش ئەو خۆشبەختیە مەزنەیە کە پێویستە بۆ خۆی داوای بکات، چونکە چاکەی رەهایە، دەروونی مرۆیش ئەگەر پەرۆشی ئەقڵەکەی سەرووی خۆی بێت، داوای خۆشبەختی دەکات، هەروەها دەروونی ئەستێرەکانیش کاتێك لە خودا نزیك دەبنەوە هەروا دەکەن.

### ١٢- سیاسەت:

فارابی لە ئاکارناسیدا زۆر بە تەنگی هەلومەرج و ژینگەی دەوروبەری کارە مۆراڵیەکان بووە، لە سیاسەتیشدا زۆر لە ژیانی واقیعیەوە دوور بووە. لەبەر ئەوەی فارابی لە بیرکردنەوەدا پیاوێکی رۆژهەڵاتیانە بووە، بۆیە پێی وابووە مانای گشتی کۆمارەکەی ئەفلاتون لەوەدا کورت دەبێتەوە کە فەرمانڕەوا دەبێ فەیلەسوف بێت. هەروەها وای بۆچووە خەڵکی بە زەرووڕەت پێویستیان بە کۆمەڵبوون و کۆبوونەوەیە و ملکەچی ئیرادەی یەك سەرۆك دەبن کە چاکە و خراپەی دەوڵەت لەو سەرۆکەدا بەرجەستە دەبێت. دەوڵەت ئەگەر فەرمانڕەواکەی لە یاساکانی چاکە بێ ئاگابێت یا گومڕا و خراپەکار بێت ئەوە دەوڵەتێکی گەندەڵ دەبێت، بەڵام دەوڵەتی چاك و باش، یەك جۆرە و فەیلەسوف فەرمانڕەوایەتی دەکات.

فارابی پێشەوای خۆی بەهەموو فەزیلەتە مرۆیی و فەزیلەتە فەلسەفییەکان وەسف دەکات، ئەویش ئەفلاتونە لە بەرگی پەیامبەری ئیسلامدا.

---

(٨١) فارابی جیاوازی لەنێوان ئیرادە و سەرپشکبوون دەکات، ئیرادە مەیلدارییە بەرەو ئەو شتانەی کە بونەوەران بەهۆی هەستکردن و خەیاڵەوە دەرکی پێ دەکەن، بەڵام سەرپشکبوون مەیلی بینین و قسەکردنە، یەکەمیان لەسەرجەم بونەوەراندا هەیە، بەڵام ئەوی دووەمیان تەنها لە مرۆڤدا هەیە. **المدینة الفاضلة ص٤٦**. (و.ع).

فارابی پێی وایە دەشێ لە یەك فەرمانڕەوا پتر هەبێت، وەك چۆن پاشا و وەزیرەکان لە حکومەت و حیکمەتدا بەشداری دەکەن، فارابی کاتێك وەسفی سەرکردە دەکات، لەو وەسفەدا تیۆرەی سیاسی موسڵمانانی ئەو سەردەمە دەبینین. گەرچی قسەکردنی فارابی لەم بابەتە روون نییە و نابینین بە راشکاوانە باسی دروستی رچەڵەکی پاشای کردبێ یا باسی ئەرکی سەرکردەی لە جەنگدا کردبێ، هەموو قسەکانی فارابی لەم رووە تەمومژی فەلسەفییان پێوە دیارە.

**١٣- ژیانی دوایی:**

ئەخلاق تەنها لە دەوڵەتدا کامڵ دەبێت، کە دەوڵەت لە روانگەی فارابییەوە گرووپێکی ئایینیە، ئەمەش نەك تەنها لە ژیانی دونیاییدا بەڵکو لە رۆژی دواییشدا.

دەروونی هاوڵاتیانی وڵاتێکی نەزان خاڵیە لە ئەقڵ. ئەو دەروونە دەگەڕێتەوە بۆ توخمەکان بۆ ئەوەی سەرلەنوێ لەگەڵ مرۆڤ و ئاژەڵەکانی دونیادا یەکبگرێتەوە.

بەڵام لە وڵاتە سەرلێشێواو و گومڕاکاندا، دەرد و ئازار بۆ ئەو کەسەیە سەری لە خەڵکی وڵات شێواندووە و گومڕای کردوون، هەڵبەتە سزای دوارۆژیش چاوەڕوانیەتی.

دەروونە گومڕاکان رووبەرووی هەمان ئەو شتە دەبنەوە کە دەروونە نەزانەکان رووبەرووی دەبنەوە، بەڵام تەنها دەروونە چاك و ژیرەکان دەمێننەوە و دەچنە ناو ژیانی ئەقڵانیەوە، هەرچەندە ئەو دەروونە لەم ژیانەدا زاناتر بێت، دوای مردن لە نێوان دەروونەکاندا پلەوپایەی بەرزتر دەبێت و خۆشبەختی رووحی پتر بەردەکەوێ.

دەشێ ئەم قسانەی فارابی تەنها پەردەیەکی رواڵەتی بێ و بیروباوەڕە سۆفیگەرییە فەلسەفییەکانی خۆی پێ پەردەپۆش کردبێ، فارابی بڕوای بەوە هەبوو ئەقڵی مرۆڤ لە ئەقڵی گشتیدا فەنا دەبێ و دواجار لە خودادا فەنا دەبێت. هەروەها دەیوت ئەگەر وا تەماشای جیهان بکەین کە لە هۆکردێکی خۆیەوە دروست بووە، ئەوە جگە لە خودا شتێکی دیکە دەبینین، بەڵام گەر دەروونی مرۆیی سەرکەوت بۆ جیهانی باڵا، بۆی دەردەکەوێ ئەم ژیانە هەمان ژیانی دوارۆژە، چونکە خودا لە هەموو شتێکدایە، بگرە خودا لە یەکێتی خۆیدا، هەموو شتێکە.

## ١٤- روانگەیەکی گشتگیر:

گەر تەماشای کۆی فەلسەفەی فارابی بکەین مەزهەبێکی رووحی زۆر پتەو دەبینین، بە مانایەکی وردتر مەزهەبێکی ئەقلانی، بەرای فارابی هەموو شتێکی ماددی بەرهەست، هێزێکی خەیاڵکرد دروستی کردووە و دەکرێ بە وێنەیەکی شێواو لەقەڵەمی بدەین، بوونی حەقیقیی تەنها ئەقڵە. با پلەکانیشی جیاواز بن، بەڵام تەنها خودا ئەو ئەقڵە بێگەردەیە کە زیاد ناکا، بەڵام ئەو ئەقلانەی کە لە ئەزەلەوە لەخوداوە سەرچاوەیان گرتووە یا لە یەکترەوە هەڵقولاون، زۆر دەبن. ژمارەی ئەقڵە پەرتەکان کە لەگەڵ مەزهەبەکەی بەتلیمۆس تەبایە کە هاوتەریبی پلەی ئەستێرە ئاسمانیەکانە. هەر یەکێك لەو ئەقلانە چەندێك لە ئەقڵی یەکەم دوور بکەوێتەوە، پشکی ئەو ئەقڵە لە بوونی ئەقلانی لە کەمی دەدات. جەوهەری مرۆڤیش واتە ئەقڵەکەی لە ئەقڵی ئەستێرەی خوارەوە سەرچاوە دەگرێ.

بونەوەران زنجیرەیەکی دوابەدوای یەکی پێکبەستەن، جیهانیش گشتێکی سیستەماتیزکراوە، بەشەکانیشی زۆر بەجوانی رێکخراوە، خراپە لە بەشەکانی جیهاندا بەهۆی ئەوەوەیە کە بەشێکی کۆتادارە، بەڵام بوونی لە نێو سیستەمێکی گشتیدا وای لێ دەکا وەکو چاکە دەربکەوێ[٨٢].

ئایا ئەم سیستەمە رەنگینەی کە لەم جیهانە لە ئەزەلەوە لەخودا سەرچاوە گرتووەوە دەردەکەوێ، رێی تێدەچێ گەندەڵ ببێ؟ ئایا دەشێ جارێکی دیکە بگەڕێتەوە بۆ لای خودا؟ گومانی تێدا نییە گەڕانەوەیەکی بەردەوام بۆ لای خودا هەیە. دەروون، پەرۆش و شەیدای سەرووی خۆیەتی، هەرچەندێکیش دەروون زاناتر بێت جەوهەرەکەی بێگەردتر دەبێت و پتر پلەکەی بەرز دەبێتەوە، بەڵام گەشەکردنەکەی تا چ رادەیەکە؟ نەفەیلەسوفان و نە پەیامبەران نەیانتوانیوە وەڵامێکی روونی ئەم پرسیارە بدەنەوە؟ فارابی پێی وابووە حیکمەتی فەیلەسوفان و حیکمەتی پەیامبەران لە ئەقڵی کاراوە سەرچاوەیان گرتووە، جاروباریش وا باسی پەیامبەرایەتیشی کردووە کە خاوەنی باڵاترین پلەی زانست و کردارە، بەڵام ئەم قسەیە رای راستەقینەی فارابی نییە، یا لانی کەم ئەو ئاکامە

---

(٨٢) فارابی دەڵێ: چاودێری خودایی هەموو شتێکی لەخۆگرتووە و لە جیهاندا چاکە لە خراپە زۆرترە، خراپە تەنها لە بوونەوەرە خراپەکاندا هەیە چونکە سروشتی ئەو شتانە پێویستیان بە خراپەیە. (و.ع).

لۆژیکیه نییه که دەبوا بەرئەنجامی فەلسەفە تیۆرەکەی بووبا. فەلسەفەکەی ئەو دەڵێ هەموو کاروبارێکی پەیامبەرایەتی لە پێشبینی و ئاشکراکردن و وەحی پەیوەستە بە بازنەی خەیاڵ، پەیامبەرایەتی لە پلەی ناوەڕاستی نێوان ئیدراکی هەستیانە و مەعریفەی ئەقڵی بێگەرد دایە. بەڵام ئەگەر فارابی لە بیروباوەڕە ئەخلاقی و سیاسیەکانیدا پلەوپایەیەکی گەورەی بە ئایین لە بواری پەروەردەکردندا بەخشیبێ، ئەوە لەرووی بەهای رەهاوە، پلەیەکی نزمتری لە مەعریفەی ئەقڵی بێگەرد بە ئایین بەخشیوە.

فارابی بە مەبەستی نەمری لە جیهانی ئەقڵی نەمردا ژیاوە، لە جیهانی ئەقڵدا پاشا بووە، بەڵام لە سامانی دونیادا هەژاربووە، کتێبەکانی و باڵندە و گوڵەکانی باخچەکەی دڵخۆش و کامەرانیان پێ بەخشیوە.

فارای لای ئوممەتەکەی خۆی کە ئوممەتی ئیسلامە پلە وپایەیەکی باڵای نەبووە، لە نێو ئامۆژگارییە ئەخلاقی و سیاسیەکانیدا هیچ گرنگیەکی بە کاروباری دونیا و جیهاد نەداوە. هەروەها فەلسەفەکەی بەهیچ جۆرێك خواستی تێرکردنی پێویستیە ماددییەکانی نەبووە. هەروەها بەرەنگاری ئەو خەیاڵە راڕایەی نێوان هەست و ئەقڵ بۆتەوە، کە بەشێوەیەکی تایبەت لە داهێنانە هونەرییەکان و خەیاڵە ئایینییەکاندا دەردەکەوێ.

ئەم فەیلەسوفەی لەمەڕ ئێمە لە ئەقڵی بێگەرد فەنا بووە، زوهد و خواپەرستیەکانی جێگەی سەرسامی هاوسەردەمەکانی بووە، قوتابییەکانیشی زۆریان رێزگرتووە و پێیان وابووە حیکمەت و دانایی لەودا بەرجەستەبووە. بەڵام زانایانی ئیسلام بە گومڕا لە قەڵەمیان داوە و تاهەتاش هەر وا ناسرا، ئەو زانایانە  بۆ پشتگیری قسەکانیشیان دەیانگوت: فەلسەفەی سروشتی وا لە خەڵکی دەکات بە ئاسانی بچنە سەر مەزهەبی سروشتی و گومڕا بن، هەروەها وا لە  پەکتاپەرستە لۆژیکناسەکانیش دەکات بڕوا بە یەکێتی (بوون) بهێنن، بێ ئەوەی بزانن.

### ١٥- کاریگەری فەلسەفەی فارابی: سەجستانی:

فارابی قوتابی زۆر نەبووە، لە قوتابییەکانیدا ئەبو زەکەریای یەحیای کوڕی عودەی زۆر بە نێوبانگ بووە کە مەسیحی بووە، ئەوەش بەهۆی وەرگێڕانی کتێبەکانی ئەرەستۆوە.

زەکەریاش قوتابییەکی هەبووە لە خۆی نێودارتر، واتە ئەبو سولەیمان محەممەد بن تاهر بن بەهرام سەجستانی-یە، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی دەیەمی زایینی، زانایانی سەردەمی

خۆی له بەغدا له دەوری کۆبووبونەوە، بەڵام تەنها هەندێ توێژینەوە و ئامۆژگاری فەلسەفیمان پێگەیشتووە کە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانیدا بۆ ئامادەبوانی باسکردووە. ئا لێرەدا دەبینین قوتابخانەی فارابی بەروونی لەنێو دەچێ.

هەروەك فەلسەفەی سروشتی گۆڕا بەو زانستانەی خەریکی نهێنی ناسین بوون، هەورەك چۆنیش قوتابخانەی کیندی مەیلی لێبوو لەو فەلسەفەیەوە بچێتە سەر لقەکانی بیرکاری و سروشتناسی، ئا بەو شێوەیە دەبینین رەوتی لۆژیکی فارابی لای قوتابیەکانی دەگۆڕێ بە فەلسەفەی لەفزی (لفظي)، هەروەها مشتومڕێك لەمەڕ دیاریکردنی مانا و وردبینی لە جیاکردنەوەی نێوان ماناکان دەبینین، لە پاڵ ئەوەشدا بێ هیچ میتۆدێك لە بابەتی هەمەجۆری فەیلەسوفانی کۆن و لقە زانستیەکانیان دەکۆڵیەوە، لە نێو هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەدا نابینین گرنگی بە شتێکی حەقیقی درابێ.

دەبینین مەسەلەی دەروونی مرۆیی بە شوێنی یەکەم کاریگەربووە، هەروەك ئەوەی لای ئیخوان سەفا هەبوو، گەرچی ئەو فەیلەسوفانە سەیروسەمەرەی کردارەکانی دەروونیان تاوتوێکردووە، بەڵام لۆژیکناسان سەرنجی دەروونییان لە جەوهەرە ئەقڵیەکەی و سەرکەوتن لێیەوە بۆ جیهانی باڵای ئەقڵی داوە، گرووپەکەی سەجستانی یارییان بە لەفز و ماناکان دەکرد، بەڵام ئیخوان سەفا یارییان بە ووشە و ژمارەکان دەکرد، بەڵام سۆفیزم کۆتایی ئەو دوو گرووپەیە.

جێگەی سەرسامی نییە کە لە کۆڕ و کۆبوونەوە زانستیەکانی ئەبی سولەیمان پتر لە ئەرەستۆ باسی ئەنبادۆکلیس و سوکرات و ئەفلاتون و ئەوانی تر دەکرێ، ئەم قسانە تەوحیدی[٨٤] (١٠٠٩ز مردوە) بۆمان دەگێڕیتەوە. کۆڕەکانی بەنی سولەیمان شوێنی بە یەکگەیشتنی خەڵکی هەموو تایفەکان بوو، کەس لە وڵات و نەتەوەی نەدەپرسیەوە، هەر هەموویان لەسەر بیروباوەڕەکانی ئەفلاتون دەژیان. بەڕای ئەوان لەهەموو بیروباوەڕێکدا رادەیەك راستی تێدایە، هەروەك هەموو شتێك لە بووندا هاوبەشە، ئاشکراشە سەرجەم زانستەکان لە تاکە وێنەی زانست لە دەرووندا هاوبەشن، بۆ کۆدەنگیشیان لەسەر ئەم بۆچوونە، یەکێك لەوان دەیتوانی راکەی خۆی بەرایەکی دروست لەقەڵەم بدات و ئەو زانستەش کە ئەو سەرقاڵیەتی بە باڵاترین زانست دابنێ. لەبەر ئەوە ناکۆکی نێوان ئایین و فەلسەفە دروست نابوو، هەرچەند لایەنگرانی هەر یەکێك لەو دوو کایەیە لەسەر ئەو ناکۆکیە

---

(٨٤) أبو حيان علي بن محمد بن العباس التوحيدی. له موعجەمی ئودەبای یاقوتدا دەڵێ: لە رەجەب یا رەمەزانی ساڵی ٤٠٠ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

پێداگربووبان. بەڵکو فەلسەفە لایەنگری تیۆرەکانی ئایینی دەکرد و ئایینیش بەرهەمەکانی فەلسەفەی تەواو دەکرد. ئەگەر مەعریفەی فەلسەفی کۆڵەگە و ئامانجی دەروونی مرۆڤ بێت، ئەوە عەقیدەی ئایینی ژیانی ئەو دەروونەیە، یا رێگەیەکە بۆ ئەو ئامانجە. کاتێك ئەقڵ خەلیفەی خودایە لەسەر زەوی، بوونی ناکۆکی نێوان ئەقڵ و وەحی مەحاڵە.

دوای ئەوەی ئەو رەوتەمان روونکردەوە کە بەسەریاندا زاڵە، قسەکردن لەمەڕ ورد و درشتی ئەو کایانە لاف و گەزافێکی بێ کەڵکە. دەرکەوتنی سەجستانی و گرووپەکەی دەوروپشتی لە مێژووی شارستانیەتدا گرنگی و مەترسی خۆی هەیە، بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە درێژەدان بە بونیادی فەلسەفە لە ئیسلامدا هیچ پێگەیەکی نییە. ئەو شتەی لای فارابی کاکڵەی ژیانی ئەقڵبوو، زۆرینەی جار لای شیعەکانی ئەبی سولەیمان دەبووە بابەتی لێهاتووی لە مشتومڕدا.

## ٣- ئیبن مەسکەویە[٨٥]:

### ١- پلە و پایەی:

ئێستا گەیشتینە خاڵی گواستنەوە لە سەدەی دەیەمەوە بۆ سەدەی یانزەهەم، قوتابییەکانی فارابی هەموو لەنێوچوون. ئیبن سینا ئەو پیاوەی کە توانی دەرگای ژیانێکی تازە بە رووی فەلسەفەی پێشنیانیدا بکاتەوە، هێشتا منداڵ بوو. بەڵام پێویستە لێرەدا باسی پیاوێك بکەین کە لە راستیدا پتر لە کیندی دەچێت نەك فارابی، گەرچی لە هەندێ خاڵدا لەگەڵ فارابیدا هاوڕایە، ئەوەش لەبەر ئەوەی هەردووکیان لە یەك چاوگە ئاویان خواردۆتەوە. هاوکات ئەو پیاوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خاوەنی ئەقڵە بلیمەتەکانی ئەو چەرخە لەکایەی بیرکردنەوەی میتافیزیکی پشت بە لۆژیك بەستوو، مەیلیان بەلای فارابییەوە نەبووە.

ئەو پیاوەش ئەبو عەلی بن مەسکەویەی پزیشك، زمانزان، مێژوونوسە، کە لەلای سوڵتان عەززدولدەولە و خەزنەدارەکانی، خاوەن رێز و پلە و پایە بووە، لە تەمەنێکی زۆر پیردا لە ساڵی ١٠٣٠ ز کۆچی دواییکردووە. ئیبن مەسکەویە مەزهەبێکی فەلسەفی لە ئاکارناسیدا لە

(٨٥) أبو علی أحمد بن یعقوب مسکویە. **قفطي** دەڵێ تا ساڵی ٤٢٠ی کۆچیی ژیاوە، یاقوتیش دەڵێ: لە ٩ی سەفەری ساڵی ٤٢١ی کۆچیی مردووە. (و.ع)

دوای خۆی بەجێهێشتووە تا ئێستاش لە ڕۆژهەڵاتدا خاوەن کاریگەریە. ئەو مەزهەبە تێکەڵەیەکە لە بیروباوەڕەکانی ئەفلاتون و ئەرەستۆ و گالینۆس و ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلامی، گەرچی رەوتی ئەرەستۆی بەسەردا زاڵە، ئیبن مەسکەویە لە مەزهەبەکەیدا (ماهیەتی دەروون)ی کردۆتە بابەتی لێکۆڵینەوە.

## ٢- سروشتی دەروون:

ئیبن مەسکەویە دەڵێ: "دەروون جەوهەرێکی سادەیە، واتە شتێکی رووحییە[٨٦]"، پەی بە بوونی خۆی دەبات، بە زانایی خۆی ئاگایە و کاریش دەکات. هەروەها دەڵێ: دەروون جەستە نییە و لە یەك کاتدا وێنەی شتگەلی زۆر پێکدا وەردەگرێ، بۆ نموونە مانای سپێتی و رەشێتی، لەکاتێکدا جەستە لە یەك کاتدا تەنها رەش یا سپی وەردەگرێ نەك پێکەوە. هەروەها دەروون وێنەی هەموو شتە زەیینی و بەرهەستەکان پێکەوە وەردەگرێ، وێنەی درێژی نابێتە هۆی روودانی هیچ درێژییەك لە دەرووندا، زیادکردنی مانای درێژیش، درێژی درێژتر ناکات.

توانا و زانیاری دەروون زۆر لە مەودای جەستە فراوانترە، بگرە سەرتاپای جیهانی بەرهەستەکان ناتوانن دەروون تێر بکەن. سەرباری ئەوەش لە دەرووندا مەعریفەیەکی ئەقڵانی سەرەکی هەیە، کە هەرگیز ناکرێ لە رێگەی هەستەکانەوە بۆی هاتبن، چونکە دەروون بەهۆی ئەو مەعریفەیەوە دەتوانێ راست لە درۆی ئەو شتانە جیابکاتەوە کە لە رێگەی هەستەکانەوە بۆی دێن. ئەوەش بەبەراوردکردنی پەیبردنە هەستیەکان و لێکجیاکردنەوەیان، بەم کارەیشی لە کاری هەستەکان، باڵاتر دەبێت و هەوڵەکانیان راست دەکاتەوە، هەروەها یەکێتی ئەقڵیی دەروون پتر لەوەدا دەردەکەوێ کە دەتوانێ پەی بە خۆی ببات و بە زانایی خۆی ئاگایە. ئەم یەکیەتیەش لە دەرووندا وا دەکات "ئەقڵ و ئەقڵمەند و شتە ئەقڵانیەکان ببن بە یەك شت"[٨٧].

---

(٨٦) واتە دەروون نە جەستەیە و نە بەشێکە لە جەستە، هەروەها رواڵەتیش نییە. ص٣-٤ (و.ع).

(٨٧) مسەکەویە دەڵێ: هەستەکان تەنها هەست بە شتە بەرهەستەکان دەکەن، بەڵام دەروون پەی بەهۆکاری لێکچوون و هۆکاری لێك نەچوونی بەرهەستەکان دەبات. راستە دەروون زۆرێك لە مەعریفەکانی خۆی لە هەستەکانەوە وەر دەگرێ، بەڵام مەعریفە باڵاکانی لە هەستەکانەوە پێ ناگات، بۆ نموونە ئەگەر دەروون ووتی

دەروونی مرۆڤ بە روانگەی ئەقلانیانە لە دەروونی ئاژەڵ جیا دەکرێتەوە، کە مرۆڤ لە هەڵسوکەوتەکانیدا دەری دەکات، کە دیارە روانگەیەکی بەرەو کاری چاکەیە.

**٣- بنەماکانی ئەخلاق:**

چاکە بە مانا گشتیەکەی ئەوەیە بە بوونەوەران بە ئامانجی بوون یا کەماڵی بوونی خۆیان بگەن، هەڵبەت هەر دەبێ لە بونەوەردا ئامادەباشی بەرەو ئەو ئامانجە هەبێت تاکو ببێت بە چاکە، گەرچی خەڵکی لەو ئامادەباشیەدا جیاوازییەکی جەوهەرییان هەیە.

ئیبن مەسکەویە پێی وایە گرووپێکی خەڵکی هەن بە سروشت چاکەکارن، بەڵام گرووپێکی کەمن، و هەرگیز نابن بە خراپەکار، چونکە هەر شتێك بە سروشت بێ، ناگۆڕێ. بەڵام خراپەکاران زۆرترن و هەرگیزیش نابن بە چاکەکار، هەروەها هەندێ کەس هەن بە خۆرسك نە سەر بەمانن و نە سەر بەوانن، ئەمانە بە پەروەردەکردن یا هاونیشینی و هاوڕێیەتی چاکەکاران یا خراپەکاران چاك یا خراپ دەبن.

چاکەش یا گشتیە یا تایبەتە، هەروەها چاکەی ڕەهاش هەیە، کە هەر بوونەوەری باڵا و زانستی باڵایە. چاکەکاران هەموویان لە هەوڵی گەیشتن بە چاکەی ڕەهادان، گەرچی هەموو کەسێك لە رووی زاتیەوە چاکەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە کە لە هەستکردنی بە کامەرانی و چێژ دەردەکەوێ. ئەو چاکە تایبەتەش تەنها لەو کار و هەڵسوکەوتانەی بونەوەردا دەردەکەوێ کە تایبەتە بە وێنەی خۆی.

بە گشتی مرۆڤ ئەگەر هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤانە بن، چاك و دڵخۆش دەبێت[٨٨]. فەزیلەت کاروکردەوەی مرۆڤە بەگوێرەی وێنەی راستەقینەی خۆی. بەڵام لەبەر ئەوەی مرۆڤایەتی بە شێوەی جیاواز لە تاکەکاندا دەردەکەوێ، بۆیە کامەرانی و چاکەش لای هەموو خەڵکی بە یەك رادە نییە.

---

هەستەکان درۆزن و فریودەرن ئەوە ئەو حوکمەی لە هەستەکانەوە وەر نەگرتووە، (چونکە هەست دژی خۆی نییە)، هەروەها دەروون زۆرێك لە هەڵەی هەستەکان راست دەکاتەوە. **تهذیب ص٥.**

(**٨٨**) مەسکەویە دەڵێ: هەبوو ئەگەر پێدوایستیەکانی سروشتەکەی وەدیهاتن ئەوە کامەران و ئاسودە دەبێت، مرۆڤیش سروشتێکی تایبەت بەخۆی هەیە کە دەروونی ئەقڵمەندە، ئەگەر کاروکردەوەی نا کامڵی لێ بەدیکرا ئەوە لە پلەی مرۆڤبوونی دێتە خوارەوە، مەسکەویە پێی وایە دەبێ مرۆڤ وریای فەزیلەتی دەروونە

هەروەها ئەگەر تاك پشت بەخۆی ببەستێ و هانا بۆ خەڵکی تر نەبات، ناتوانێ تەواوی چاکیەکان بەدی بهێنێ، بۆیە پێویستە بەشداری کۆمەڵی خەڵکی بکات و هاوکاریان بکات. کەوایە بنچینەی فەزیلەتەکان و یەکەم ئەرکی گشتی ئەوەیە مرۆڤ هەموو خەڵکی خۆشبوێ، بەبێ ئەو خۆشەویستی و موحیببەتە هەرگیز کۆمەڵ دروست نابێت.

مرۆڤ ئەگەر لە رێگەی هاورگەزەکانی خۆی و بەهاوکاری ئەوان نەبێت هەرگیز ناگات بە کەماڵ، بۆیە پێویستە ئاکارناسی، زانستێك بێت مرۆڤ لە ئاکار و هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتیەکانی خۆیدا پەیڕەوی لێ بکات. ئەرەستۆ گوتەنی: خۆخۆشەویستنی مرۆڤ، درێژەی نابێ تا ئەو خۆشەویستیە خەڵکانی دیکەش نەگرێتەوە، بەڵکو ئەوە تەسککردنەوەی بازنەی خۆخۆشویستنە، یا نموونەیەکە لە خۆشەویستی دراوسێ، ئەو خۆشەویستیەش —وەکو فەزیلەتەکانی تر- شوێنەوارەکەی تەنها لە شار و کۆمەڵگەدا دەردەکەوێ، واتە شوێنەواری ئەو خۆشەویستیە لە دوورەپەرێزی ئەو قەشە تەرکە دونیایەدا دەرناکەوێ کە لە دونیا هەڵاتووە. ئەو یەکتاپەرستەی کە خۆی لە خەڵکی دوورەپەرێز دەکات و پێی وایە ئەهلی چاکە و دادپەروەرییە، ئەوە فریودراوە و حەقیقەتی کارەکانی خۆی نازانێ[٨٩]. دەشێ کارەکانی ئایینی بن، بەڵام بێگومان ئاکاری نین، بۆیە کارەکانی نابنە بابەتی ئاکارناسی.

ئیبن مەسکەویە پێی وایە گەر بە دروستی لە ئەحکامەکانی شەریعەت تێ بگەین، ئەوە شەریعەت دەبێتە مەزهەبێکی ئاکاری کە بنەماکەی خۆشویستنی مرۆڤە بۆ مرۆڤ. ئایین وەرزشێکی ئاکاری دەروونی مرۆڤە، ئامانجی دروشمە ئایینییەکانی وەك نوێژی جەماعەت و حەج بریتیە لە چاندنی فەزیلەت لە دەروونی مرۆڤدا، ئەو دروشمانە بە باشترین شێوە خەڵکی فێری خۆشویستنی یەکتر دەکەن.

---

قسەکەرەکەی بێت، کە بەهۆیەوە هەندێ کەس لەهەندێ کەسی تر باشتر دەبن، یا هەندێ کەس لە هەندێ کەسی تر مرۆیی تر دەبن. **تهذیب ص٢٩.**

(**٨٩**) هەروەها مەسکەویە دەڵێ: هەر کەسێك خەریکی زوهد و گۆشەگیری بێت ئەوە ستەم لە کەسانی تر دەکات، چونکە داوای هاوکاری لە خەڵکی دەکات و خۆیشی هاوکاری کەس ناکات، ئەمەش ستەم و خراپەکارییە، لای مەسکەویە پێویستە مرۆڤ لەبری ئەو شتانەی وەری دەگرێ شتیش ببەخشێ، هەروەك ئەوەی ژیانی شارستانی و مەدەنی پێویستی پێیەتی. (و.ع)

گەرچی مەسکەویە نە لە تەباکردنی سەرجەم تیۆرە ئاکارییەکانی یۆنان کە خستبویە نێو مەزهەبەکەی خۆیەوە، سەرکەوت، و نە لە تەباکردنی ئەو تیۆرە ئاکارییانەی یۆنان و ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلامی سەرکەوت. نامەوێ بچمە ناو ئەم بابەتەوە، بە کورتی پێویستە بڵێین مەسکەویە لە دارِشتنی مەزهەبە ئاکارییەکەی، نەپابەندی لق و پۆپی مەزهەبە فیقهیەکان بووە و نە پابەندی مەیلی سۆفیگەراکان بۆ زوهد بووە.

هەروەها پێویستە دان بەوەدا بنێین ئەم فەیلەسوفەی لەمەرِ ئێمە لە دامێنی مەزهەبەکەیدا، پتەوی بیرکردنەوە و فراوانی زانیاری دەردەکەوێ.

## ٤- ئیبن سینا

### ١- ژیانەکەی:

ئەبو حسێن بن عبدالله بن سینا ساڵی ٩٨٠ز لە ئافشنە نزیك بوخارا لە خانەوادەیەك کە سەرقاڵی خزمەتکردنی دەوڵەت بوون، لەدایکبووە. هەر لە ماڵی باوکیدا زانستە ئەقڵی و شەرعیەکانی خوێندووە، لەو ماڵەدا داب و نەریتی فارسییانە و دژە ئیسلام باوبوو، ئەقڵ و جەستەی ئەو گەنجە زۆر زوو پێ گەیشت، فەلسەفە و پزیشکی لە بوخارا خوێند، لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا توانی شفای نەخۆشییەکەی ئەمیر نوحی کورِی مەنسور[٩٠] بدا، ئیدی ئەمیرە رێگەی پێدا بچێتە ناو کتێبخانەکەیەوە، ئیتر ئیبن سینا خۆی خوێندنەوەی کتێبەکانی وەئەستۆ گرت و حەزی چووە سەر زانستی پزیشکی، لە لێکۆڵینەوە زانستی و پراکتیکیەکاندا خۆی بوو بە مامۆستای خۆی، هەروەها زانی چۆن کەڵك لە ژیان و کولتوری سەردەمەکەی وەربگرێ.

ئیبن سینا لە بەشداریکردنی کاری سیاسی وڵاتە بچوکەکانی ئەو سەردەمە، بەردەوام لە تاقیکردنەوەی بەختی خۆیدابوو، سەربەخۆیی و هێزی کەسایەتی وای لێکرد سەر بۆ هیچ ئەمیرێك لەو ئەمیرانە دانەونێنێ کە پەیوەندییان پێوە دەکرد، هەروەك ملکەچی هیچ یەك

---

(٩٠) **الأمیر** أبو القاسم نوح بن منصور بن نوح السامانی، ساڵی ٣٨٧ی کۆچیی مردووە، وەختێك نەخۆش کەوتووە باسی ئیبن سینایان کردووە، ئەویش لەدووی ناردووە و لەسەر دەستی ئەو شیفای نەخۆشیەکەی هاتووە. (و.ع).

لەو مامۆستايانەش نەدەبوو کە زانستی لێوەردەگرتن. ئەوەش دەبووە هۆی ئەوەی ئیبن سینا ئەم کۆشك بەرەو کۆشکێکی دیکە بەجێبهێڵێ و لەوێشەوە بۆ یەکێکی تر. لە هەر کۆششێکیشدا خەریکی کارێك بوو، جارێك بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەت، جارێکی دیکە بە خوێندن و پۆلینکردنی کتێب، تەنانەت لە حکومەتەکەی شمس الدولە لە هەمەداندا بوو بە وەزیریش. دوای مردنی ئەو ئەمیرە و هاتنە سەرتەختی کوڕەکەی، ئەو کوڕە ئیبن سینای خستە زیندانەوە و چەند مانگێك لەوێ مایەوە، پاشان ئیبن سینا گەیشتە ئەنجومەنی عەلا الدولە لە ئەسفەهان، دوای ئەوەی عەلاالدولە داوەتی کرد، ساڵی ١٠٣٧ لە هەمەدان لە تەمەنی پەنجا و حەوت ساڵێدا کۆچی دوایی کرد. تا ئەمڕۆ گۆڕەکەی لەو شارەدا بەناوبانگە.

**٢- هەوڵەکانی ئیبن سینا:**

گومانی تێدا نییە گەورەترین هەڵە کە مێژوونوسانی فەلسەفەی ئیسلامی تێی کەوتوون، ئەوەیە پێیان وایە ئیبن سینا لە فارابی ئەرەستۆتالیستتربووە، بەڵام ئیبن سینا کە بە تەنگ ژیانی دونیاوە بووە، چ پێویستی دەکرد لە قوڵایی دەروونیەوە گرنگی بە فەلسەفەی ئەرەستۆ بدات؟، هەروەها ئیبن سینا لە روحی هیچ مەزهەبێك لە مەزهەبەکان قوڵ نەبۆتەوە، بەڵکو هەر شتێکی بینیبێ و لەگەڵ و مەیل و ئارەزووەکانی گونجابا وەری گرتووە، بەو راڤە رواڵەتیانە کاریگەربوو کە تەمیستیۆس (themistuis) بۆ مەزهەبی ئەرەستۆ کردبووی، بۆیە ئیبن سینا بوو بەو مەزنە فەیلەسوفەی خۆرهەڵات کە سەرجەم مەزهەبەکانی لە کتێبەکانی کۆکردۆتەوە، هەروەها پێشکەوترین نوسەری پووختنوس بووە لە جیهان.

ئیبن سینا دەیزانی چۆن بابەتی باسەکەی کۆبکاتەوە کە لە هەموو لایەکەوە وەری دەگرت، کۆکردنەوەیەك لێهاتوویی و دەستڕەنگینی لێدەچۆڕا، هەروەك دەیزانی چۆناوچۆن لە وێنەیەکی ئاساندا بیخاتەروو، لەگەڵ هەموو ئەوانشەدا بێ هەڵە نەبوو.

لە هەموو دەقیقەیەکی ژیانی شتێکی بەرهەمدەهێنا، لە رۆژدا خەریکی کاروبارەکانی دەوڵەت بوو، یا خەریکی وانەوتنەوە بوو، هەندێ شەوانی تایبەت کردبوو بە بەزم و قسەی

خۆش و ئاهەنگ و کۆبوونەوە[٩١]، هەندێ شەوانیش سەرقاڵی نوسین بوو، قەڵەمەکەی بەدەستەوەبوو و پێکێ شەرابیش لەلایەوە، نەوەکا خەو بیباتەوە[٩٢].

ئەو هەوڵ و کۆششانەی بە گوێرەی کات و بارودۆخ جیاوازبوون، ئەگەر لە کۆشکی ئەمیر بووبا و کاتی بەتاڵی هەبوایە، کتێبی لەدەستدابوو، یا سەرقاڵی نوسینی کتێبی (قانون)ی پزیشکی بوو، یا خەریکی نوسینی ئینسکلۆپیدیا فەلسەفییە گەورەکەی بوو، بەڵام لە کاتی گەشت و سەفەردا نامیلکە و پوختنامەی دەنوسی، کە لە زیندانیشدا بوو شیعری دەنووسی، یا بە شێوازێکی جوان خەریکی تێڕامانی ئایینی بوو، نامیلکە بچوکەکانی لەمەڕ حیکمەتی خۆرهەڵاتیانە لێوان لێوبوو لە سیحر و جوانی شیعر.

هەروەها هەرکات داوای لێکرابا، زانست و لۆژیك و پزیشکی لە قاڵبی شیعریدا دادەڕشت، ئەم شێوازەش لە سەدەی دەیەمی زایینیدا وردە وردە خەریکبوو پەرەی دەسەند.

وێڕای هەموو ئەوانەش گەر ویستبای بە زمانی عەرەبی و فارسی شتی دەنوسی، لە کەسایەتی ئیبن سینادا پیاوێکی بارهاتوو بە سەرجەم کون و قوژبنەکانی زانستەکان دەبینین.

ژیانیشی تارادەی زێدەڕۆیی لێوانلێبوو لە کار و خۆشی و چێژ.

لە هەڵکەوتوویی و لێهاتوویدا لە خوار فردەوسییە[٩٣] (٩٤٠-١٠٢٠ز) ی گەورە شاعیری فارسەوە بوو. کە لە ئیبن سینا بە تەمەنتر بوو. لە بلیمەتی زانستیدا لە خوار (بەیرونی)ـەوە بوو کە هاوسەردەمی خۆی بوو، تا ئێستاش ئەو دوو پیاوە پێگەیەکی مەزنیان هەیە.

گەرچی ئیبن سینا دەربڕی رووحی سەردەمەکەی بوو، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری فراوانی خۆی و پلەوپایەکەی لە مێژوودا. ئیبن سینا وەکو فارابی نەکرد لە توانەوە لە ژیانی گشتی و قوڵبوونەوە لە خوێندنەوەی شەرحی مەزهەبەکەی ئەرەستۆدا. بەڵکو ئەم زانستی

---

(٩١) أبو عبید دەڵێ: هەموو شەوێك خوێندکارەکان لە ماڵی ئیبن سینا کۆ دەبوونەوە و کتێبیان دەخوێندەوە، ئەگەر لە خوێندنەوەش تەواوبووبان، سترانبێژیان دەهێنا و دەیانخواردەوە و دەیانکردە بەزم و سەما. (و.ع).

(٩٢) أبن سینا لە زمانی أبو عبیدەوە دەگێڕێتەوە: (شەوانە کە دەگەڕامەوە بۆ ماڵ، چراکەم دەهێنا و سەرقاڵی نوسین و خوێندنەوە دەبووم، ئەگەر خەویشم هاتبا یا هەستم بە سستی و لاوازی کردبا، پێکێ شەرابم نۆش دەکرد تا هێزم بێتەوە بەر، ئینجا دەچوومەوە سەر خوێندنەوە) .(و.ع).

(٩٣) أبو القاسم الفردوسی خاوەنی شاهنامە (کتێبی پاشاکان)، ئەم کتێبە نزیك بە شەشت هەزار بەیتە شیعرە، هوارد (huart) دەڵێ فیردەوسی ساڵی ٣٢٠ی کۆچیی لەدایکبووە و ساڵی ٤١١ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

یۆنانی و حیکمەتی شەرقی تێکەڵ کردبوو. دەیوت ئەوەندەی لەسەر شەرحی مەزهەبە کۆنەکان نوسیومانە، ئێستا دەمانتوانی فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆمان دابمەزرێنین، بەو کارەشی دەیویست فۆرمێکی نوێ بە تیۆرە کۆنەکان بدات.

### ٣- لقەکانی فەلسەفە، لۆژیك:

ئیبن سینا لە پزیشکیەکەیدا هەوڵیدەدا مەسەلەکان لە چوارچێوەیەکی رێك و پێکدا بخاتەروو، بەڵام لەو زانستەدا زۆر ورد و لۆژیانە نەبوو، ئیبن سینا لانی کەم لە رووی تیۆریەوە پێگەیەکی گەورەی بە ئەزموون داوە، بۆ نموونە بەدرێژی باسی ئەو مەرجانەی کردووە، کە ئەو پرەنسیپە فەلسەفیانەی کە لە پزیشکیدا هەن دەبێ لە فەلسەفەوە بخوازرێن، راستیەکەی فەلسەفە دابەش دەکرێتە سەر لۆژیك و سروشت و ئیلاهیات، فەلسەفەش بە گشتی زانستی بونەوەران وەکو ئەوەی کە هەیە دەگرێتەوە، هەروەها ئەو پرەنسیپانەش دەگرێتەوە کە زانستە بەشەکیەکانی لەسەر وەستاوە، هەر بەهۆی فەلسەفەشەوە دەروونی فەلسەفەکار دەگاتە گەورەترین کەماڵ.

(بوون) یا زەیینیە کە بابەتی سەروسروشتە (میتافیزیکایە)، یا ماددەی بەرهەستە کە بابەتی سروشتە، یا زەینی وێناکراوە کە بابەتی لۆژیکە. بابەتی سروشت نە بوونی هەیە و نەدەکرێ بوونی وێنا بکرێ، بێ بەریە لە ماددە. بەڵام بابەتی میتافیزیکا هەرگیز تێکەڵ بە ماددە نابێ. بابەتی لۆژیك بە شێوەی داماڵێن لە ماددە داماڵراوە، لە هەندێ رووەوە لە بابەتی بیرکاری دەچێت، چونکە بابەتی بیرکاری بە شێوەیەکی داماڵین لە ماددەوە وەرگیراوە، بەڵام دەکرێ هەمیشە لە ماددەدا وێنا بکرێ و پێك بهێنرێ، لە کاتێکدا بابەتی لۆژیك تەنها لە زەیندا بوونی هەیە وەك مانای: یەکبوون، زۆری، گشتی، تایبەتمەندی، ئەگەر، پێویست و ئەو جۆرە شتانە، لۆژیك زانستی ماناکانە، هەروەك ئەو وێنەیەیە کە فیکر دیاری دەکات.

لۆژیکی ئیبن سینا بە گشتی لەگەڵ لۆژیکی فارابیدا تەبایە، ئەگەر بابەتە لۆژیکیەکانی فارابیمان بەدەست گەیشتبا رەنگە باشتر ئەو تەباییەمان بینیبا. ئیبن سینا زۆرجار جەختی لەسەر کەموکوڕی ئەقڵی مرۆیی کردووە، ئەو کەموکورتیەش وا لە ئەقڵ دەکات پێویستی بە یاسا لۆژیکیەکان بێت. هەروەك چۆن روخسارناسەکان (فسیۆگنۆمیست – physiognomist) لە روخساری تاکەکەسدا ئاکارە دەرونییە ناوەکیەکانیان هەڵدەهێنجێنن، ئاواش لۆژیکناسان لە

پێشەکییە زانراوەکانەوە دەگەن بە پەنهانەکان. لەبەر ئەوە هەڵێنجان بە ئاسانی دەکەونە هەڵەی خەیاڵکردو هەستکارییەوە. کەوایە پێویستە هەستکاری کۆشش بکات تا لە خەیاڵکارییەوە بگات بە مەعریفەی بێگەردی ئەقڵ کە بەهۆیەوە دەتوانین بگەین بە حەقیقەتە یەقینیە رەهاکان. خەڵکی کۆچەری پێویستیان بە فێربوونی رێزمان نییە، بەڵام هەموو کەس پێویستی بە لۆژیك هەیە، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە لایەنگری سروشی خودایین.

هەروەها ئیبن سینا هەر بە شێوازی فارابی باسی بابەتی (کۆ - کلیات)ی کردوە، ئیبن سینا پێیوایە شتەکان بەر لەوەی زۆربن، بونێکن تەنها خودا دەیزانێ و لە ئەقڵی فریشتەکاندا هەیە، جا ئەو شتە رووبەرووی زۆربوون دەبێتەوە، ئەوەش دوای ئەوەی وێنەیەکی ماددی بەخۆوە دەگرێ، پاشان پێشدەکەوێ و تایبەتمەندییە دەستنیشانکراوەکانی لەسەر لادەچێ. تا لە ئەقڵی مرۆڤدا مانایەکی گشتی وەردەگرێ. هەروەك ئەرەستۆ جیاوازی لە نێوان جەوهەری یەکەم (بەش) و جەوهەری دووەم (کۆ —گشت ئەقڵانی) کردووە، دەبینین ئیبن سیناش جیاوازی لە نێوان مانا (Notion- Intention)ی یەکەم و مانای دووەم کردووە، یەکەمیان پەیوەستە بە (خودی شتەکان) و دووەمیان پەیوەستە بە بیرکردنەوەی ئێمە یا مانا ئەقڵانیەکان (گشتەکان).

### ٤- میتافیزیکا و سروشت:

بەڵام لە سروشت و میتافیزیکادا ئیبن سینا جیاوازە لە فارابی، ئەم جیاوازییە پتر لەوەدا دەردەکەوێ کە ئیبن سینا پێی وایە ماددە لە خوداوە سەرچاوە ناگرێ، بەو قسەیەش هەموو شتە زەیینیەکان دەکەوتنە سەرووی ماددیەکانەوە، بەم هۆیەوەش پلە و پایەی دەروون بەرز دەبێتەوە، وەك ئەڵقەی پەیوەندی نێوان جیهانی ئەقڵانی و جیهانی جەستەکان. ئێمە لە رێگەی تێڕامان لە مانای (پێویست و ئەگەر واجب و ممکن) دەتوانین بگەین بەوەی کە هەبوویەکی خۆبەدیهێن هەیە، ئیبن سینا پێی وایە پێویست ناکات ئافرێنەر لە رێگەی ئافرێندراوەکانیەوە بناسین، بەڵکو پێویستە لە ئەگەردا ئەوەی هەیە و دەشێ لە ئەقڵدا هەبێ و هەبووی یەکەم خۆبەدیهێن، کە بوونیشی هەر جەوهەری خۆیەتی، هەڵێنجێنین.

هەموو ئەو شتانەی دەکەونە ژێر مانگ (ئەگەرن)، بگرە هەسارەکانیش وەکو ئەوەی هەن (ئەگەرن)، بەڵام ئەو هەسارانە، بەهۆی (خۆبەدیهێنێکی)ی دیکەوە بە (خۆبەدیهێن) لە قەڵەم دەدرێن و بێ بەریشن لە زۆری و گۆڕان. (واتە زۆر نابێ و گۆڕانیشی بەسەردا نایە – و.ك).

(خۆبەدیهێن) یەکە و گەشە ناکات، ناشکرێ زۆریی لێوەی سەرچاوە بگرێ. (خۆبەدیهێن)ی یەکەم بریتیە لە خودای ئیبن سینا. دەکرێ سیفەتی (زۆری)ــشی وەپاڵ بدرێ، وەکو ئەوەی پێی بوترێ ئەقڵ و شتی تری لەو جۆرە، گەرچی ناکرێ بە ئەقڵ وەسفبکرێ، مەگەر لە پێناو خستنە سەر نەبێت، نەوەکا لەگەڵ یەکێتی زاتدا بکەوێتە پێکدژییەوە.

تاقانەی یەکەم تەنها یەك شتی لێوە سەرچاوە دەگرێ، ئەویش ئەقڵی یەکەمە. بەڵام زۆربوون لەو ئەقڵەوە دەست پێدەکات، بەڵام کە (هۆکرد)ی خۆی ناسی، بوونی سێیەمی لێوە سەرچاوە دەگرێ، ئەویش ئەقڵی بەڕێوەبەری هەسارەکانی خوارەوەیە، ئەم ئەقڵەش هەر کە خۆی ناسیی دەروونی لێوە سەرچاوە دەگرێ، ئەقڵی هەسارەکانیش بە ناوەندیبوونیان کاری خۆی دەکات، پاشان ئەقڵی یەکەم کە (بوونێکی ئەگەرییە)، تەنەکانی هەسارەی خوارەوەی لێوە سەرچاوە دەگرێ، بەم شێوەیە سەرچاوەگرتن بەردەوام دەبێت. لە هەر ئەقڵێکەوە سێ شت سەرچاوە دەگرێ: ئەقڵ، دەروون، جەستە. جا کاتێك ئەقڵ بەبێ نێوەندێك ناتوانێ جەستە ببزوێنێ، دەروون دەبێ بەو نێوەندە.

دواجار ئەقڵی کارا دێت و ماددەی شتە سەرزەمینیەکان، وێنە رگەزییەکان، دەروونە مرۆییەکانی لێوە سەرچاوە دەگرێ و هەموو ئەو شتانەش بەڕێوە دەبات.

ئەم سەرچاوە لێوەگرتنە ئەزەلییە ناکرێ بە شێوەیەکی دیکە وێنا بکەین و ماددەی لە جێگە دابنێین. ماددەش ئەگەرێکی رووت و ئەزەلی سەرجەم هەبووەکانە. ئەقڵ کار ناکاتە سەر ماددە، ئا لەوێدا کاری ئەقڵ دەوەستێ، ئەمەش پرەنسیپی زۆربوونی سەرجەم (بەش)ــەکانە.

دیارە ئەم بیروباوەڕانە بۆ موسڵمانانی بڕوادار تۆقێنەر بووە، بەڵێ کەلامناسانی موعتەزیلە دەیانگوت خودا توانای کاری خراپەی نییە، هەروەها توانای کارێکی نییە پێچەوانەی حیکمەت بێت. بەڵام لێرەدا دەبینین فەلسەفە دەڵێ: خودا تەنها توانای کردنی ئەو کارانەی هەیە کە لە زاتی خۆیدا مومکینە، نەك ئەو کارانەی خۆیان بەرەهایی مومکینن، هەروەها فەلسەفە دەڵێ تەنها ئەقڵی یەکەم راستەوخۆ لە خوداوە سەرچاوە دەگرێ.

جگە لەوانە، دەبینین ئیبن سینا هیچ هەوڵێکی نەداوە بۆ تەباکردنی فەلسەفەکەی خۆی و بیروباوەڕی خەڵکی موسڵمانان، واتە ئەهلی سوننەت و جەماعەت، ئیبن سینا دەیگوت هەموو ئەو شتانەی هەن، چ چاکە بن یا خراپە، بە هۆی توانای خوداوە هەن، بەڵام خودا تەنها چاکە پەسەند دەکات، خراپە هیچ نییە، واتە شت نییە، ئەگەر لە خوداوەش سەرچاوە بگرێ، تەنها

ڕواڵەتیانە وا دیارە. گەرچی ئەگەر خودا کاتێك ئەم جیهانەی دروستکرد خراپەی لەگەڵدا دروست نەکردایە، ئەوە بۆ خۆی گەورەترین خراپە بوو.

ناکرێ جیهان جوانتر و باشتر بێ لەوەی هەیە، چاودێری خودایی کە ئەڵقەی پەیوەندی دەروونی ئەستێرەکانە، لە سیستەمێکی جیهانی دڵڕفێندا دەردەکەوێ. خودا و شتە ئەقڵانیە پەرتەکان تەنها (گشت)ـەکان دەناسێ و گرنگی بە (بەش)ـەکان نادات. بەڵام لەبەر ئەوەی دەروونی ئەستێرەکان دەتوانن پەی بە (بەش)ـەکان ببەن و ئەقڵێش بەهۆی ئەو دەروونانەوە کار دەکاتە سەر جەستە، بۆیە دەکرێ باسی چاودێری خودایی لەمەڕ (بەش)ـەکان و تاکەکەسەکان بکەین، لەو ڕێگەیەوەش دەکرێ وەحی و ئەو جۆرە شتانە بسەلمێنین.

وا دەردەکەوێ، لای ئیبن سینا مەحاڵ نییە، جەوهەرێك لە هیچەوە دروست ببێ، یا دوای بوونی، ببێ بە هیچ. ئەوەش پێچەوانەی بۆچوونی جوڵەی بەردەوامە یا دەرچوونی وردە وردەی شتەکانە لە ئەگەرەوە بۆ بوون. قسەکانی ئیبن سینا لەمەڕ پەیوەندی نێوان چەشنەکانی هەبووی وەك ئەقڵ و جەستە، فۆرم و ماددە، جەوهەر و ڕواڵەت، بە گشتی تەمومژاوی و لێڵن. بەگشتی موعجیزە لە فەلسەفەی ئیبن سینادا پێگەیەکی تایبەتی هەیە. ئیبن سینا پێی وایە لەو هەڵچوونە بەهێزە دەروونیانەی لە پڕ دەبنە هۆی گەرمیەکی توند، نموونەیەکی ئەو شوێنەوارە موعجیزانە هەیە کە لە دەروونی گشتیدا ڕوودەدەن، با ئەو دەروونە لەسەر یاسای سروشتیش بەڕێوە بچێ.

لەگەڵ ئەوەی ئیبن سینا باسی ئەم ئامادەباشیانەی دەروونی کردووە، کەچی بە کەمی کەڵکی لێوەرگرتوون یا بە کەمی لە فەلسەفەکەیدا پشتی پێ بەستوون. ئیبن سینا بە بیانووی ئەقڵی بێگەرد دژایەتی ئەستێرەناسی و کیمیاگەری کردووە، کەچی هێشتا نەمردبوو دروشمی ئەستێرەناسیان وەپاڵ دا. هەندێ لە چیرۆکە میللیە تورکیەکانیش وەکو جادوگەر وێنایان کردووە، دەشێ لەو چیرۆکانەدا ئەو وێنەیە جێگەی سۆفیگەری کۆنی گرتبێتەوە.

گەورەترین کۆڵەگە کە مەزهەبی سروشتی ئیبن سینای لەسەر وەستاوە ئەو گریمانەیەیە کە دەڵێ: جەستە ناتوانێ ببێتە بکەر، بکەر هەمیشە هێزە یا فۆرمە یا دەروونە یا ئەقڵە، هەڵبەت بە هاوکاری دەروون. بەلای ئیبن سیناوە جیهانی سروشتی هێزێکی پلەبەندی بێ سنوری هەیە، گرنگترین پلەش لە خوارەوە بۆ سەرەوە بەم شێوەیەیە: هێزەکانی سروشت، ڕووەك، ئاژەڵ، دەروونی مرۆیی، دەروونی گشتی.

### ٥- مرۆڤ و دەروونی مرۆیی:

فارابی هەموو سەرنجی خۆی خستبووە سەر ئەقڵی بێگەرد، هەر بۆ خۆی مەیلی بەلای تێڕاماندا بوو، بەڵام ئیبن سینا هەمیشە گرنگی بە دەروون دەدا. هەروەك چۆن لە پزیشکیشدا جەستەی خستبووە ژێرچاو. لە فەلسەفەکەشیدا دەروونی خستبووە بەرچاو، بگرە ئینسکلۆپیدیا فەلسەفیەکەی ناولێنابوو بە (الشفاء) واتە: شفای دەروون، بۆیە دەروونناسی تەوەری فەلسەفەکەی بوو.

مەزهەبە مرۆییەکەی ئیبن سینا لەمەڕ مرۆڤ، دوالیزمی بوو (واتە مرۆڤ لە جەستە و دەروون پێکهاتووە)، لە جەوهەردا لە نێوان جەستە و دەرووندا هیچ پەیوەندییەك نییە. هەروەها هەموو جەستەکان بەرهەمی تێکەڵبوونی توخمەکانن بەهۆی هەسارەکانەوە، جەستەی مرۆیی لە هاوسەنگترین تێکەڵاوبوونی توخمەکان پێکهاتووە، بۆیە دەشێ جەستە بە شێوەیەکی سروشتی دروست ببێ، هەروەها دەشێ بوون و لەناوچوونی جۆری مرۆڤیش هەر بەو شێوەیە بێ، بەڵام دەروون زادەی تێکەڵاوبوونی توخمەکان نییە، هەروەها وێنەیەکی پێویستی جەستەش نییە، بەڵکو رواڵەتی جەستەیە، بەڵام هەموو جەستەیەك دەروونێکی تایبەت بە خۆی هەیە کە بۆ ئەو جەستەیە نەبێ بۆ هیچ جەستەیەکی دیکە نابێ، ئەقڵی کاراش لەوەوە سەرچاوە دەگرێ.

هەموو دەروونێك لە سەرەتادا جەوهەرێکی بەشەکیانەی سەربەخۆیە، تا ئەو ماوەیەی لە دەروونیشدا دەمێنێتەوە تاکیەتی و سەربەخۆیی هەر لە زیادبووندایە.

ئەو قسەیەش لە روویەکەوە ناگونجێ لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ مادە، بنەمای زۆربوونی بەشەکانە. بەڵام ئیبن سینا ئێمە دەروونی باڵاتر کردووە، هەروەك چۆن باوك سەرسامی کوڕە لێهاتووەکەیەتی، ئەویش ئاوا سەرسامی دەروون بوو.

ئیبن سینا بە ئاسانی بڕوای بەو شتانە نەکردووە کە بینیونی، زۆرجار ئاگاداری کردوینەوە لەوەی نەوەکا پەلە بکەین لە پەسەندکردنی نهێنی سەیروسەمەرەکانی دەروون و هێزە سەروئاساکانی. بەڵام زۆر باسی لەهێزە سەیرو جیاوازەکانی دەروون و ئەو شوێنەوارانەکردووە کە لێوەی سەرچاوەیان گرتووە. دەروون رێگا پێچاوپێچ و فرە رێچکەکانی ژیان دەگرێتە بەر و هەڵدێرەکانی (نەبوون) و پلە جیاوازەکانی (بوون) تێدەپەڕێنێ.

هێزە تیۆرییەکان باشترین هێزەکانی دەروونن. هەستە دەرەکی و ناوەکیەکان، جیهان بە دەروونی هۆشمەند دەناسێنن، ئیبن سینا بە شێوەیەکی تایبەت گرنگی بە تیۆرەی هەستە ناوەکیەکان یا هێزە خەیاڵکردەکانی نێوان هەست و ئەقڵ کە مەڵبەندەکەی مێشکە، داوە.

فەیلەسوفە پزیشکەکان باسی سێ هەستی ناوەکی یا سێ قۆناغی پرۆسەی وێناکاری دەکەن:

١- کۆکردنەوەی کۆی ئیدراکە هەستیە بەشەکیەکان و کردنیان بە وێنەیەکی گشتی، ئەوەش دەکەوێتە پێشەوەی مێشك.

٢- هەڵسوکەوتکردن بەو وێنانەی لە هەستە هاوبەشەکاندان و هەموارکردنیان بە هاوکاری وێنەکانی پێشتر، مەبەستم ئیدراکە، ئەوەش دەکەوێتە بۆشایی ناوەڕاستی مێشك.

٣- عەمبارکردنی وێنە ئیدراکیەکان لە یادەوەری، کە مەڵبەندەکەی کۆتایی مێشکە.

بەڵام ئیبن سینا لە شیکاردا لەو فەیلەسوفانە واوەتر چووە، دەبینین لە بۆشایی پێشەوەی مێشك جیاوازی لەنێوان هەستە هاوبەشەکان و یادەوەری دەکات کە ئەمباری وێنە هەستە هاوبەشەکانە.

هەروەها پێی وایە ئیدارك کە ئەرکی بۆشاییی ناوەڕاستی مێشکە، هەندێجار بەبێ ئاگایی ڕوودەدات، ئەوەش لە ژێر کاریگەریی ژیانی هەستیانەی مەیلدارانە. هەروەك ئەوەی لای ئاژەڵان هەیە، هەڵبەت هەندێکیشیان ئاگایانە بەکرداری ئەقڵیانە ڕوودەدات. لە حاڵەتی یەکەمدا ئیدراك هەر پەیوەستە بە شتە تاکیەکانەوە، بۆ نموونە مەڕ پەی بە دوژمنایەتی گورگ دەبات، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا بازنەی ئیدراك فراوان دەبێت، تا دەبێتە ئیدراکێکی گشتگیر. دوای ئەوە هێزی پێنجەم دێت، مەڵبەندەکەی بۆشایی پێشەوەی مێشکە، کە هێزێکی عەمبارکاری وێناکارە، یا عەمباری ئەو وێنانەیە کە لە هێزی وەهمی هەستیانە و ئیدراکی ئەقڵ دروست دەبێت.

کەوایە بەلای ئیبن سیناوە پێنج هەستی ناوەکی هەیە لەبەرامبەر پێنج هەستی دەرەکی، گەرچی ئەو هەستە ناوەکیانە تەواو جیاوازن لە هەستە ناوەکیەکانی ئیخوان سەفا.

لێرەدا پرسیارێك دەخەینەروو کە ئیبن سینا وەڵامی نەداوەتەوە: ئایا دەکرێ بیرەوەری (التذکر) لە یادەوەری (الحفظ) جیا بکەینەوە و بە سەربەخۆی لەقەڵەم بدەین؟.

### ٦- ئەقڵ:

ئەقڵ باڵاترین هێزی نامادی دەروونە. لە مرۆڤدا ئەقڵێکی پراکتیکی هەیە، کارەکانیشی لە سروشتی مرۆیی بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ فرەیی نیشان دەدا، گەرچی یەکێتی ئەقڵ راستەوخۆ لە هەستکردنمان بەخۆمان یا لە کاتیی پەیبردنمان بە خۆمان دەردەکەوێ.

ئەقڵ هێزی دەروونی نزم لە شوێنی خۆی بەجێ ناهێڵێ، بەڵکو بەرزی دەکاتەوە، ئەوەش بە داماڵینی هەستەکان لە رواڵەتە دیاریکراوەکان و داماڵینی وێنە گشتیەکان لە وێنە وێنەکراوەکان.

ئەقڵ لە سەرەتادا ئەقڵێکی تواناداره، پاشان دەبێ بە ئەقڵێکی کرداری، ئەوەش بە گوێرەی ئەو ئیدراکانەی کە هەستە دەرەکی و ناوەکیەکان پێی دەگەیەنن.

ئەقڵ بە بەکارهێنان لە هێزەوە دەگۆڕێ بە کردار، ئەوەش بەهۆی ئیدراکەوە روودەدات، بەڵام بە رێبەری و بەرچاوڕوونی سەرەوە، واتە ئەو ئەقڵە کارایەی کە وێنە بە ئەقڵی مرۆیی دەبەخشێ.

گەرچی دەروونی مرۆیی یادەوەری نییە تا مانا ئەقڵیە بێگەردەکان عەمبار بکات، چونکە بیرەوەری هەمیشە جەخت دەکاتە سەر بابەتی بەرهەست. ئەگەر دەروونی هۆشمەند دەرکی بە شتێك کرد، ئەوە ئەو ئیدراکەی لە ئەقڵی کاراوە وەرگرتووە.

دەروونە هۆشمەندەکان بە بابەتی زانینیان و رادەی بەدەستهێنانی زانیارییەکانیان جیا ناکرێنەوە، بەڵکو بەرادەی خێرایی ئامادەباشیان بۆ پەیوەندیکردن بە ئەقڵی کاراوە جیادەکرێنەوە کە مەعریفەکان لەوەوە وەردەگرن.

هەروەها دەروونی هۆشمەند کە بەهۆی هێزی سەرووی خۆیەوە دەزانێ چ لە ژێریەوەیەتی و بەهاوکاری رووناکی ئەقڵی گشتی دەزانێ چ شتێك لە سەروویەوەیەتی، راستیەکەی دەروون هەر خودی مرۆڤە. دەروون لە نەبوونەوە دروست بووە، بەڵام جەوهەرێکی تاکیانەی سادەیە و گەندەڵ نابێ و لە ناویش ناچێ. لەم خاڵەدا بەروونی مەزهەبی ئیبن سینا لە مەزهەبی فارابی جیا دەکرێتەوە، لەسەردەمی ئیبن سینا مەزهەبێك هەبوو دانی بە نەمری و تاکیانەی دەرووندا دەنا، ئەو مەزهەبە لە رۆژهەڵاتدا بە مەزهەبی ئەرەستۆ دادەنرا، مەزهەبی بەرامبەر ئەوەش بەمەزهەبی ئەفلاتون دادەنرا، بۆیە فەلسەفەی ئیبن سینا پتر لەوانی دیکە لەگەڵ ئایین تەبایە.

دەروون لە جەستەی مرۆڤ و جیهانی هەستدا بە گشتی قوتابخانەیەکی هەیە تێدا دروست دەبێ و رادەهێنرێ، دوای مردنی جەستە کە پوچەڵبوونەوەی هەمیشەیی جەستەیە، دەروون پەیوەندییەکی بە هێز یا لاوازی بە ئەقڵی گشتیەوە هەر دەمێنێتەوە. کامەرانی دەروونی دانا و چاك ئەوەیە لەگەڵ ئەقڵی کارادا یەك بگرێ (هەڵبەت یەکگرتنێکی تەواو نییە)، بەڵام دەروونەکانی دیکە بەشیان هەر دەردەسەری و چەرمەسەرییە. هەروەك لاوازی جەستە دەبێتە هۆی نەخۆشی، ئازاریش ئاکامێکی هاوشانی دەروونە خراپەکانە. بەو شێوەیە پاداشتی دوارۆژ پەیوەستە بەو رادەیەی تەندروستی و زانیاری کە دەروون لە ژیانی سەر ئەم زەمینە پێیان دەگات.

ئەو دەروونەی جەوهەرەکەی لە خڵت و خاشی سروشت پاك بێتەوە، لە ئازاری ئەم ژیانە دوور دەبێت و ئەگەری نەمریبوونی هەیە.

ئاشکرایە بەدەگمەن نەبێت ئەگەر نا دەروون ناگاتە بوونی باڵا، لەسەر ترۆپکی حەقیقەت شوێنی فراوانی وا نییە بۆ هەمووان، هەروەها دەروون ناگاتە رادەی ناسینی خودا مەگەر یەك بەدوای یەك نەبێت.

### ٧- تیۆرەی ئەقڵ لە پۆشاکە سیمبۆلیەکەیدا:

ئیبن سینا لە خستنەرووی مەزهەبەکەی لەمەڕ ئەقڵی مرۆیی پشتی بە شێوازی سێمبولی بەستووە کە ئەدیبە فارسە کۆنەکان بەکاریان دەهێنا، هەروەها لە راڤەکردندا سودی لە خەیاڵی شیعری بەستووە. یەکەم شت کە شیاوی سەرنجە، کەسایەتی سیمبولی حەی بن یەقزانە. ئەو نموونەیە بریتیە لەوەی دەروون جیهانی توخمەکان تێدەپەڕێنێ، بەتێپەڕبوون بە نێو جیهانی سروشت و دەروون و ئەقڵەکان، تا دەگاتە تاکە عەرشی کۆن، حەی بن یەقزان وەکو پیاوێکی بەنێوساڵداچووی جوان خۆی بە ئیبن سینا نیشان دەدا و داوای لێدەکات وەکو رێنیشاندەرێك قبوڵی بکات.

ئەم فەیلەسوفەی لەمەڕ ئێمە هەوڵدەدات لە رێگەی هەستە ناوەکی و دەرەکیەکانەوە پەی بە زەوی و ئاسمان ببات، بۆیە دەکەوێتە بەردەم دووڕییانێك: بەرەو خۆرئاوا کە رێگەی مادده و خراپەیە، یا بەرەو خۆرهەڵات رێگەی ئەو وێنە ئەقڵانیانەی کە هەرگیز تێکەڵ بە مادده نابن. حەی بن یەقزان فەیلەسوفەکەی ئێمە بەم رێگەیەیاندا دەبات و پێکەوە باسی خواستی

حیکمەتی یەزدانی دەکەن، گەنجیەتی هەمیشە لە دایك دەبێتەوە، جوانی پەردەی جوانییە، ڕووناکی پەردەی ڕووناکیە، هەروەها نهێنی ئەزەلیش.

حەی بن یەقزان ڕێنیشاندەری دەروونە مرۆییە هۆشمەندەکانە، کە ئەقڵی کارایە، دوایین ئەقڵی ئەستێرەکانە و هەر ئەوە کاردەکاتە سەر ئەقڵی مرۆیی.

ئیبن سینا ئەم مانایەی لە ئەفسانەیەك وەرگرتووە کە دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی یۆنانی کۆن کە چەندین جار دەستکاری کراوە. لە ڕاستیدا چیرۆکی دوو برایە بە ناوی (سەلامان و ئەبسال): سەلامان لای ئیبن سینا دەروونی هۆشمەندە، ئەبسال ئەقڵی تیۆرییە و پلەکەی لە عیرفاندایە. ژنەکەی سەلامان (هێزێکی جەستەیی بە ئالۆشی هەیە)، دەکەوێتە داوی خۆشەویستی ئەبسالەوە، بەڵام ئەبسال نایەتە ژێر بار، ناچار فێڵ لە ئەبسال دەکا تا بکەوێتە ئامێزییەوە، ئەوەش بە هاوکاری خۆشکەکەی (ئەم پرۆسەیە پێی دەوترێ ئەقڵی ملکەچی ئەقڵی تیۆری)، خۆی دەخاتە جێی خۆشکەکەی، بەڵام بەر لە کاتی دیاریکراو لە ئاسمانەوە ڕووناکەیەك دەردەکەوێ و بەرچاوی ئەبسال لەمەڕ حەقیقەت ڕۆشن دەبێتەوە کە خەریکە بکەوێتە دوای هەڵەوە، دواجار لە جیهانی ئارەزووی هەستیەوە بەرز دەبێتەوە بۆ جیهانی ئەقڵی بێگەرد.

لە نامەیەکی دیکەدا ئیبن سینا دەروونی فەیلەسوف بە باڵندەیەك دەچوێنێ کە لە داوی ژیانی زەمین ڕزگاری بووە، هەڵبەت دوای یەخسیربوونێکی توند و فڕین بەسەر هەندێ ناوچەدا، تا دواجار مردن لە کۆت و بەندەکان قوتاری دەکات. ئا ئەوەیە حیکمەتی ڕۆژهەڵاتیانەی ئیبن سینا، دەروونی ئیبن سینا بە ژانتا پزیشکیەکەی بوو، نەك سەروەت و سامانە.

ژیانی لە کۆشکەکاندا تینویەتی نەدەشکاند.

## ٨- حیکمەتی ڕۆژهەڵاتیانە:

ئیبن سینا لە ڕووی تیۆریەوە توخنی بونیادنانی مەزهەبی ئاکاری و سیاسی نەکەوتووە، بەڵکو ئەو شتەی بۆ فوقەها بەجێهێشتووە، ئیبن سینا پێی وابووە پیاوێکی ئیلهامدارە، فریشتەیەکە لەسەرووی هەموو کۆت و بەندە مرۆییەکانەوە.

بەلای ئەوەوە ئەحکامەکانی شەریعەت یا ئەحکامەکانی دەوڵەت لەسەر هەموو کەس پێویستە، **محمد** (ص) هەوڵیدا عەرەب لە کۆچەریبوونی خۆیان ڕزگار بکات، بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکەش بڕوای بە زیندووبوونەوەی جەستەی لە نێوانیان بڵاوکردەوە، عەرەب مانای کامەرانی

بێگەردی رووحیان نەدەزانی، هەروەها کەس نەبوو لەبارەی سزا و خۆشبەختی جەستەیی قسەیان بۆ بکات کە لە دوارۆژدا پێی ئاشنا دەبن. زاهیدەکان گەرچی بەتەواوەتی پشتیان لە دونیا و خۆشیەکانی دونیا کردووە، بەڵام هەروەکو ئەو خەڵکەن کە پەیوەستی هەستەکانن و پەرستنەکانییان بەرێورەسمی رواڵەتیان ئەنجام دەدەن، ئەوەش لەبەر ئەوەی زاهیدەکان لە پێناو پاداشتی رۆژی دوایی پشت لە چێژەکانی دونیا دەکەن. بەڵام ئەو کەسانەی لە زاهید و خەڵکانی ئاسایی پلەوپایەیان باشترە، ئەو عاریفانەن، چونکە بەراستی خودا دەپەرستن و خۆشەویستیەکی روحانیان بۆی هەیە، جگە لە خوا کەسی تر پەسەند ناکەن، بەهیوای پاداشتیش نین و لە سزاش ناترسن، بەوە خۆیان لە نەیارەکانیان جیادەکردەوە، کە ئەمان روحیان لە کۆت و بەندەکان قوتاربووە.

### ٩- سەردەمی ئیبن سینا و بەیروونی:

ئیبن سینا لە گەشتەکانیدا لەگەڵ زۆر زانای سەردەمی خۆی کۆبووەتەوە، واش دەردەکەوێ لەو کۆبوونەوانەدا پەیوەندی بەردەوامی دروست نەکردووە، هەروەها ئیبن سینا لە هەموو ئەو کەسانەی لێیانەوە فێری شت بووە، تەنها خۆی بە منەتباری فارابی دەزانێ. هەروەها لە کەسانی سەردەمی خۆی دانی بە فەزڵی کەسدا نەناوە، تەنها ئەو ئەمیرانە نەبێ کە لە ژێر چنگیاندا ژیاوە.

چەندین جار لەگەڵ ئیبن مەسکەویە چاویان پێککەوتووە و رەخنەیشی لێگرتووە، لەگەڵ بەیرونی نامەگۆڕینەوەی هەبووە کە هاوسەردەمی ئیبن سینا بووە و لە لێکۆڵینەوەی زانستیشدا پلەوپایەی لە ئیبن سینا باڵاتربووە، بەڵام هەرزوو ئەو نامە گۆڕینەوەیە کۆتایی پێهاتووە.

بەیرونی پێی باشبووە بە قوتابی کیندی و مەسعودی لەقەڵەم بدرێ، نەك قوتابی فارابی و ئیبن سینا کە لە بەیرونی بچوکترە. لەگەڵ ئەوەشدا لەم رووەوە کەمێکی لەبارەوە دەدوێین، چونکە بەیرونی ئاوێنەی سەردەمەکەیەتی. بەیرونی بەتایبەت سەرقاڵی بیرکاری و ئەستێرەناسی و میللەتناسی و وڵاتناسی بووە، هەروەها توێژەرێکی ورد و رەخنەگرێکی چاك بووە، لەگەڵ ئەوەشدا منەتباری فەلسەفەیە کە زۆر لێڵی و تەمومژی بۆ رەواندۆتەوە، ئەمەیش وایکردووە بەیرونی گرنگی بەرچاو بە فەلسەفە بدا، چونکە بەیرونی فەلسەفەی بە دیاردەیەك لە دیاردەکانی شارستانیەت لە قەڵەم داوە.

بەیرونی کاتێك لایەنە لێکچووەکانی نێوان فەلسەفەی فیساگۆرسی و ئەفلاتونی و حیکمەتی هیندی و زۆرێك لە مەزهەبە سۆفیەکانی دەرخستووە، سەرسام بووە. سەرنجەکانیشی لەمەڕ بالأیی مەعریفەی یۆنانی، ئەگەر بە هەوڵ و ئاکامی هەوڵەکانی عەرەب و هیندیەکان بەراورد بکرێ، لەو سەرسامیە کەمتر نییە.

بەیرونی دەیوت هیند —باسی عەرەبی نەکردووە- فەیلەسوفێکی وەکو سوکراتی بەرهەمنەهێناوە و میتۆدێکی زانستیان نەبووە تا زانستەکەیانی لە وەهم پێ جیا بکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵیداوە هەندێ لە هیندیەکان پۆلین بکات، لە نێو ئەوانیشدا ئامۆژگارییەکانی (ئاریابهاتا) پێ پەسەند بووە، کە لە شوێنێکدا دەڵێ: "ئەوەندە بەسە ئەو شوێنە بزانین کە تیشکی خۆری دەگاتێ، پێویست ناکات ئەو شتە بزانین کە بەو شوێنە دەگات، با مەزن و گرنگیش بێ. هەر شتێك تیشکی خۆری پێ نەگات هەستەکان دەرکی پێ ناکەن، هەر شتێکیش دەرکی پێ نەکرێ، نازانرێ".

لێرەوە فەلسەفەکەی بەیرونیمان بۆ دەردەکەوێ، بەیرونی پێیوایە زانستی یەقینی تەنها لە رێگەی ئەو هەستانەوە بە دەست دێ کە پشت بە ئەقڵی لۆژیکی ببەستێ، هەروەها بەلای ئەوەوە پێویستیەکانی ژیان وامان لێدەکەن پێویستمان بە فەلسەفەیەکی پراکتیکی هەبێ تا دۆست و دوژمن بناسینەوە.

بەیرونی خۆی پێی وایە هەموو ئەو شتانەی نەوتووە کە دەبوو بیانڵێ، دوایین شتیش نییە کە دەبوو بیڵێ.

### ١٠- بەهمیتار بن مەرزیان:

پتر ناوی قوتابیەکانی ئیبن سینامان پێ گەیشتووە، نەك بەرهەمەکانیان[٩٤]. جۆرجانی لە ژیاننامەکەی خۆیدا باسی ژیانی مامۆستاکەشی کردووە.

هەندێ نامەشمان لە ژێر دەستە کە ئەبو الحسن بەهمیتار بن المرزیان نوسیونی، کە زۆر تەبا نییە لەگەڵ مەزهەبی ئیبن سینای مامۆستای، بەڵام لای بەهمیتار هەندێ لە جەوهەری مادده دزراون، مادده کە بە بوونێکی ئەگەری دادەنرێ بەلای بەهمیتارەوە مانایەکی زەینی نییە.

بەهمیتار خودا بە بوونێکی خۆبەدیهێنی تەنها دادەنێ کە هیچ هۆکردێکی بوونیشی نییە، فرەیشی تێدا نییە، نەك ئەوە ئافرێنەری هەموو شتێکیشە. بەهمیتار دەڵێ خودا هۆکردی بوونی جیهانە، گەرچی هۆکرد و بەرهۆ لەیەك ساتی زەمەنیدان. گەرنا، هۆکرد کامڵ نابێت بۆ گۆڕان. بوونی خودا بەشێوەیەکی زاتی دەکەوێتە پێش هەموو بوونەوە نەك زەمەنی، کەوایە دەکرێ سێ سیفەت بۆ ئافرێنەر سەربار بخەین کە ئەمانەن: ١- بوونی یەکەم، -٢- سەربەخۆیە -٣- خۆبەدیهێنە. بە مانایەکی دیکە: خودا خۆی، خۆی بەدیهێناوە. هەموو ئەو شتانەی دەشێ هەبن بوونیان پشت بە خۆبەدیهێن بەستووە.

ئەمەش بە تەواوی لەگەڵ مەزهەبی ئیبن سینا تەبایە، هەروەك مەزهەبی هەردووکیان لەمەڕ جیهان و دەروون تەبان. هەموو شتێك بوونی خۆی بە کردار بەدی دەهێنێ، وەك ئەقڵی ئەستێرە فرە جۆرەکان، یا ماددەی یەکەم، یا دەروونی مرۆیی فرە کەسایەتی، ئەو شتانە ئەزەلین. هەر بوونێك کە بە کردار هاتە دی مەحاڵە لە نێو بچێ، چونکە ئەو بوونە لە هەموو ئەگەرەکان قوتاربووە.

بونەوەرە ئەقڵیەکان بەوە جیادەکرێنەوە کە دەرك بە خۆیان دەکەن، لای بەهمیتاری ئیرادە تەنها مەعریفەی خواستکارە کە هاوشانی بونیەتی، ژیان و کامەرانی دەروونیی دانا بریتیە لە خۆناسین.

---

(٩٤) جگە لە بەهمنیار، أبو حسن بن **طاهر** بن زیلە و أبو عبید عبالواحد الجوزجانی، أبو عبداللە المعصومیش قوتابی ئیبن سینا بوون. (و.ع).

### ١١- کاریگەری ئیبن سینا دوای مردنی:

ئیبن سینا کاریگەرییەکی فراوانی هەبووە، یاسا پزیشکیەکەی تەنانەت لە خۆرئاواش لەسەدەی سێزدەهەمەوە تا سەدەی شانزەهەم پێگەیەکی مەزنی هەبوو. تا ئێستاش فارسەکان بەکاری دەهێنن. کاریگەری ئیبن سینا لە فەلسەفەی مەسیحاییشدا لە سەدە ناوەڕاستینەکان زۆر بەهێز بووە، دانتی ئیبن سینای لە نێوان ئەبیکرات و گالینۆس داناوە، سکالیگەر پێی وابووە لە پزیشکیدا هاوشانی گالینۆسە، و لەفەلسەفەشدا لەو بالاترە.

تا ئێستاش ئیبن سینا لای خەڵکی خۆرهەلات بە پێشەوای فەیلەسوفان دادەنرێ، فەلسەفەی ئەرەستۆیی بە بۆن بەرامەی مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان هەر بەو شێوەیە ناسراوە کە ئیبن سینا خستۆتیەروو، کتێبی زۆریان لەبارەوە نوسراوە، ئەوەش بەلگەیە لەسەر ناوداربوونی.

پوختە و راڤەکردنی کتێبەکانی لە ژمارە نایەن. پزیشکان و سیاسەتمەداران و بگرە زانایانی ئایینیش کتێبەکانیان خوێندۆتەوە، کەچی بە دەگمەنیش نەبێ کتێبەکانی ئیبن سینا ئەو سەرچاوەی تێ نەپەڕاندووە کە شتی لێوە خواستوون.

جێگەی سەرسامی نییە کە ئیبن سینا لەسەرەتادا نەیاری زۆر بووە و لە نارەزایی دەربڕینیشدا لە هاوڕێکانیشی دەنگی بلندتربووە. هەندێ لە شاعیرانیش جنێویان پێداوە.

بەلام زانایانی ئایینی هەندێجار هاوڕای بوون و هەندێجار هەوڵی بەدرۆخستنەوەی مەزهەبەکەیان داوە. خەلیفە مستنجد ساڵی ١١٥٠ز لە بەغدا فەرمانی سوتاندنی کتێبەکانی ئیبن سینای دا، کە بەشێکی کتێبخانە فەلسەفیەکەی یەکێك لە دادوەرەکان بوو.

# ئیبن هەیسەم

### ١- گواستنەوەی بزووتنەوەی زانستی بەرەو خۆرئاوا:

دوای رۆژگاری ئیبن سینا و قوتابخانەکەی، فەلسەفە لە خۆرئاوای ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی گرنگیەکی وای پێ نەدرا، زمانی عەرەبیش ناچاربوو لە ژیان و لە ئەدەبدا پێگەی خۆی بۆ زمانی فارس چۆڵ بکات. رەنگە زمانی فارسی کەمتر گونجاو بووبێ بۆ توێژینەوەی لۆژیك و ئیلاهیات، بەڵام هۆکاری یەکەم نەبووە لە گرنگیدانی کەمتر بە توێژینەوەی تیۆری، بەڵکو هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانی کاروباری شارستانیەت، گۆڕانی ئەو بابەتانەی کە دەشیا سەرنجی خەڵك رابکێشن. وردە وردە مەسەلەی ئەخلاق و سیاسەت پێگەی یەکەمیان بۆ خۆیان داگیرکرد، بەبێ ئەوەی فۆرمێکی تازە بە خۆوە بگرن، رۆشنبیران لە چەرخی ئەدەبی نوێی فارسیدا بینیان حیکمەتی نێو شیعرەکان تینیویەتیان ناشکێنێ، بۆیە هەندێکیان بەلای فکری ئازاد و هەڵگەڕانەوە بەسەر بیروباوەڕە ئایینیەکاندا لایاندا، رەوتی سۆفیگەریش بەسەر زۆربەیاندا خۆی سەپاند[٩٥].

هەندێ بزاوتی زانستی لە بەغداوە گوێزرانەوە بۆ خۆرئاوا، ئەوەش لەسەدەی دەیەمی زانستی، بۆ نموونە فارابی لە شام و مەسعودی لە میسر، قاهیرەش بوو بە بەغدای دووهەم.

---

(٩٥) دەشێ نوسەر مەبەستی ئەو جۆرە بێباوەڕییانە بێت کە لە چوارینەکانی خەیام لەلایەم شیعرە فارسییە سۆفیگەرییەکانی وەك سەعید و ئەوانی تر دەردەکەوێ. (و.ع).

### ٢- ژیان و بەرهەمەکانی ئیبن هەیسەم:

لە قاهیرە لە سەرەتاکانی سەدەی یانزەیەم، مەزنترین بیرکاریناس و سروشتناسی سەدە ناوەڕاستینەکان دەبینین، ئەو پیاوەیش ئەبو عەلی محمد بن الحسین بن هەیسەمە[٩٦]، ئیبن هەیسەم لە بەسرەی شوێنی لەدایکبوونی فەرمانبەری دەوڵەت بووە. لە متمانەکردن بە شیانی پیادەکردنی کردارییانەی داتا بیرکارییەکان زێدەڕۆیی کردووە، بۆ نموونە وتبووی: دەتوانم لە رووباری نیلدا کارێك بکەم لە هەموو حاڵەتێکی زیادی و کەمیدا کەڵکبەخش بێت، کاتێك خەلیفەش بۆ ئەو مەبەستە بانگهێشتی کرد، دوای گەیشتنی بەمیسر بۆی دەرکەوت بەهەڵەدا چووە لەوەی پەیمانی دابوو و مەسەلەکەش بە گوێرەی مەبەست ناڕوا بەڕێوە. بۆیە داوای لێبوردنی لە خەلیفە کرد، خەلیفەش هەندێ ئەرکی دادگای خستە کۆکڵەوە، ئەویش لەترسان قبوڵی کرد، بەڵام لە هەڵەشەیی فەرمانڕەوا ترسا و خۆی کرد بە شێت و دێوانە بۆ ئەوەی لەدەستی خەلیفە قوتاری بێت، تا فەرمانڕەوا ساڵی (١٠٢١ز) کۆچی دواییکرد، کاتێکیش ئیبن هەیسەم دڵنیابوو فەرمانڕەوا مردووە، چیتر وەکو شێت خۆی دەرنەخست و ژیانی خۆی تەرخانکرد بۆ زانست و ئەدەب، تا ساڵی (١٠٣٨ز) کۆچی دواییکرد.

فراوانترین چالاکی ئیبن هەیسەم لە بیرکاری و پراکتیزەکردنی بیرکاریدا دەخولایەوە، لە پاڵ ئەوەشدا زۆر سەرقاڵی بەرهەمەکانی ئەرەستۆ و گالینۆس بوو، تەنها بە دیراسەکردنی کتێبە سروشتییەکان وازی نەدەهێنا. ئیبن هەیسەم دانی پێدا دەنێ کاتێك هێشتا مێردمناڵ بووە لە بیروباوەڕە هەمەچەشنەکانی خەڵك دوڕدونگ و بەگومان بووە، بڕوای بەوەبووە خودا یەکە و جیاوازی بیروڕا لە بارەیەوە دەگەڕێتەوە بۆ رەفتارەکانی خودا، ئیتر تێکەڵ بە بیروباوەڕە و بۆچوونە جیاوازەکان بوو، بەڵام بە یەقین نەگەیشت، دواجار بەو قەناعەتە گەیشت کە (تەنها لە رێگەی ئەو بیروباوەڕانەوە دەگەین بەراستی کە توخمەکانی ئامرازە هەستیەکان بێت و فۆرمەکانیشی ئامرازە ئەقڵیەکان بێت). مەبەستی لە هەستەکان ئەوانەبوو کە بیرکردنەوەی لۆژیکی پەروەردەیان دەکات.

---

(٩٦) ناوی ئیبن هەیسەم لە کتێبە لاتینیەکاندا بەناوی (alhazen) هاتووە، ئەگەر ئەوەی أبن اصبعیە دەیڵێ راستبێ کە ئیبن هەیسەم لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا واتە لە ساڵی ٤١٧ی کۆچیی مردووە، کەوایە ساڵی لەدایکبوونی دەکەوێتە ساڵانی ٣٥٤ی کۆچیی (٩٦٥ز). (و.ع)

لێکۆڵینەوە لە خودا، ئەو ئامانجەبوو کە ئیبن هەیسەم لە دیراسەکردنی فەلسەفەدا مەبەستی بوو. بەلای ئیبن هەیسەمەوە پێویستە فەلسەفە کۆمەڵگەی سەرجەم زانستەکان بێت.

هەروەها دەیگوت تەنها لە کتێبەکانی ئەرەستۆدا فەلسەفەم بەرچاوکەوتووە، چونکە ئەو فەیلەسوفە لە کەسانی تر باشتر توانیویەتی هەستەکان پێکەوە ببەستێتەوە و یەکانگیریان بکات تا بیانکات بە مەعریفەیەکی ئەقڵانیی. بۆیە دەستیکرد بە خوێندنەوەی کتێبەکانی ئەرەستۆ و زۆر دڵگەرمانە و بەپەرۆشەوە راڤەی کردن، لەوە کارەش مەبەستی بووە خەڵکی کەڵکی لێوەربگرن و خۆیشی بە وەرزشێکی هزری لە قەڵەمدەدا. هەروەها هاوکاری و دڵنەوایەکیش بووە بۆ بەساڵداچوونەکەی، وادەردەکەوێ رۆژگار هیچ بەرهەمێکی ئەو هەوڵەی بۆ نەپاراستوین.

گەروەترین کتێبی ئیبن هەیسەم (کتێبی بینابیزانی)[٩٧] بووە کە بە وەرگێڕان و شەرحی لاتینەوە بەدەستمان گەیشتووە، لەو کتێبەدا دەبینین ئیبن هەیسەم بیریارێکی بیرکاریانەی دوربین بووە، چونکە چەمکە زانستی و دیاردە مادییەکانی خستوەتە بەرباس، بەڵام یەکێك لە زاناکانی خۆرئاوا لە سەدەی سێزدەیەم (ڤیتلۆ witlo) توانی کۆی ئەو بابەتە بە شێوازێکی تارادەیەك زانستی پوخت بکاتەوە، بەڵام ئیبن هەیسەم لە وردبینی تێبینیکردنی (بەش)ـەکان لەو باشترە.

### ٣- ئیدراك و حوکمدان:

بیرکردنەوەی ئیبن هەیسەم بە تەواوی کاریگەربوو بە بیرکاری، بەرای ئیبن هەیسەم جەوهەری جەستە لە کۆی سیفەتە جەوهەرییەکانی پێکهاتووە، هەروەك (گشت) لەسەر کۆی (بەش)ـەکان وەستاوە، واتە مانای گشتی لە کۆی سیفەتە زاتیەکان پێکهاتووە.

ئەوەی بەتایبەت لە کتێبی بینابیزانیەوە بەلای ئێمەوە گرنگە، تێبینیە دەرونییەکانی ئیبن هەیسەمە لەمەڕ چۆنیەتی بینایی و ئیدراکی هەستی بە گشتی، ئیبن هەیسەم گرنگی داوە بە شیکردنەوەی ئیدراکەکان بۆ توخمی جیاواز و دەریخستووە ئیدراکەکان لە پلە پێکهاتوون و ماوەیەکی زەمەنییانەی گەرەکە.

---

(٩٧) H. Suter دەڵێ ئەم کتێبە لە میانی سەدەکانی ناوەڕاستدا هەر لە چەرخی رۆگێر بیکۆنەوە تا سەردەمی کیپلەر، کاریگەرییەکی مەزنی هەبووە. (و.ع).

ئیدراك پێكدێ لە: (١) هەستپێكردن، (٢) بەراوردكردنی هەستكردنە زۆرەكان یا بەراوردكردنی هەستكردنە هەنوكەییەكان بەو وێنانەی بە هۆی هەستەكانی پێشتر هەنگاو بەهەنگاو لە یادەوەریدا دروستبوون، (٣) ئەو حوكمەی كە بەهۆیەوە دەزانین هەستە هەنوكەییەكان هاوشێوەی ئەو وێنەیەن كە لە یادەوەریدان. بەراوردكردن و حوكمدانە كاری هەستەكان نین، چونكە هەستەكان تەنها هەڵچوون و كاردانەوەن، بەڵكو حوكمدان و بەراوردكردن كاری ئەو ئەقڵەن كە بەهۆیەوە حوكم بەسەر شتەكاندا دەدەین. سەرجەم هەنگاوەكانی ئیدراك بەبێ ئەوەی هەستیان پێ بكەین روودەدەن، یا جاروبار هەستی پێ دەكەین، ئیدراك تەنها بە بینین دەبێتە كایەی هەستكردن. ناكرێ ئیدراكی سادە شی بكەینەوە بۆ توخمە سەرەكیەكانی خۆی، مەگەر بە بینین نەبێت.

پرۆسەی ئیدراك زۆر بەخێرایی روودەدات، هەرچەندە مرۆڤ لەسەر ئیدراك رابێت و دووپاتەی بكاتەوە، ئەو وێنەیەی لە یادەوەریدا هەیە چەسپیوتر دەبێت و خێرایی مەعریفە یا ئیدراك پتر دەبێت، هۆكاری ئەوەش ئەوەیە ئەو وێنەیەی پێشتر لە دەرووندا هەبووە هاوكاری خێرایی هەستە تازەكان دەكات، تەنانەت مرۆڤ دوای ماوەیەكی زۆری راهێنان وا هەست دەكات ئیدراك كردەیەكە هیچ كاتی گەرەك نییە، بەڵام ئەم شتە هەڵەیە. چونكە هەموو هەستكردنێك ئاڵوگۆڕێكی لە چۆنیەتی لەگەڵدایە و شوێنەكەی ئەندامێكی هەستییە و پێویستی بە كاتە.

مەسەلەكەش تەنها ئەمە نییە، بەڵكو ماوەیەكی پێدەچێ تا هەستپێكردنەكە بە درێژایی دەمارەكاندا تێپەڕ دەبێ، بەڵگەش، بۆ نموونە: پەیبردن بە رەنگ ماوەیەكی دەوێ، ئەوەش بازنەی رەنگە بزواوەكانە، ئێمە تەنها رەنگێكی تیكەڵاو دەبینین، چونكە خێرایی سوڕەكەی ماوەی ئەوەمان نادات هەموو رەنگەكان دانەدانە دەرك پێبكەین.

ئیبن هەیسەم پێیوایە بەراوردكردن و حوكمدان دوو توخمی دەروونی گرنگن لە ئیدراكدا، هەستپێكردن وەپاڵ جەستە دەدرێ، ئەندامی هەستیش تەنها كاردانەوەی هەیە، هەموو هەستكردنێك نموونەیەكە لە ئازار، بەڵام هەمووجار ناگاتە ئەو رادەیەی وامان لێ بكات هەستی پێ بكەین، ئەگەر ئەو كاریگەرییەی كە هەستپێكردن دروستی دەكات، بەهێزبوو ئەوە هەست بە ئازار دەكەین، هەروەك كاتێك رووناكیەكی تیژ وەبەر چاومان دەكەوێ. خەسڵەتی چێژ تەنها دەدرێتە پاڵ ئیدراكێكی تەواو، واتە ئەو مەعریفەیەی كە تیایدا بابەتی هەستپێكردن وەكو وێنەیەكی دەروونی وێنا دەكرێ.

راستییەکەی بەروارد و حوکمدان، هەڵێنجان و حوکمدانێکە هەستیان پێ ناکەین، ئەگەر منداڵێك لە نێوان دوو سێودا جوانەکەیانی هەڵبژارد، ئەوە کردەی هەڵێنجانی کردووە. هەموو ئیدراکێکیش لە نێوان دوو شتدا هەر هەڵێنجانە. گەرچی کاتێك حوکمدان و هەڵێنجان بەخێرایی روودەدەن، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ لەم رووەوە هەڵە بکات، زۆرجاریش پێمان وایە تەنها لە رێگەی هەڵێنجانەوە دەگەین بە حوکمدان بەسەر دۆزە سەرەتاییەکاندا. بۆیە پێویستە مرۆڤ وریا بێت لە بەرامبەر هەموو ئەو شتانەی وەکو وێنەیەکی دۆزە سەرەتاییەکان رووبەروویان دەبێتەوە. دەبێ شوێنپێیان هەڵگرێ تا دەگاتە سەرچاوەکەیان، دەشێ لە شتێکی سادەتر لەخۆی پێکهاتبێ.

## ٤- کاریگەری ئیبن هەیسەم:

سەرەڕای ئەو هەموو بەرهەمەی ئیبن هەیسەم، بەڵام لە رۆژهەڵاتدا کاریگەرییەکی کەمی هەبوو. نکۆڵی لەوەش ناکرێ ئیبن هەیسەم نیمچە قوتابخانەیەکی لە بیرکاری و ئەستێرەناسیدا دامەزراند، بەڵام فەلسەفە ئەرەستۆتالیسیەکەی تەنها دڵپەسندی کەسانێکی کەم بوو. لە نێو قوتابیەکانیشیدا تەنها ئەبو وەفای مبشر بن فاتك القائد دەناسین. کە یەکێکە لە ئەمیرەکانی میسر، ئەم پیاوە ساڵی (١٠٥٣ز) کتێبێکی بۆ بەجێهێشتووین کە پەندی پڕ حیکمەت و چیرۆکی فەیلەسوفان و ئەو شتانەی لە خۆگرتووە.

لەو کتێبەدا شتێکی وای تێدا نییە بە هزرێکی داهێنەرانە دابنرێ، پتر کتێبێکی سەرگەرمیە. خەڵکی قاهیرە پتر لە حیکایەتی هەزار و یەك شەوە چێژیان وەردەگرت، نەك لەو چەشنە کتێبانە.

دوای ئەوەی ئیبن هەیسەم خۆی و کتێبەکانی بە گومڕا لە قەڵەمدران، خەریکبوو لە خۆرهەڵاتدا لە بیر بکرێ، یەکێك لە قوتابیەکانی (ئیبن مەیمون)ی فەیلەسوفی جولەکە بۆمان دەگێڕێتەوە، لە بەغدا بازرگانێك[٩٨] هەبوو، هەموو کتێبەکانی فەیلەسوفێکی سوتاند، بۆ ئەو مەبەستەش سەکۆیەکی تایبەتی دامەزراند، کاتێك گەیشتە سەر کتێبی (الهیئە)ی ئیبن هەیسەم، ئاماژەی بە بازنەیەك کرد وەکو نیشاندانی هەسارەکان، وتی ئەم کتێبە هۆکاری خراپە و کوێری و لاڵیە، دوای تەواوبوونی قسەکانی، ئەو کتێبەی دڕاند و هەڵیدایە نێو ئاگرەکەوە.

---

(٩٨) عبدالسلام بن عبدالقادر بن أبی صالح الجیلی البغدادی ناسراو بە (الرکن)، ساڵی ١٢١٤ی زایینی مردووە. (و.ع).

## ٥- کۆتایی فەلسەفە لە خۆرهەڵاتدا

### ١- غەزالی[٩٩]

### ١- کەلامناسی و سۆفیگەری:

لەوەی خستمانەروو بینیمان بزووتنەوەی کەلامی لە ئیسلامدا زۆر لە ژێر کاریگەری فەلسەفەدا بووە، کەلامناسانی موعتەزیلە بگرە نەیارانیشیان زۆربەی بیروباوەڕ و ئەو بەڵگانەی بۆچوونەکانی خۆیانیان پێ پشت ئەستور دەکرد و دژی بۆچوونی نەیارەکانیشیان بەکاریان دەهێنا، لە کتێبی فەیلەسوفەکانەوە وەریان دەگرت.

ئەوان تەنها ئەو شتانەیان وەردەگرت کە پێویستیان پێی هەبوو، بەڵام بایەخیان بە شتەکانی تر نەدەدا یا هەوڵیان دەدا بە درۆیان بخەنەوە، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی چەندان کتێب بە مەبەستی دژایەتیکردنی خودی فەیلەسوفان و مەزهەبە فەلسەفییەکان، بەخودی فەیلەسوفان یا مەزهەبە فەلسەفییەکان خۆیان بنوسرێ، بەڵام بەر لە غەززالی کەس هەوڵی نەدا هێرش بکاتە سەر کۆی مەزهەبە فەلسەفییەکان کە لە رۆژهەڵاتدا لەسەر بنەمای فەلسەفەی یۆنانی بونیادنرابوو، هێرشێك پشتی بە پرەنسیپە گشتیەکان بەستبوو و لەسەر دیراسەیەکی قوڵیش بونیادنرابوو.

---

(٩٩) أبو حامد محمد بن محمد الغزالی، بۆیە پێی دەوترێ یا ئەوەتا باوکی سەرقاڵی چنینی سوف بووە، یا ئەوەتا گوند یا ئەو شارۆچکەیەی لێی لەدایکبووە ناوی غەزالە بووە. غەزالی گەورەترین بیرمەندی ئیسلامیە، پاڵەوانێکە لە پاڵەوانەکانی ئیسلام و لەپێناوی ئیسلامدا زۆر تێکۆشاوە و وەڵامێکی زۆر لە نەیارانی ئیسلامی داوەتەوە، گەورەترین و توندترین وەڵامدانەوەش کتێبی (تهافت الفلاسفە)یە کە کارێکی مەزنە و بەهای فەلسەفیانەی خۆی هەیە، چونکە بەرهەمی خوێندنەوەیەکی توندۆتۆڵ و تێروتەسەل و بیرکردنەوەیەکی درێژە، هەروەها لەو کتێبە زۆر بابەتی تاوتوێ کردووە کە خاڵی ناکۆکی نێوان ئایین و فەلسەفەیە. (و.ع).

ئەو کارەی غەزالی کردی لایەنی چاکەیشی هەبوو، ڕەوتی کەلامناسانەی وا هەبوو گەرەکیبوو بیروباوەڕە ئایینییەکان لە ئەقڵ نزیك بکاتەوە، بگرە دەیویست بە بەڵگەی ئەقڵی پشت ئەستوورییان بکات.

لە پاڵ ئەوەشدا سۆفیگەراکان هەبوون کە دەیانویست چێژی ئەو بیروباوەڕە ئایینییە لە ڕێگەی دڵەوە بکەن، نەیاندەویست بە میتۆدە ئەقڵانیەکان لێیان بکۆڵنەوە، نەشیاندەویست بەڵگەی لەسەر بێننەوە، بەڵکو دەیانویست چێژی لێوەربگرن و بیکەنە حاڵەتێکی دەروونی.

هەروەك دەبوو بیروباوەڕی ئایینی بگاتە باڵاترین پلەی یەقین، خەڵکی دەیانپرسی: ئایا بیروباوەڕی ئایینی مەعریفەیەکە کە دەبێ لە مەعریفەکانی دیکەوە هەڵێنجێنین؟، یا پێویستە ئەو بیروباوەڕانە شتگەلی بەدیهی و سەرەتایی بن یا پرەنسیپی ئەقڵی بن و خۆیان خۆیان دەربخەن، بەشێوەیەك پێویستیان بە بەڵگە نەبێ؟. بەڵام هەرکات خەڵکی ڕووبەڕووی پرەنسیپ و بنەما ئەقڵانیەکان بوونەوە هەر دەبێ بڕوای پێ بهێنن. بەوەدا کە سەرجەم خەڵکی لەسەر بیروباوەڕە ئایینییەکان کۆك نین، کەوایە ئەو بیروباوەڕە ئایینیانە بنەمای ئەقڵی سەرەتایی نین، چونکە گەر وابووبا خەڵکی دەیانپرسی ئەی مادام گومڕایی و بێ باوەڕی چۆن دروست دەبێ؟.

زۆر کەس پێیان وابوو تاکە دەروازەی ئەو هەموو گومانە، ئەوەیە ئەو باوەڕدارانەی پشتیان بە بیروباوەڕی ئایینی بەستووە، وایان لێ بکرێ پشت بە ڕووناکی دەروون ببەستن کە لە سەرچاوەیەکی سەرووی ئەقڵەوە هەڵدەقوڵێ. لەسەرەتادا ئەم ئاراستەیە بێ ئاگایانە و لە ژێر کاریگەری سۆفیگەریدا دەرکەوت و زۆر گرنگی بە لێکۆڵینەوە فیقهی و کەلامییەکان نەدەدا، پاشان غەززالی هات و پشکی خۆی لەو بزووتنەوەیە پێ بڕا و لەو شتانەی کۆڵیەوە کە (سالمیە)[١٠٠] و (کەڕامیە) دایانڕشتبوو، ئەم دوو ڕەوتە لەگەڵ موعتەزیلەدا ناکۆك بوون، جا غەزالی ئەو شتەی ئەوانی وەرگرت و لەسەر بنەمایەکی فراوانتر دایڕشتەوە، هەر لەرۆژگاری خودی غەززالیدا سۆفیگەری لای جەماوەری موسڵمانان بوو بە کۆڵەگەیەکی زانست و تاجی ڕێچکە و مەزهەبە جیاوازەکانی زانست.

---

(١٠٠) گرووپێکی سۆفیگەری سوننین و لە هەردوو سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی لە بەسرە دروستبوون، سوهەیلی تستری (ساڵی ٢٨٣ی کۆچیی مردووە) بەناوی مەزنترین قوتابی خۆییەوە ناوی ئەو گرووپەی ناوە، واتە عبداللە محمد بن سالم (٣٥٠ی کۆچیی مردووە). (و.ع).

### ٢- ژیانی غەزالی:

ژیاننامەی غەزالی جێی سەرنجە، ئەگەر بمانەوێ لە کاریگەری ئەم پیاوە تێ بگەین، دەبێ زۆر بە قوڵی شارەزایی ژیانی ببین.

غەزالی ساڵی (١٠٨٥ز) یا (١٠٥٩ز) لە (توس) لە دایکبووە کە دەکەوێتە خوراسان، واتە هاونیشتیمانی (فیردەوسی) شاعیری گەورەی فارس بووە، هەروەك خودی فیردەوسی شایەتە لەسەر ئەوەی گەلی فارس شانازیەکی کۆنیان نییە، بۆیە ڕێزیان لە غەزالی ناوە تا لای موسڵمانانی دواتر ببێتە (شاهیدی ئیسلام و ڕازێنەرەوەی ئایین).

بۆ یەکەمجار دوای مردنی باوکی لە ماڵی هاوڕێیەکی سۆفیگەری پەروەردەی ڕۆشنبیری وەرگرتووە، هەڵبەت ڕۆشنبیریەکی فراوان، فراوانتر لەوەی تەنها پەیوەست بێ بە گەلێکی دیاریکراوەوە، ئەم گەنجە ئەقڵێکی چالاك و خەیاڵ بەهێزی هەبووە، بە هیچ کۆت و بەندێك قایل نەبوو، پێناسەی فوقەها و وردبینە پڕ تەکلیفەکانیان و هەروەها ئەو شێوە وردبینەشی پەسەند نەبوو، بەڵکو هەموو ئەوانەی بە زانستێکی دونیایی لەقەڵەم دەدا، بۆیە هەموو ئەوانەی توڕدا و دەیویست ڕوحی خۆی لە ناسینی خودادا نقوم بکات.

پاشان لە نیساپور لەسەر دەستی ئیمام الحرمین[١٠١] (١٠٨٥ز مردووە) کەلامزانی خوێندووە، دەشێ غەزالی هەر لەسەرەوەختی خوێندندا لە زانستەکان وەشك کەوتبێ.

پاشان چوو بۆ لای نیزامولمولکی[١٠٢] وەزیری سوڵتانی سەلجوقی و لای مایەوە، تاکو نیزامولمولك ساڵی ١٠٩١ز لە بەغدا کردی بە وانەبێژ.

لەو ماوەیەدا سەرقاڵی خوێندنی فەلسەفەبووە، ئەوەش نەك تەنها لەبەر ئەوەی هۆگری زانست بوو، بەڵکو پەرۆشی ئەوەبوو بۆ قوتاربێت لەو گومانانەی ئەقڵیان دەوروژاند،

---

(١٠١) أبو المعالی عبدالملك بن الشيخ أبی محمد عبدالله بن ابی يعقوب........ الجوينی، ساڵی ٤١٩ی کۆچیی لەدایکبووە و ساڵی ٤٧٨ی کۆچیی مردووە. (و.ع).

(١٠٢) أبو علی بن الحسن بن علی بن اسحاق الالوسی، (ساڵی ٤٠٨ی کۆچی لەدایکبووە و ساڵی ٤٨٥ی کۆچیی مردووە و لای ئەلب ئەرسەلانی سوڵتانی سەلجوقی وەزیر بووە. (و.ع)

دەروازەیەك بدۆزێتەوە. هەوڵی نەدەدا بگات بە مەعریفەیەك کە نهێنی دیاردەکانی گەردوونی بۆ ئاشکرا بکات، بەنیازی پتەوکردنی بۆچوونەکانیشی نەبوو، بەڵکو مەبەستی دڵچەسپیوی خۆی و چێژشتنی حەقیقەتی باڵابوو.

غەزالی لێکۆڵینەوەیەکی تێروپڕی بەرهەمی فەیلەسوفانی کرد، بەتایبەت فارابی و ئیبن سینا، پوختەیەکی گشتگیری لەمەڕ فەلسەفە نووسی، ئەوەش بە گوێرەی مەزهەبەکەی ئیبن سینا، لەو کتێبەدا بەشێوەیەکی زۆر زانستیانە لە بیروباوەڕە فەلسەفییەکانی کۆڵیوەتەوە و خوێندنەوەیەکی بێ لایەنانەی بۆ کردوە، بەبێ ئەوەی بیروبۆچوونی خۆی لەسەر راستی و ناراستیان دەربخات. بەڵام غەزالی لە مەزهەبی فەیلەسوفانی دەکۆڵیەوە بۆ ئەوەی دواتر پوچەڵیان بکاتەوە یا بەدرۆیان بخاتەوە. هەر لەسەرەتاشەوە ئەمەی وتبوو تا ویژدانی ئاسودە بێت لە ماندویەتی رووبەروبوونەوەی فەلسەفە، هەروەها وەکو خۆئامادەکردنێکیش بۆ گلەیی و سەرکۆنەییەکانی دواتر. دوای ماوەیەکی کەم، ئەو بەدرۆخستنەوە یا پوچەڵکردنەوە بەناوبانگەی فەیلەسوفان دەرکەوت، واتە کتێبی بەدرۆخستنەوەی فەیلەسوفان (تهافت الفلاسفه)[١٠٣] ، دەشێ غەزالی ئەو کتێبەی لە بەغدا نوسی بێ، یاخود کەمێك دوای بە جێهێشتنی نوسی بێتی.

چوار ساڵ دواتر (١٠٩٥ز) غەزالی دەستبەرداری وانەبێژی بوو لە بەغدا، لەگەڵ ئەوەی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، گومان و دوڕدونگیش هەر دەستبەرداری نەدەبوو، لەو وانە کەلامیانەش دڵنیا نەبوو کە بە قوتابیەکانی دەوتەوە، پلەوپایەی باڵا و ئاوات و ئارەزووە دونیاییەکان بەرەو لای پۆست و پایە پەلکێشیان دەکرد، کەچی لەبەرچاوگرتنی رۆژی دوایش داوای دەستبەرداربوونی پلە و پایەی لێدەکرد.

دواجار بۆی دەرکەوت کە دەتوانێ و پێویستیشە بەرەنگاری دونیا و حیکمەتەکانی دونیا ببێتەوە، چونکە ئەوە بۆ ئەو چاکتربوو. راستیەکەی ئامانجەکانی غەزالی لەم دونیایەدا قوڵتر و فراوانتر بوو، لەکاتی نەخۆشیشدا دەنگێك لە ناوەوە بانگی کرد، ئیدی کەوتە دورەپەرێزی و خەڵوەت و وەرزش و کۆشش، وەکو خۆ ئامادەکردن بۆ ئەرکەکەی، رەنگە ویستبێتی وەکو

(١٠٣) وشەی (تهافت) راڤەی زۆری بۆ کراوە، لێکۆڵەرە ئەوروپییەکان بە مانای جۆراوجۆر وەریان گێڕاوە، بەڵام زۆرینەیان ئەو مانایانە رووخان و داڕمان لەخۆ دەگرن، هەندێك لەو مانایانەش مانای پێکدژی و ناتوندوتۆڵی و شل و شاوی دەدەن. (و.ع).

ریفۆرمخوازێکی ئایینی سیاسیی خۆی دەربخات، کاتێکیش خاچپەرستان لە خۆرئاوادا خەریکی خۆئامادەکردن بوون بۆ هێرشکردنە سەر ئیسلام، غەزالی خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی ببێتە تێکۆشەرێکی روحی ئایینی ئیسلام. بەڵام هەڵگەڕانەوەی بەسەر ژیانی رابردوودا وەکو ئەوەی ئۆگەستینی قەشە[١٠٤] توند نەبوو، بەڵکو پتر لەوەی هێرۆنیمۆسی قەشە[١٠٥] دەچوو، کە

---

(١٠٤) Aurelius Augustineus ساڵی ٣٥٤ز لە شارێکی باکووری ئەفریقیا لەدایکبووە و بە بنەچە رۆمانییە. دایکی هەر لەمناڵییەوە مەسیحی بوو، بەڵام باوکی لە کۆتاییەکانی تەمەنی هاتە سەر ئایینی مەسیحی. ئۆگەستین تارادەیەك پەروەردەیەکی مەسیحییانە کراوە تاوەکو زەمینەخۆشکەرێك بێت بۆ تەعمیدکردنی. بەڵام خۆی تەعمید نەکرد، لە گەنجیدا بڕوای بە ئایین و لێخۆشبوون و کۆت و بەندە ئایینیەکان نەبوو، هەر لە گەنجیدا لەگەڵ ژنێك دەستی تێکەڵ کرد و مناڵێکی لەو ژنە بوو، پاشان نۆ ساڵان کەوتە ژێر کاریگەری مەزهەبی مانەوییەکان، لەو ماوەیەدا رەخنەگرێکی توندی عەقیدەکان بوو، ئەوەش وای لێکرد بچێتە سەر رێچکەی گومانکاران، پاشان چوو بۆ رۆما، لەوێدا کەوتە تاوتوێکردنی بیروباوەڕەکانی سیسەرۆ و هێشتا مەسیحیەت هیچ کاریگەرییەکی بەسەرەوە نەبوو، جا دایکی پێی لێکرد بە پێلاو کە هەر دەبێ ژن بێنێ، بۆیە ژنی هێنا، ژنی یەکەمیشی ناردەوە بۆ باکوری ئەفریقیا، بەڵام پێشتر لەگەڵ ژنێکی تر سەرجێی کردبوو، بۆیە لەو ماوەیەدا پاڕانەوەی لە خودا هەر ئەمەبوو: خودا گیان، ببەخشە. ئیدی لە دەروونیدا تێکۆشانی توندی نێوان روح و جەستە بەردەوام بوو، جارێکی تر گەڕایەوە بۆ لای مانەوییەکان و گومانی لە لاوازی روح لە تێکۆشانەکانیدا پتربوو، ئینجا مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکانی خوێند، بەڵام کە دەیبینی خەڵکی دەکەونە ژێر کاریگەری مەسیحیەتەوە خەجاڵەتی دەکێشا، چونکە ئەم فەلسەفە دەخوێنێ و پێیشی وایە قینی لە ماددەباوەڕییە. ئیدی رۆژێك لە باخچەکەدا لەگەڵ خوێندکارێکی خۆی دانیشتبوو، دەروونی وەکوڵ هات و فرمێسك وەك باران لەچاوانی داباریـن، جا هەڵسایە سەر پێ هاواری کرد: ئەم خۆدزینەوەیە تاکەی؟ هەموو رۆژێك دەڵێم، بەیانی بەیانی. لەو کاتیدا لە لایەوە مناڵێك گۆرانی دەچڕی و دەیگوت: بیگرە و بخوێنە، ئۆگەستین ئەو گۆڕانیەی بە بانگەوازێکی ئیلاهی لەقەڵەم دا، جا ئینجیلەکەی لێ وەرگرت و خوێندنەوە، یەکەم پەڕەگرافیش کە لە نامەکەی پۆڵسی قەشە چاوی کەوتە سەر، ئەو ئایەتانە بوون کە بانگی دەستهەڵگرتن لە تەمەڵی و سستی و تەوەزلیی و گەڕانەوە بۆ لای مەسیح-یان دەکرد، لەو ساتەوە ئارامی و ئۆقرەگرتن دڵی ئۆگەستینیان داگرت، ئینجا ساڵی ٣٨٧ی ز هاتە سەر ئایینی مەسیحی و گەڕایەوە بۆ ئەفریقیا و ساڵی ٣٩١ز بوو بە ئەسقەف، بەهۆی کتێب و پێگە و ناووناوبانگەکەی بە مەزنترین پیاوی مەسیحی دادەنرێ. (و.ع).

بانگەوازێکی ناوەکی لە شوێنکەوتەی بیروباوەڕەکانی سیسەرۆ دەری هێنا و خستیە نێو مەسیحیەتێکی پراکتیکیەوە.

دوای ئەوە غەزالی دە ساڵ ئەم وڵات و ئەو وڵاتی کرد، کاتەکانی دابەشکردبووە سەر پەرستش و نوسین، وا گومان دەکرێ لەو ماوەیەدا گەورەترین کتێبی خۆی لەمەڕ کەلام و فیقھ و ئەخلاق نوسی بێ، واتە کتێبی (ژیاندنەوەی زانستە ئاینییەکان)، لە کۆتایی ئەو کتێبەدا هەوڵیداوە ئەرکی ریفۆرمخوازێك بگرێتە ئەستۆ. لە میانی گەشتەکانیدا سەردانی دیمەشق و قودس (بەر لە خاچپەرستان) و ئەسکەندەریە و مەککە و مەدینەی کرد، دواجار گەڕایەوە وڵاتەکەی خۆی.

دوای گەڕانەوەی بۆ وڵات ماوەیەکی کەم لە نیساپور بوو بە مامۆستا، لە ١٨ دیسەمبەری (١١١١ز) لە توس هەر شوێنی لە دایکبوونی، کۆچی دواییکرد.

غەزالی دوایین ساڵانی ژیانی لە پەرستش و کۆڕی خاوەن دڵان بەسەربرد.

ژیانی غەزالی هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی زنجیرەیەکی نەپساوەیە.

---

(١٠٥) Eusebius Sophronius Hieionymus ناسراو بە ژیرۆمی قەشە، ساڵی ٣٤٠ی ز لەدایك و باوکێکی مەسیحی لە شاری ستۆرندۆی دالماشیا لەدایکبووە. هەر لەو شارە خوێندویەتی و لە رۆماش فەلسەفەی خوێندووە، خۆرهەلاّت و خۆرئاوا گەڕاوە. بەلاّم بەهۆی تاوە یەکێك لە هاوڕێکانی لە ئەنتاکیە دەمرێ، ئەویش دووچاری نەخۆشیەکی سەخت دەبێ، ئیدی وای بۆ دەچێ دەبێ باقی ژیانی خۆی لە پەرستشی خودا بەرێبکات، زۆریش مەیلی بەلای خوێندنەوەی کتێبەکانی سیسەرۆ و بۆچوونی بت پەرستەکان بووە، لەخەونیدا دەبینێ مەسیح سەرکۆنەی دەکات کە بۆچی پتر پێداگرە لەسەر ئەوەی ببێ بە سیسەرۆیی نەك مەسیحی. لەو ساتەوە ئیدی هەر کتێبی پیرۆزی خوێندەوە و لە بیابانێکی نزیك بە ئەنتاکیە گردەنشینی هەڵبژارد، لە نێو پاپایانی مەسیحیدا پلە و پایەیەکی مەزنی هەیە. (و.ع).

### ٣- هەڵوێستی لەمەڕ کولتوری سەردەمەکەی:

غەزالی ئاراستە ئەقڵیەکانی سەردەمەکەی خستەروو، ئەوانیش: کەلامناسان، سۆفیزم، فەیلەسوفان، نوێ فیساگۆرسییەکان، نوێ ئەفلاتونیەکان.

غەزالی پێی وایە مەبەستی کەلامناسی پاراستنی ئەو عەقیدەیەیە کە بڕوایان پێیەتی و پاسەوانیکردنیشی لە گومڕاییەکانی ئەهلی بیدعە، گەرچی بەڕای ئەو، بەڵگەی کەلامناسان زۆر لاواز دیارە و زۆر لە بیروباوەڕەکانیان جێگەی گومانە.

لە دەروونی خۆیدا پتر مەیلی بەلای سۆفیزمدا هەبوو، غەزالی تا ئەوپەڕی رادە منەتباری سۆفیزمە، واتە سۆفیزم توانی بیروباوەڕ لە دڵیدا بچەسپێنێ و بەهۆی سۆفیزیشمەوە توانی بە روح، تامی ئەو شتە بکات کە کەلامناسان گەرەکیانبوو بە تێڕامانی ئەقڵی پێی بگەن.

بەڵام فەلسەفەی باو، بەڕای غەزالی شتێکە توانای رۆشنبیکردنی خەڵکی هەیە، بەتایبەت بیرکاری و فەلەکناسی، کە زانستگەلێکن شیاوی نکۆڵی لێکردن و بەدرۆخستنەوە نین. هەروەها نکۆڵی لە سروشتناسیش ناکات، تەنها ئەو بابەتانە نەبێت کە ناکۆکن لەگەڵ ئاییندا.

بەڵام مەزهەبی ئەرەستۆ -وەکو فارابی و ئیبن سینا بەلاساییکردنەوەی کەلامناسانی تر گواستویانەتەوە-، بەلای غەزالییەوە دژی ئیسلامە. بۆیە پێیوابوو ملکەچە بەوەی بەناوی سەرجەم تیپ و رێبازە جیاوازەکانی موسڵمانانەوە بەرەنگاری ببێتەوە، بۆ ئەم ئەرکەش هەر خودی چەکەکەی ئەرەستۆ بەکارهێنا، واتە لۆژیك.

چونکە پێی وابوو ئەو یاسا بنەڕەتیە فیکریانەی کە لۆژیك پشتگیریان دەکات، یەقینین و بواری نکۆڵی لێکردنیان نییە، وەکو دۆزە بیرکارییەکان. غەزالی بەڵگەکانی لەسەر یاسای پێکدژی بونیادنا، وتیشی کارەکانی خودا پێچەوانەی ئەو بەڵگانە نییە، غەزالی ئەم قسانەی بەوپەڕی ئاگاییەوە کرد.

غەزالی لە نێو تیۆرە سروشتی و ئیلاهیەکاندا پتر گرنگ بە پوچەڵکردنەوەی سێ تیۆرەی فەلسەفی دەدا، کە ئەمانە بوون: (١) تیۆرەی نەمری و کۆنی جیهان، (٢) خودا تەنها (گشت)ـەکان دەناسێ و گرنگی بە (بەش)ـەکان نادات، (٣) نکۆڵیکردن لە زیندووبونەوەی جەستە. هەروەها ئەو قسەیەی کە دەڵێ تەنها روحەکان لە نێو ناچن. بە قسەی جۆن فیلۆپۆن (johannes philoponus) غەزالی بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو تیۆرانە لە زۆر رووەوە پشتی بە

مەزهەبەکەی ئەرەستۆ بەستووە، جۆن فیلۆپۆن خۆیشی بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو قسەیەی (پرۆکلیس –proklos) کە دەیوت جیهان نەمر و کۆنە، کتێبێکی نووسی.

**٤- جیهان:**

دانا و حەکیمەکان پێیان وابوو جیهان تۆپێکە لە درێژبوونەوە و پەرەسەندندا کۆتادارە، بەڵام مەوداکەی نەمرو بێ کۆتایە. هەروەها دەیانگوت جیهان هەر لە ئەزەلەوە لە خوداوە سەرچاوەی گرتووە، واتە لەرووی کاتەوە بەرهۆ هاوزەمانی هۆکردە، بەڵام غەزالی پێی وابوو جیاوازیکردن لەنێوان زەمەن و شوێن راست نییە، هەروەك ئەوەی فەیلەسوفان دەیکەن، واتە لای غەزالی خودا هۆکاری بوونی جیهانە و هەر بە توانا و ئیرادەی خۆیشی جیهانی خولقاندووە.

با لەسەرەتادا قسە لەسەر شوێن و زەمەن بکەین، گەر نەمانتوانی وێنای سەرەتا و کۆتایی زەمەن بکەین، ئەوە ناتوانین وێنای سەرەتا و کۆتایی شوێنیش بکەین، کە گەر قسە لەسەر بێ کۆتایی زەمەن بکەین هەر دەبێ قسە لەسەر بێ کۆتایی شوێنیش بکەین. گەر وتمان شوێن پەیوەستە بە هەستە دەرەکیەکانەوە و زەمەنیش پەیوەستە بە هەستە ناوەکیەکانەوە، ئەوە شتێك لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا لە بەرهەست دەرناچێ. هەروەها ((رەهەندی شوێنیی پاشکۆی جەستەیە، رەهەندی زەمەنیش پاشکۆی جوڵەیە، واتە زەمەن درێژبۆوەی جوڵەیە، هەروەك شوێن درێژبووەوەی نیوە تیرەی جەستەیە، هەروەها بەڵگەی کۆتاداری نیوەتیرەی جەستە دەبێتە رێگر لە سەلماندنی رەهەندی شوێنیی، بەڵگەش لەسەر کۆتاداری هەردوولای جوڵە، دەبێتە رێگر لە سەلماندنی رەهەندی زەمەنی)).

هەموو شتەکانی ناو زەمەن و شوێن تەنها چەند پەیوەندییەکی نێوان شتەکانن کە خودا خولقاندوونی، یا چەند پەیوەندییەکی نێوان چەمکەکانی ئێمەن کە خودا لە ئەقڵی ئێمە خولقاندوونی.

گرنگتر لەوەی غەزالی لەمەڕ هۆکارەکی گووتویەتی (واتە پابەندی نێوان هۆکار و بەرهۆ)، ئەوەیە فەیلەسوفان جیاوازیان لەنێوان کاری خودا و کاری ئەقڵە بەئیرادەکان و کاری دەروون و کاری سروشت و رێکەوت، ئەو جۆرە شتانە کردووە. بەڵام غەزالی وەکو کەلامناسانی ئەهلی سوننە پێی وایە، تەنها یەك (هۆکرد) هەیە ئەویش هۆکردی هەبووی ئیرادەخوازە، غەزالی بە

یەکجاری هۆکردی سروشت وەلا دەنێ، کەوایە دەتوانین ئەم جۆرە هۆکارەکیە بدەینە پاڵ پەیوەندی زەمەنی نێوان دوو شت.

ئێمە دەبینین دیاردەیەکی دیاریکراو (بەرهۆ) بەدوای دیاردەیەکی دیاریکراوی دیکەدا (هۆکرد) دێ، بەڵام چۆن بەرهۆ بەدوای هۆکردا دێ؟ ئەوە نهێنیەکە ئێمە نایزانین، هەروەك هیچ لەبارەی کاریگەری شتە سروشتییەکان بەسەر یەکترەوە نازانین، هەروەها هەموو گۆڕانێك لە خۆیدا شتێکە ئەقڵ ناتوانێ دەرکی پێ بکات، چونکە هەڵوێستی ئەقڵ لە سۆراخکردنی هۆکارەکان هەر هەمان ئەو هەڵوێستەیە کاتێك سۆراخی ڕووداوەکان دەکات، بۆ نموونە گۆڕان. هەموو شتێك یا هەیە یا نییە، بەڵام هەڵگێڕانەوە یا ئاڵوگۆڕبەسەرداهێنانی شتێك، مەسەلەیەکی ترە و تەنانەت لە توانای ئیلاهیشدا نییە، چونکە ئەو شتە یا دروست دەبێ یا لەنێو دەچێ.

هەر کارێك لە ئێمەوە دەر بچێ ئەگەر هەستی پێ نەکەین ناتوانین ناوی لێ بنێین، گەر شتێکمان ویست و توانای کردنیشیمان هەبوو، ئەوە ئەو ئاکامەی لەو کارە دەکەوێتە دەتوانین وەپاڵ خۆمانی بدەین. ئەو تاکە هۆکارەی کە ئێمە دەیناسین بریتیە لەو کارە ئیرادەییە سەرپشکەی کە هاوشانی هەستکردنە بە توانای کردنی کارێك. ئێمە کردەی توانای ئیلاهی بەوە دەپێوین. بەڵام بە چ مافێك کاری وەها دەکەین؟، غەزالی دروستی ئەم پێوەری بەوە پشت ڕاستکردۆتەوە کە لە دەروونی خۆیدا دەرکی بە وێنەی خودا کردووە، غەزالی پێی وایە تەنها دەروون لە خودا دەچێت، بەڵام سروشت لە خودا ناچێت.

کەوایە خودا وەکو بە هۆی جیهانەوە سەلماندمان، بوونی هەیە و توانای هەموو شتێکی هەیە، ئیرادەشی ئازادە، ئێمە ناتوانین سنورێکی شوێنیی بۆ کارەکانی دابنێین، هەروەك ئەوەی فەیلەسوفان کردویانە. کە دەیانگوت: تەنها یەك شت لە خوداوە دەردەچێ ئەوەش ئەقڵی یەکەمە، ئەقڵی یەکەم، یەکەم ئافرێنەری خودایە. بەڵام خودا دەتوانێ لە ڕووی زەمەن و شوێنەوە کارەکانی خۆی سنوردار بکات، هەروەك ئەوەی جیهانێکی ئاوا سنورداری لە ڕووی زەمەن و شوێنەوە ئافراندووە.

فەیلەسوفان پێیان وایە ئەو قسەیەی کە دەڵێ خودا جیهانی لە هیچەوە خولقاندووە، قسەیەکی بێ مانایە، ئەوان تەنها قسەیان لەسەر بەدوایەکداهاتنی وێنە یا فۆرم بەسەر ماددەی یەکەمدا دەکرد، واتە گواستنەوەی شتێکی وەدیهاتوو لە وێنەیەکی شیمانییەوە بۆ وێنەیەکی شیمانەیی دیکە. بەڵام ئەی هیچ شتێك نایەتە بوون، ئەگەر پێشتر نەبووبێ؟،

غەزالی بەم پرسیارە وەڵام دەداتەوە: ئایا دروستبوونی وێنەی بەرهەستەکان لە چاودا یا دروستبوونی وێنەی شتە زەیینیەکان لە دەرووندا، دەروازەی بوونی شتەکان نین؟، بن یا نەبن بێ ڕوودانی پێچەوانەکەی. ئەگەر لەنێو چوو ئەوە واتە هەڵوەشاندنەوەی بوون بێ بەدواهاتنی دژەکەی؟، پاشان ئایا دەروونە مرۆییە تاکەتاکە هەمەچەشنەکان لە هەموو ڕوویەکەوە وەدیهاتوو نین؟، هەڵبەت بە گوێرەی مەزهەبەکەی ئیبن سینا.

مرۆڤ لە پرسیار و سۆرخ لە هیچ سنورێکدا ناوەستێ، تا ئێستاش وەهم لە کایەی خۆیدا ئەسپی خۆی تاودەدا، بیرکردنەوەش بێ کۆتا بەرەو پێشەوەمان دەبات. بۆیە گەر بێژین زەمەن و شوێن بێ کۆتان، ئەوە دەتوانین بێژین بەدوایەکداهاتنی هۆکرد و بەرهۆکان بێ کۆتا و بێ سنورن. بەڵام بوونی شتێکی دیاریکراوی کۆتادار، ناچارمان دەکات دان بە ئیرادەیەکی ئەزەلیدا بنێین. ئەویش یەکەم هۆکارەوە جیاوازە لەسەرجەم هۆکارەکانی تر. لەم خاڵەشدا غەزالی لەگەڵ فەیلەسوفان هاوڕا و تەبایە.

مەسەلەکە هەرچیەك بێت، دەتوانین ئەو دانپیانانەی غەزالی بەدەست بخەین لەسەر ئەوەی مەزهەبەکەی ئیبن سینا لەمەڕ فۆرم و دەروون مەزهەبێکی خەیاڵییە، نەیتوانیوە لەبەرامبەر ڕەخنەکانی ئەو خۆڕاگربێت.

### ٥- خودا و چاودێری ئیلاهی:

ئێستا گەیشتە سەر بابەتی زاتی خودا. فەیلەسوفان پێیان وایە خودا هەبوویەکی خۆبەدیهێنە، زاتی خودا ئەقڵە. زانینەکانی خودا لە ڕێگەی لێوەدەرچوونەوە دێنە بوون، هەڵبەت بەبێ ئەوەی ئیرادەی خۆی تێدا هەبێت، چونکە هەموو ئیرادەیەك نیشانەی کەموکوڕی یا پێویستیە، کەوایە ئیرادە و گۆڕانکاری لە ئیرادەکار دروست دەکات. ئیرادە جوڵەیەکە لە ماددەدا، بەڵام ئەقڵە پەرتەکان هەرگیز ئیرادەیان لێوە دەرناچێ.

لەبەر ئەوە خودا بەشێوەیەك لە ئافرێنراوەکانی تێدەگات کە مەیل و خواستی تێکەڵ نابێت، خودا خۆی دەناسێ، هەروەها ئەو یەکەم ئافرێنراوەش دەناسێ کە لێوەی سەرچاوەی گرتووە، یا هەروەکو ئیبن سینا دەڵێ: خودا (گشت)ـەکان دەناسێ، واتە ڕەگەزی شتەکان و جۆرە ئەزەلیەکانیان.

بەڵام لای غەزالی خودا ئیرادەیەکی کۆنی هەیە کە یەکێکە لە خەسڵەتە کۆنەکانی خودا، غەزالی لە مەسەلەگەلی ئەخلاق و میتافیزیکادا هەر ڕێچکەی پێشینانی خۆی گرتووە، لەوەی کە زانست دەکەوێتە پێش ئیرادەوە. بەڵام پێی وابووە ئەگەر بۆچوونی ئەوەی زانستی ئیلاهی ناکۆك نەبێ لەگەڵ یەکێتی زات، ئەو قسەکردنە لەسەر ئیرادەی ئیلاهیش هەر ناکۆك نییە لەگەڵی، نەك تەنها فرە بابەتیەکانی مەعریفە و پەیوەندییە هەمەجۆرەکانیان بەزاتی زانا، بەڵکو پەی بەخۆبردنی مرۆڤیش، واتە بزانێ کە دەزانێ، هەموو ئەمانە ئەگەر بە پرۆسەیەکی بێ کۆتاییان بزانین، ئەوە دەبێ کارێکی ئیرادی هەبێ سنوری بۆ دابنێ.

هەورەها کاری ئیرادی رەسەن بۆ وریاکردنەوەی مرۆڤ یا لەخۆڕامانی و زانستی ئیلاهی بەگشتی کارێکی ئیرادی ئەزەلی رەسەنە، فەیلەسوفان دەڵێن: خودا ویستی لەسەر جیهان هەبووە، چونکە زانیویەتی جیهان باشترە، بەڵام غەزالی بە پێچەوانەی ئەوان دەڵێ: خودا جیهان دەناسێ، چونکە ویستی لەسەر بووە و بە ئیرادەشی ناسیویەتی.

ئەگەر خودا ویستبێتی جیهان خەلق بکات، خەلیقیشی کرد، ئایا بچوکترین گەردیلەشی لە بیرکردوە لەوەی ئافراندویەتی؟، هەروەها ویستی ئەزەلی خودا هۆکردی سەرجەم بوونە تاکیەکانە.

زانستی ئەزەلی خودا سەرجەم بوونەوەران دەگرێتەوە، ئەمە بەبێ ئەوەی ئەو شتە ناکۆك بێ لەگەڵ یەکێتی زاتی خودا، کەوایە خودا گرنگی بە شتە تاکیەکان و جوزئیەکانیش دەدات.

گەر کەسێکیش نەیاری کرد و ووتی بۆچوونی ئەوەی، چاودێری خودایی وادەکات هەموو شتێکی بەشەکی پێویست و خۆبەدیهێن بێ، غەزالی هەر بە وەڵامەکەی (ئۆگەستینی قەشە) وەڵامی داوەتەوە کە دەڵێ: زانینی شتێك بەر لە روودانی، هیچ جیاوازی نییە لەوەی دوای روودانی بزانێ، واتە خودا بێ بەرییە لە ئەگەرەکانی زەمەن.

جا دەبێ ئێمەش بپرسین: ئایا غەزالی قوربانی بە هاتنەئارای جیهان و ویستی مرۆڤ لەکارەکانیدا نەداوە کە ویستویەتی بیسەلمێنێ ئەو ئیرادەیەی کە غەزالی کردبوویە بنەمای هەڵێنجانەکانی و هەرگیز دەستبەرداری نەدەبوو، ئایا لە پێناو پتەوکردنی بەڵگە لەسەر توانای رەها، قوربانی بەو ئیرادەیەوە نەدابوو، کە ئیرادەیەکی کۆنی ئافرێنەرە؟، ئەم جیهانە کە جیهانی تاریکی و خەیاڵات و وێنەیە لە پێناو سەلماندنی ئیرادەی خودا لە نێو دەچن، هەروەك ئەوەی غەزالی ناوی لێناوە.

### ٦- مرۆڤ:

بابەتی سێهەم کە تیایدا غەزالی وەڵامی فەیلەسوفانی داوەتەوە، لە رووی فەلسەفییەوە لە دوو بابەتەکی پێشتر کەم بایەخترە، واتە بابەتی: نکۆڵیکردن لە زیندووبوونەوەی جەستەکان.

فەیلەسوفان پێیان وایە تەنها دەروون لە نێوچوونی مەحاڵە، چ تاك تاکەبن یا بەشێك بێ لە دەروونی گشتی، بەڵام جەستە چارەنووسی لە نێوچوونە، ئەم دوالیزمە لەرووی تیۆریەوە بووە هۆی مەزهەبێکی ئەخلاقی سۆفیگەرانە. بەڵام زۆر بە ئاسانی لە واقیعدا دەشێ ببێ بە مەزهەبێکی بەرەڵڵایی و داوێنپیسی (Libertinism).

ئەمەش بووە هۆی وروژاندنی هەستی ئایینی و مۆرالی غەزالی. ئەگەر جەستە ئەرك و راسپاردەی لەسەر بێت، ئەوە مافی پاداشت و سزایشی هەیە. ناکرێ نکۆڵی لە ئەگەری زیندوبوونەوە بکرێ یا سەرسامان بکات، چونکە وابەستەبوون دەروون بە جەستە تازەکەیەوە سەیروسەمەتر نییە لەوەی پابەند بێ بەو جەستە خۆڵیەی پێشتر تێیدابووە، ئەوەی کە فەیلەسوفان باسی دەکەن.

کەوایە هەموو دەروونێك رۆژی زیندووبوونەوە، جەستەیەکی تازەی گونجاو پێدەدرێ، راستیەکەی دەروون هەر مرۆڤە (مرۆڤیش دەروونەکەی نەك لاشەکەی)، بەڵام ئەو ماددەیەی کە رۆژی دوایی جەستە لێ دروست دەکرێ هەر ماددەیەك بێ دەبێ.

### ٧- مەزهەبی کەلامناسیانەی غەزالی:

لەو بۆچوونانەی دواییەوە دەردەکەوێ مەزهەبی کەلامناسیانەی غەزالی لە کاریگەری تێڕوانینی فەلسەفیانە بە دوور نەبووە چ هەستی پێ کردبێ یا نا، کەڵکی لە بۆچوون و بیروباوەڕە فەلسەفییەکان وەرگرتووە، هەروەك پیاوانی کەنیسە لە رۆژئاودا. بۆیە موسڵمانانی مەغریب ماوەیەکی زۆر مەزهەبەکەیان بە بیدعە لە قەڵەم دەدا، راستیەکەی مەزهەبی غەزالی لەمەڕ زاتی خودا و دەروونی مرۆیی توخمگەلی سەیر و نامۆ بە بنەما سەرەکیەکانی ئیسلام تێدایە، کە دەکرێ وەپاڵ حیکمەتی بتپەرستی بدرێ، ئەوەش لە رێگەی زانا مەسیحی

و جولەکەکانەوە، هەروەها لە ڕێگەی فەیلەسوفانی ئیسلامی دوای ئەو زانا مەسیحی و جولەکانەوە.

لای غەزالی خودا، ڕەبی جیهانە، هەروەها ڕەبی موحەممەدە، بوونی هەیە، زیندووە، بەڵام مەزهەبی غەزالی لەمەڕ زاتی خودا پتر بەلای ئەوەدا بووە خودا لە هەموو بیروباوەڕانەی عامەی موسڵمانان و مەزهەبی موعتەزیلە دابماڵێ، هەروەها غەزالی جەخت دەکات، کە ڕێگەی ناسینی خودا بریتیە لەوەی دەبێ هەموو خەسڵەت و سیفەتێکی ئافرێنراوان و بونەوەرانی لەسەر لا ببەین، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە خودا خاڵیە لە سیفەت و خەسڵەت، بەڵکو مەسەلەکە ڕێك پێچەوانەی ئەوەیە.

فرە خەسڵەتی یا فرە سیفەتی دژی یەکێتی خودا نییە، بەڵکو لەو جەستانەدا کە ئەم شتە دەنوێنن: ناکرێ شتێك لە یەك کاتدا سپی بێ و ڕەشیش بێ، بەڵام دەکرێ شتێك سارد بێ و وشکیش بێ، بەڵام پێویستە مرۆڤ کاتێك سیفەتێك وەپاڵ خودا دەدا کە وەپاڵ مرۆڤیش دەدرێ، دەبێ مانایەکی باڵاتر و جیاوازتر لەوەی پێبدا کە بە مرۆڤ دراوە. چونکە خودا ئەقڵێکی بێگەردە، لەبەر ئەوەی سەرەڕای ئەوە بە هەموو شتێك زانا و توانایە، بە چاکەی بێگەردیش وەسف دەکرێ و هیچ شتێکیشی لە یاد ناچێ.

بەهۆی ئامادەیی خودا لە ناو هەموو شتێك، دەبێ دونیا پتر لەوەی پێمان وایە لە خودا نزیکتر بێ.

لێرەدا ئاراستەیەك بۆ پاککردنەوەی زاتی ئیلاهی دەبینین، بەڵام زیندوبوونەوە و ژیانی دوایی ڕوحانی تر دەبێ لەوەی لەم دونیایەدا هەیە، ڕای فەلسەفیانەی (گنۆسی)ش کە باس لە بوونی سێ یا چوار جیهان دەکات، وا لەو بۆچوونەی سەرەوە دەکات شیاو بێت. هەندێ جیهان هەن لەسەر یەکترن: جیهانی سەرزەمینی بەرهەستانە کە مرۆڤەکانی تیادا دەژین، جیهانی ئەقڵە ئاسمانیەکان و دەروونی مرۆیی، جیهانی ئەو فریشتانەی کە دەکەونە سەرووی ئاسمانەکانەوە، پاشان زاتی خودا کە ڕووناکیەکی پاك و ئەقڵێکی کامڵە. دەروونی چاکەکار کە ڕووناکی بەسەردا هەڵهاتووە بە تێپەڕاندنی ئاسمانەکان، جیهانی خوارەوە بەجێدەهێڵێ تا دەگاتە ژێر سێبەری خودا. چونکە ئەو دەوورنە حەقیقەتێکی ڕوحانی هەیە و جەستەکەشی لە ڕۆژی دواییدا هەر ڕوحانیە.

مرۆڤەکان هەروەکو جیاوازی جیهانەکان و جیاوازی دەروونەکان، لێکتر جیاوازن. ئەو مرۆڤەی لەکۆت و بەندەکانی هەست قوتاری نەبووە، نابێ دەستبەرداری قورئان و فەرمودە

بێت و ناشبێ دەقەکانی کتێب تێپەڕێنێ، هەروەها دەبێ دیراسەکردنی فیقھ ببێتە خۆراکی. بەڵام فەلسەفە سەبارەت بەو کەسە ژارێکی کوشندەیە، ئەو کەسەی مەلە نازانێ نابێ لە لێواری خزی رووبار خۆی نزیك بکاتەوە.

بەڵام گرووپێك هەن خۆیان دەهاوێژنە نێو دەریا تاکو فێری مەلە بن، ئەمانە گەرەکیانە بەهۆی باوەڕیانەوە سەرکەون بۆ پلەی زانست، ئەمانە بە ئاسانی دەکەونە نێو گومڕایی و دووردونگیەوە، غەزالی پێی وایە دەرمانی دەردی ئەمانە کەلامناسی و ئەو شتانەیە کە دژی فەیلەسوفان نوسراون.

بەڵام گرووپێك هەن لە باڵاترین پلەی کەماڵی مرۆییدان، ئەم گرووپە بێ تێڕوانینی دژواری ئەقڵی، بەڵکو بەهۆی ئەو رووناکیەوە کە خودا خستویەتیە دڵیانەوە، حەقیقەتی جیھانی رووحانی دەبینن، وەك پەیامبەران و سۆفیگەرەکان، هەروەها دەکرێ غەزالیش بە یەکێك لەو گرووپە دابنرێ. ئەمانە لە هەموو شتێکدا خودا دەبینن، ئەمانە لە دەروونی خۆیان و لە گەردووندا تەنھا خودا دەبینن، زۆریش بەجوانی لە دەروونی خۆیاندا دەبینن، چونکە گەرچی دەروون هاوپلەی خودا نییە بەڵام لەو دەچێ. خودا چۆن هەموو ئەو شتانە دەگۆڕێ!، ئەو شتانەی کە پێمان وابووە لە واقیعدا هەن، بەڵام هەنوکە دەبنە شتگەلی دەروونی، یا دەبنە سیفەتێك لە سیفەتەکانی دەروون، ئەو دەروونەش هەرکات هەستی کرد لە خودادا فەنابووە، دەگاتە ئەوپەڕی کامەرانی و ئاسودەیی خۆی. کۆی شتەکان لە خۆشەویستیدا دەبن بە یەك شت.

بەندایەتی تەواوەتی خودا باڵاترە لە ترسی سزا و چاوەڕوانی پاداشت، دەگاتە ئاستێك دەروون خۆشەویستیەکی روحانی بۆ ئافرێنەرەکەی دەبێت. مرۆڤی چاکەکار کە هێشتا کامڵ نەبووە داوای لێخۆشبوون و سوپاسگوزاری دەکات، بەڵام بەندەی کامڵ لەسەروی لێخۆشبون و سوپاسگوزاریەوە، ئەم بەندەیە خودای خۆشدەوێ و زۆر رەزمەندانە سوپاسی دەکات، تەنانەت لەم جیهانەشدا.

### ٨- وەحی و ئەزموون:

لەوەی پێشتر خستمانە روو، دەردەکەوێ سێ پلەی ئیمان یا یەقین هەیە: ***یەکەم:*** ئیمانێکی گشتی کە پشتی بە گێڕانەوە بەستووە، عەوامی خەڵکی بڕوا بەو شتانە دەکات کە ئەهلی متمانە پێیان رادەگەیەنن، بۆ نموونە پێیان دەڵێن: فڵانە کەس لە ماڵە یا لە کوێیە. ***دووەم:*** زانینی ئەو زانایانەی کە بەهۆی هەڵێنجان پێی گەیشتوون، ئەمانە گوێڕادێرن بۆ قسەی ئەو کەسەی گەرەکیانە و یەکسەر دەزانن لە ماڵە یا لە کوێیە. گەرچی پلەی ***سێیەم*** هەیە، کە پلەی یەقینی ئەو عاریفانەیە کە بێ پەردە راستی دەبینن، ئەمانە دەچنە ژوورەوە و بە چاوی خۆیان هەر کەسی بیانەوێ دەیبینن.

غەزالی لە هەموو شتێکدا پلە و پایەیەکی مەزنی بە ئەزموون داوە، بە پێچەوانەی کەلامناسان و فەیلەسوفان، ئەمانە بە مانا گشتیەکانیانەوە مافی ئەو هەموو بەشەکیانەی نێو جیهانی بەرهەستیان فەرامۆش کردووە. بۆ نموونە ئێمە بەهۆی ئەزموونەوە چۆنیەتی شتە بەرهەستەکان و ژمارەی هەسارەکان دەزانین، نەك بە هەڵێنجانیان لەمانا ئەپستراکتەکان. ئەم مانایانە کەمترن لەوەی هەموو شتەکانی نێو قوڵایی دەروونمان بگرێتە خۆی و پێیان بگات.

خۆشەویستانی خودا زانستێکیان لەمەڕ دونیا هەیە، ئەو زانایانەی پشت بە هەڵێنجانی ئەقڵی دەبەستن پێی ناگەن. تەنها ژمارەیەکی کەمی خەڵکی بەو پلەوپایەیە دەگەن ئەوانیش: پەیامبەران و نێردراوان لە هەموو سەردەمەکاندا. بۆیە شوێنکەوتنیان لەسەر هەموو ئەو کەسانە ئەرکە، کە لە پلەوپایەی زانیندا لەوان لەخوارترن. بەڵام رێگەی گەیشتن بە مەعریفەی روحی کە لە روحی خۆمان باڵاترە چۆنە، کە ئێمە پێویستمان بە رێنیشاندانی ئەوە؟ ئەم پرسیارە هەموو ئەو مەزهەبە ئایینیانەی لەسەر گابەردی خۆی وردوخاشکرد کە نەیاندەتوانی دەستبەرداری نێوەندێتی مرۆیی بن (واتە نێوان ئافرێنەر و مرۆڤ)، هەڵبەت ئەگەر بە تێڕوانینێکی ئەقڵانی بێگەرد لە ئایین بڕوانین.

وەڵامەکەی غەزالیش بۆ ئەو پرسیارە وەڵامێکی راڕا و ناسەقامیگر بوو، غەزالی زۆر بە دڵنیاییەوە پێی وابوو بۆ سەلماندنی پەیامبەرایەتی پەیامبەرێك، تەنها بەڵگە ئەقڵانیەکان بەس نین. هەروەها دەیگوت ئێمە پەیامبەرێك یا عاریفێك دەناسین کە زانستەکەی لە خوداوە وەرگرتووە، چونکە خودا نموونەیەکی خەسڵەتەکانی پەیامبەرایەتیمان پێدەدا لە دەروونماندا

دەبینین، یەقینداربوون بەراستی پەیامبەرایەتی کەسێك تەنها بە ناسینی رەوش و بارودۆخی ئەو کەسە بەدەست دێ و هەروەها بەتاقیکردنەوەی ئەو شتانەی لە بارەی پەرستش و مەعریفەوە دەیانڵێ تا بزانین تا چ رادەیەك کاریگەری دەبێت لە پاکژکردنەوەی دڵ. بڕوابوونمان بەوەی قورئان قسەی راستەقینەی خودایە، یەقینێك نییە بە بەڵگەی تیۆری، بەڵکو یەقینێکی متمانەدارە. تەنها موعجیزە بەس نییە بۆ بڕواکردن بە پەیامبەرایەتی پەیامبەر، بەڵکو وەحی و رەوشی پەیامبەر و کەسایەتی پەیامبەریش گرنگە، هەموو ئەوانە لە دەروونیدا کاریگەرییەکی گەورەیان دەبێت. ئەگەر دەروونیش بە هێزی ئەو کاریگەرییە کێشکرا، لە کەلی لوتڵبندی دێتە خوارێ و رێگەی گەیشتن بە خودا دەگرێتە بەر.

## ٩- تێڕوانینی گشتی:

گومانی تێدا نییە غەزالی سەیرو سەمەرەترین کەسایەتی نێو مێژووی ئیسلامە، مەزهەبەکەشی هەر وێنەی کەسایەتی خۆیەتی. غەزالی هەوڵی زاهیدانەی دا بۆ تێگەیشتن لەم جیهانە، بەڵام دەرکی بەوە کرد مەسەلەی ئایینی لەوە قوڵترە وەك ئەوەی فەیلەسوفانی سەردەمەکەی تێی گەیشتوون. غەزالی پێی وابوو ئەو فەیلەسوفانە وەکو فەیلەسوفانی یۆنان لە رێبازەکانیاندا ئەقڵانی بوونە، هەروەها پێی وابوو مەزهەبەکانی ئایین بەرهەمی هێزێکی خەیاڵکرد یا وەهمی سەرجادەیە، یا بەرهەمی هەوا و ئارەزوون. هەروەها پێی وابوو ئایینی ئایینپەروەران یا ملکەچی کوێرانەیە (لای هەندێ کەس) یا نموونەیەکی مەعریفەیە کە هەڵگری هەندێ حەقیقەتە، بەڵام خوارتر لە حەقیقەتەکانی فەلسەفە (لای هەندێکی دیکە).

غەزالی نەیاری ئەو بۆچوونە بوو کە دەیوت ئایین چێژ و ئەزموونی دڵ و روحە. هەروەها ئایین تەنها حوکمی شەرعی و بیروباوەڕ نییە، بەڵکو پتر لەوانەیە، ئایین شتێکە ئاییندار بە روحی، بە شێوەیەکی زیندوو هەستی پێ دەکات.

هەموو مرۆڤێك بە روحی هەست بەو شتە ناکات کە غەزالی هەستی پێکردبوو. بەڵام ئەو مرۆڤانە ناتوانن شوێنپێی ئایین هەڵگرن کاتێك لەسەر باڵی سۆفیزم سنوری ئەو زانیاریانە تێدەپەڕێنن کە دەکرێ بە ئاسانی بەدەست بهێنرێن. دواجار ناچارن دان بەوەدا بێنن کە هەوڵەکانیان بۆگەیشتن بە خودا، وێڕای سەرکێشیەکانیان لە مێژووی ئەقڵی مرۆییدا، کەمتر نییە لە رێچکەی فەیلەسوفانی سەردەمەکە. گەرچی ئەم رێچکانە لە یەقین نزیکترن، چونکە شوێنکەوتووانیان بەسەرزەمین و رێگەگەلێکدا رۆیشتوون فەیلەسوفانی پێش خۆیان ئاشکرایان کردووە.

## ٢- پوختەکاران: The Epitomists

### ١- پێگەی فەلسەفی:

گەر مێژووی شێوازی فێربوون لای گەلانی ئیسلامی بنوسینەوە، ئەوە دەبێ شوێنێکی پتر لەم کتێبەی بەردەستمانی بۆ تەرخان بکەین، بۆیە ناچارین بە کورتی باسی لێوە بکەین.

زۆرجار دەڵێن غەزالی بە یەکجاری فەلسەفەی لە رۆژهەڵاتدا لە نێوبرد، هیچیشی لەودا بە جێ نەهێشت، بەڵام ئەم بۆچوونە هەڵەیە و بەڵگەی شارەزایی بە مێژوو و تێگەیشتن لە حەقیقەتی مەسەلەکان نییە. ژمارەی مامۆستایان و قوتابیانی فەلسەفە دوای غەزالی لە رۆژهەڵاتدا بەسەدان و بگرە بە هەزارانە. هەروەك زانایانی یەکتاپەرستی دەستبەرداری بەڵگە دیالێکتیکیە کەلامیەکانیان نەبوون لە پشتگیریکردنی مەزهەبەکان، بە هەمان شێوە زانایانی فیقهیش هەر دەستبەرداری وردبینی و لق و پۆپەکانیان نەبوون، برێك لە بیروباوەڕی فەلسەفیش هاتە نێو رۆشنبیری گشتییەوە.

بەڵێ فەلسەفە نەیتوانی پێگەی یەکەم بۆخۆی داگیر بکات، نەشیتوانی ئەو رێز و شکۆیە بپارێزێ کە پێشتر هەیبوو. لە حەکایەتێك لە حەکایەتە عەرەبیەکاندا دەڵێ، فەیلەسوفێك دەکەوێتە زیندانەوە، پیاوێکی تر دەیەوێ بیکڕێ و بیکاتە کۆیلە، لێی دەپرسێ تۆ بە کەڵکی چ کارێك دێی؟، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: "بۆ ئەوە باشم ئازاد بکرێم"، فەلسەفە هەر دەبێ ئازاد بێ، بەڵام لە رۆژهەڵاتدا ئەم ئازادییە کوا؟، رزگاربوون لە بارگرانیەکانی ژیانی ماددی و ئازادی توێژینەوە هەمیشە لەو وڵاتانەدا کز و لاوازبووە کە فەرمانڕەواکانیان نارۆشنگەربوونە، چونکە ئەو فەرمانڕەوایانە بە تەنگی پاراستنی ئازادی فکرەوە نەبوون و ناتوانن ئازادی بۆ ئازادیخوازانی فکر دەستەبەر بکەن. فەیلەسوفان لە چەندین وڵاتدا دووچاری چەوساندنەوە دەبوون، چونکە بە مەترسی بۆ سەر ئایین و دەوڵەت لە قەڵەم دەدران.

ئەمەش نیشانەیەکە لە نیشانەکانی داڕوخان و لەبەریەکترازانی شارستانیەت. گەرچی گەڕیدەکانی خۆرئاوا لە سەدەی دوانزەهەمی زاییینیدا زۆر ستایشی شارستانیەتی خۆرهەڵاتیان کردووە، وەلێ ئەگەر بەسەدەکانی رابردوودا بەراورد کرابا لە داکشان و پاشەکشەدا بوو، چونکە هیچ کەسێك نەبوو لە کایەیەك لە کایەکانی ژیاندا شتێك دابهێنێ، ئەقڵەکان لە کاری وا کۆت و بەندکرابوون و بزووتنەوەی بەرهەمی زانستی چەقی بەستبوو، ئەو نوسەرانەی لە

سەدەکانی دواتردا هەن، هیچ کارێکی وەهایان نییە تەنها هەڵبژاردنی کتێبە باشەکانی نوسەرانی پێش خۆیان نەبێت، بەدەرکەوتنی سۆفیگەریش تیۆرە فیقهی و کەلامیەکان کۆتاییان پێهات.

لە فەلسەفەشدا دوای ئیبن سینا کەس بە تەنگی هزری داهێنەرانەوە نەبوو. جا چەرخی پوختکردنەوە و راڤە و پەراوێز و سەرنج و تێبیی هات. زانایانیش کاتی خۆیان لە قوتابخانەکاندا لە شتی وادا بەسەر دەبرد، بەڵام بڕوادارانی ئاسایی وردە وردە رەخنەیان لە پیرانی تەریقەتی سۆفیگەری دەگرت.

## ٢- کولتوری فەلسەفی:

زۆرترین شت کە رۆشنبیری گشتی لەو زانستە رێخۆشکەرانەی فەلسەفەی خواست، تەنها برێك بیرکاری و ئەو جۆرە شتانەبوو، کە هەڵبەت بابەتی زۆر سەرەکی بوون ئەوکات.

شوێنکەوتوانی رێچکە سۆفیگەرییەکان زۆر شتیان لە حیکمەتی فیساگۆرسی و ئەفلاتونی خواست، ئەوەش بۆ پشت ئەستورکردنی بیروباوەڕانی پیاوانی ئایینی و موعجیزەکان، هەروەها بۆ رازاندنەوەی سیۆسیۆفیزمی نەزۆك (Theosophy)[106]، کە کۆکراوەی چەندین بیروباوەڕی جیاجیابوو. هەروەها لایەنگرانی ئەم رەوتە ئەرەستۆیان بە مامۆستای خۆیان لەقەڵەم دەدا. هەڵبەت پشتیان بەو کتێبانە دەبەست کە وەپاڵ ئەرەستۆ درابوون و ئەرەستۆشیان بە قوتابی هەرمیس و ئاگاتازیمۆن دادەنا.

بەڵام بیرمەندە ئەقڵانیەکان وەختێك پەنایان وەبەر مەزهەبی ئەرەستۆ دەبرد کە بیروباوەڕە تایبەتیەکانیان لەگەڵ بیروباوەڕی ئەهلی سوننەتدا تەبا بووبا، زۆرینەشیان پشتیان بە ئیبن سینا دەبەست و نەدەگەڕانەوە بۆ فارابی، بە دەگمەنیش هەوڵی تەباکردنی نێوان فارابی و ئیبن سینایان دەدا، ئەوەش لەبەر ئەوەی خەڵکی کەم گرنگیان بە بابەتی سروشت و سەروسروشت

---

(١٠٦) ئەم وشەیە وەکو ئەوەی لە پێکهاتەیەکەوە دیارە واتە (حیکمەتی ئیلاهی)، هزرێکی ئایینی فەلسەفییە و شوێنکەوتوانی بانگەشەی مەعریفەی تایبەت بە زاتی ئیلاهی دەکەن، هەندێ جار دەڵێن ئەو مەعریفەیە بەرهەمی کردەی هێزی باڵا یا سروشی سەرو ئاساییە. هەندێ جاریش دەڵێن قوڵترین حیکمەتی تیۆرییە. (سیۆسۆفیزەمەکان) یەکەمین کەس بوون باسیان لە زاتی ئیلاهی کردووە و هەوڵیانداوە ئەم جیهانە بە کردەی هێزێك لە زاتی ئیلاهی لەقەڵەم بدەن. (و.ع)

(میتافیزیکا) دەدا و پتر گرنگیان بە ئەخلاق و سیاسەت دەدا، لۆژیکیش تاکە زانست بوو هەمووان بیخوێنن، چونکە بە ئاسانی دەخرایە نێو قاڵبی قوتابخانەییەوە، لۆژیکی وێنەییش کەرەستەیەك بوو هەموو قوتابییەك دەیتوانی کەڵکی لێوەر بگرێ، دەکرا هەموو شتێك بە شێوازی لۆژیکیانە بسەلمێنرێ، تەنانەت ئەگەر مرۆڤ پوچی بەڵگەیەکیشی بۆ دەرکەوتبا، ئەوە هەر دەیتوانی دڵنەواییەك بدۆزێتەوە کە مەدلولەکە بەدرۆ نەخرێتەوە، یا بەڵگەکەش بەشێوەیەکی دروست دانەڕێژرابا.

ئەبو عبدالله الخوارزمی لە کۆتاییەکانی سەدەی چوارەمی کۆچیدا لە کتێبەکەیدا پێگەیەکی پتری لە سروشت و خوداناسی بە لۆژیك بەخشیوە، ئەم شتە لە زۆربەی کتێب و ئینسکلۆپیدیای زانایان دووبارە کراوەتەوە، هەروەها زانایانی پەکتاپەرستیش ڕێباز و ڕێچکەکانیان بە سیستەمی لۆژیك و ئیپستمۆلۆژیا (زانستی زانین) دەخستەروو وەکو هەمیشە پشتیان بە زانست دەبەست.

لە سەدەی شەشەمی کۆچیشەوە زۆر کتێب دەرکەوتن کە بە شێوەیەکی نوێ لۆژیکی ئەرەستۆیان خستبووە بەرباس، با لێرەدا باسی کتێبەکانی ئەبهەری[١٠٧] (١٢٦٤ز) بکەین کە پوختەیەکی بۆ کۆی لۆژیك نووسی بەناوی (ئیساگۆژی)، کە دواتر بوو بە کتێبێك لە نێوان قوتابیاندا دەستاودەستی پێدەکرا و زانایانی چەندین جار راڤە و لێکدانەوەیان بۆ کرد، هەروەها کتێبەکانی قەزوێنی[١٠٨]یش بەهەمان شێوە. (١٢٧٦ز مردووە).

تا ئێساش پوختە و کورتکراوەکانی هەردوو سەدەی حەوتەم و هەشتەمی کۆچی لە زانکۆی ئەزهەر لە قاهیرە بەکار دەهێنرێن، زانکۆی ئەزهەر گەورەترین پەیمانگی ئیسلامیە لە جیهاندا، ئەو رستەیەی کە دەڵێ: "دەبێ مرۆڤ بە خوێندنی لۆژیك دەست پێبکات"[١٠٩]، هەروەك چۆن بەسەر ئێمەدا پەیڕەو کرا بەسەر ئەو زانکۆیەشدا پەیڕەو دەکرێ. پێویست بەوەش ناکات روونی بکەینەوە ئەم رستەیە بەرهەمێکی باشتری لەوە بەرهەم نەهێنا کە لای ئێمە هێنای. قوتابیان لە خوێندنی ئەو ڕێسا لۆژیکیەی کە زانایانی کۆن دایانهێنابوو چێژیان

---

(١٠٧) **اثیر الدین مفضل بن عمر الأبهري.**

(١٠٨) **نجم الدين على بن عمر القزويني الكاتيي.**

(١٠٩) گۆتە لە (فاوست)ــدا ئەم رستەیەی وتووە.

وەردەگرت، بەم کارەشیان هەر سنورەکانی شەریعەتیان نەدەبەزاند، بەڵکو گاڵتەشیان بەو فەیلەسوفانە و کەلامناسانی موعتەزیلەیش دەکرد کە بڕوایان بە ئەقڵ هەبوو.

## ٦- فەلسەفە لە مەغریبی عەرەبیدا

### ١- سەرەتاکانی:

### ١- سەردەمی بەنی ئومەیە:

جیهانی ئیسلامی لە رۆژئاوادا لە: باکوری خۆرئاوای ئەفریقیا و ئیسپانیا و سەقڵیە پێك دێت، بەڵام ئەفریقیا پێگەی دووەمی هەیە، لێ سەقڵیە کە هاوشێوەی ئیسپانیابوو، هەر زوو ئەو نۆرماندیانەی لە باشوری ئیتاڵیاوە هاتبوون دەستیان بەسەردا گرت. ئێمە لێرەدا سەرەتا باسی ئیسپانیای ئیسلامی یا ئەندەلوس دەکەین، چونکە مەبەستی ئێمە ئەوەیە.

وەکو چۆن شانۆیەك دووبارە نمایش دەکرێتەوە، حەکایەتی شارستانیەتی خۆرهەڵات ئاوا گوێزرایەوە بۆ ئەندەلوس. لە رۆژهەڵاتدا عەرەب و عەجەمەکان تێکەڵ بە یەکتربوون، لە خۆرئاواشدا عەرەب و ئیسپانیەکان تێکەڵ بە یەکتربوون. لە خۆرهەڵاتدا تورك و تەتەرەکان هەبوون، بەڵام لە خۆرئاوادا بەربەرییەکانی باکور ئەفریقیا هەبوون کە هەمیشە هێزی توندی خۆیان بەکار هێناوە بۆ لاوازکردنی بونیادی کولتوری باڵا.

دوای ئەوەی دەوڵەتی بەنی ئومەیە لە شام (٧٥٠ز) رووخا، یەکێك لە ئەمیرەکانی ئەمەوی (واتە عبدالرحمن بن معاویە) بەرەو ئەندەلوس هەڵات و توانی بە تێکۆشانی خۆی ببێ بە ئەمیری قورتوبە و ئەندەلوس بەگشتی. ئەم سەردارێتیەی ئەمەویەکان دوو سەدە و نیو درێژەی کێشا. دوای سەردەمی کورتی مەلیکەکانی دەوروبەر. فەرمانڕەوایەتی ئەمەوییەکان لەسەردەمی عبدالرحمانی سێیەمدا (٩١٢-٩٦١ز) گەیشتە ترۆپك، ئەو پیاوە یەکەم کەس بوو نازناوی خەلیفەی بەخۆی بەخشی، لەسەردەمی کوڕەکەشیدا واتە حەکەمی دووەم (٩٦١-٩٧٦ز) سەدەی چوارەم لە ئەندەلوسدا هاوشێوەی سەدەی سێیەم بوو لە خۆرهەڵاتدا. لە هەردوو ئەو شوێن و سەردەمەدا شارستانیەتی ماددی و ئەقڵی گەیشتنە ئەوپەڕی پەرەسەندن.

دەتوانین بێژین شارستانیەتەکەی خۆرئاوا لە شارستانیەتەکەی خۆرهەڵات لاواتربوو و لەگەڵ ژینگەکەشیدا تەباتر بوو. ئەگەر ئەوە راست بێ کە دەڵێن توێژینەی تیۆری بەڵگەیە لەسەر

لاوازی یا چەقبەستوویی هێزی بەرهەمهێنان، ئەوە شارستانیەتی خۆرئاوا لە خۆرهەڵات پڕ بەرهەمتر بووە. لە خۆرئاوادا هێندەی خۆرهەڵات زانا و فەیلەسوف نەبوو، دەتوانین بڵێین ژیانی ئەقڵی لە خۆرئاوادا سادەتربوو، چینە کولتوریە کۆنەکانیش کەمڕەنگتر و کەمچەشنتر بوو بوو: لە ئەندەلوسدا لە سەردەمی عبدالرحمانی سێیەمدا لە پاڵ موسڵمانان جولەکە و مەسیحیەکانیش پشکی خۆیان لە کولتوری عەرەبیدا بەرکەوت، بەڵام شوێنکەوتوانی زەردەشت و بێباوەڕان Atheists لە خۆرئاوادا بونیان نەبوو، ناکۆکی و فرەگروپیەکانی خۆرهەڵات لە خۆرئاوادا ئامادەییان نەبوو. لە ئەندەلوسدا تەنها یەك مەزهەبی فیقهی هەبوو ئەویش مەزهەبیی ئیمام مالیك بوو. موعتەزیلەشی لێ نەبوو تاکو بە مەزهەبە کەلامیەکانیان ئاشتی و ئارامی ئاین بشێوێنن. بەڵام شاعیرەکانیی ئەندەلوس لە شیعرەکانیاندا باسی سێ شتیان دەکرد: مەی، ژن، گۆرانی، بەڵام بۆ کەس نەبوو باسی بیروباوەڕی بێ ئابڕوویی لەلایەك و سیۆسۆفیزم و زوهدی ڕەشبینانە بکات.

خۆرئاوا لە شارستانیەتی ئەقڵی خۆیدا بە شێوەیەکی گشتی پشتی بە ڕۆژهەڵات دەبەست.

لە سەدەی دەیەمی زایینیەوە خەڵکی بۆ سۆراخی زانست، لە ئەندەلوسەوە بەرەو خۆرهەڵات دەستیان کرد بە گەشت و گەڕان، بە میسردا تێپەڕدەبوون تا دەگەیشتنە وڵاتی فارس، لەوێ دەسگوتاری زانا نێودارەکانیان دەهێنا. حەوەجەی ئەهلی خۆرئاوا بە ڕۆشنبیری، زۆر لەو زانا خۆرهەڵاتیانەی بەلای خۆیدا راکێشا کە لە وڵاتانی خۆیاندا بێ کاربوون. وێڕای ئەوەش حەکەمی دووەم، فەرمانی کۆپیکردنی سەرجەم کتێبەکانی خۆرهەڵاتی دەرکرد تا کتێبخانەکەی خۆی پێ دەوڵەمەند بکات، دەڵێن ژمارەی کتێبەکانی پتر لە ٤٠٠٠٠٠ چوار سەد هەزار کتێب بووە.

خەڵکی خۆرئاوا تەنها گرنگیان بە بیرکاری و سروشتناسی و ئەستێرەناسی و پزیشکی دەدا، هەروەك چۆن لەسەرەتادا خەڵکی خۆرهەڵات گرنگیان بەو کایانە دەدا. خەڵکی زۆر بە پەرۆشەوە شیعر و مێژوو و جوگرافیایان دەخوێند، شەپۆلی فەلسەفەکاری پۆچ، ئەقڵی ئەهلی خۆرئاوای تێك نەدا. کاتێك عبدالله بن مسرە قورتوبی لەسەردەمی عبدالرحمنی سێیەم گەیشتە وڵاتی ئەندەلوس، فەلسەفەی سروشتی لەگەڵ خۆی هێنا، بەڵام بەبەرچاویەوە کتێبەکانی سوتێنران.

## ٢- سەدەی پێنجەم:

ساڵی (١٠١٣ز) بەربەرەکان شاری قورتوبەیان تەفروتونا کرد. کە پێشتر (بوکی جیهان) بوو. دەوڵەتی بەنی ئومەیەش هەڵوەشایەوە و بوو بە چەند دەوڵەتۆچکەیەکی دەوروبەر. بەڵام جارێکی تر لەسەدەی پێنجی کۆچیدا گەشایەوە، ئەو سەدەیە چەرخی زێڕینی ئەندەلوس بوو، لە ئەندەلوسدا لەسەرجەم کۆشکی ئەمیری کۆی شاران شیعر و هونەر پەرەیان سەند و بەسەر میراتی پڕ شکۆی دێریندا سەرکەوت. هونەرەکان پێشکەوتن و حیکمەت تێکەڵ بە شیعربوو، بیرکردنەوەی زانستیش وردتربوو، بەڵام خەڵکی خۆرئاوا سەرچاوەی ئاوخواردنەوەی ئەقڵییان هەر خۆرهەڵات بوو. جا فەلسەفەی سروشتی و کتێبەکانی ئیخوان سەفا و لۆژیکی شوێنکەوتوانی سولەیمانی سەجیستانی هاتنە ئەندەلوس، لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا هەست بە کاریگەری بەرهەمەکانی فارابیش دەکرێ، هەر لەو سەدەیەدا کتێبی (یاسا)ی پزیشکی ئیبن سینا ناسرا.

بەڵام سەرەتاکانی هزری فەلسەفیی بە زۆری لای زانا جولەکەکان بەرچاو دەکەوێ، فەلسەفەی سروشتی خۆرهەڵات زۆر کاریگەری هەبوو بەسەر هزری ئیبن جەبرول کە نوسەرە مەسیحیەکان بە (ئەڤنسبرۆل –avencebrol) ناویان بردووە.

باخیار بن یاخودا کاریگەربوو بە ئیخوان سەفا، بگرە شیعری ئایینی جولەکەش دەبینین کاریگەربووە بە بزووتنەوەی فەلسەفی، ئەو شیعرانە باسیان لە گەلی جولەکە نەدەکرد کە سۆراخی خوداکەی دەکات، بەڵکو زمانحاڵی ئەو دەروونە بوو کە گەرەکیبوو سەربکەوێ بۆ جیهانی ئەقڵی.

ژمارەی ئەو موسڵمانانەی لە دیراسەکردنی فەلسەفەدا قوڵ بووبوونەوە زۆر کەمبوون، مامۆستایانیش لە ئەندەلوس نیشتەجێ نەدەبوون تا قوتابیان بەدەوریان ئەڵقە ببەستن. بەدەگمەن کۆڕ و کۆبوونەوەی زانستی ئەنجامدەدران تا گفتوگۆی بابەتە فەلسەفییەکان بکرێ. بۆیە رۆشنبیری سەربەخۆ هەستی بە ترس و تەنیاییەکی گەورە دەکرد. فەلسەفە لە خۆرئاوادا هەروەك خۆرهەڵات، دەروونی تاکەکەسانی وروژاند، گەرچی لە خۆرئاوادا تاکەکان پەرتبوون و کۆڕوکۆبوونەوە کۆی نەدەکردنەوە، وێڕای ئەوەش فەلسەفە دووربوو لە عەقیدەی جەماوەر، لە خۆرهەڵاتدا کەلێنی نێوان عەقیدەی ئایینی و زانست زۆر فراوان بوو، واتە نێوان خەڵکی عەوام

و فەیلەسوفان. بۆیە لە خۆرئاوادا گرفتی رۆشنبیری ئازاد لە هەمبەر دەوڵەت و لە هەمبەر خەڵکی دەمارگیری ئەقڵ تەسکدا، زۆر توندتربوو لە خۆرهەڵات.

## ٢- ئیبن باجە

### ١- دەوڵەتی مورابتین:

کاتێك ئەبوبەکر محمد بن یەحیا بن الصانع ناسراو بە ئیبن باجە لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچی لە سەرقستە لەدایکبوو، مەملەکەتی گەشەسەندووی ئەندەلوس لەسەروەختی هەڵوەشانەوەدا بوو بۆ چەند دەوڵەتۆچکەیەکی ورد. لە باکورەوە ئەو سوارە مەسیحیانە هەرەشەیان لێدەکرد کە لە عەرەب دواکەوتووتربوون، بەڵام زۆر ئازا و بە هێز بوون. گەرچی خانەوادەی بەربەری مورابیتەکان بۆ رزگارکردنی وڵات هاتن، مورابیتەکان هەر ئەوە نەبوو هۆگری ئایین بن، بەڵکو لە شێوازەکانی سیاسەتدا لە بنەماڵەکانی ئەندەلوس لێهاتوتر و شارەزاتر بوون کە بنەماڵەکانی ئەندەلوس نقومی کەیف و سەفا بوون. لەو سەردەمەدا کولتوری باڵا و توێژینەوەی ئازاد لە نێوچوون و لە نێو خەڵکیشدا جگە لە لایەنگرانی توندڕەوی فەرموودە کەس بوێری خۆدەرخستنی نەدەکرد، بەڵام فەیلەسوفان ئەگەر بیروباوەڕەکانی خۆیان ئاشکراکردبا رووبەرووی چەوساندنەوە و کوشتن دەبوونەوە.

### ٢- ژیانی ئیبن باجە:

گەرچی سەردارە بەربەرییەکان بیروباوەڕی تایبەت بە خۆیان هەبوو، حەزیان دەکرد کولتوری گەلانی ژێردەستەی خۆیان وەربگرن جا با وەرگرتنێکی روکەشانەش بوایە، ئەبوبەکر بن ئیبراهیم دەبینین کە زاوای عەلی پاشای مورابیتە و سەردەمێك فەرمانڕەوای سەرقیستە بوو، ئیبن باجەی کرد بە هاوڕێی دەستە راست و وەزیری خۆی، ئەمەش بووە هۆی توڕەبوونی فوقەها و جەنگاوەران، ئیبن باجە لەرووی تیۆری و پراکتیکەوە لە زانستە بیرکارییەکاندا زۆر لێهاتوو کارامە بوو، بەتایبەت لە فەلەکناسی و مۆسیقا و پزیشکیدا، هەورەها بە لۆژیك و فەلسەفەی سروشتی و میتافیزیکاش سەرقاڵ بوو، بەڵام توندڕەوەکان ئیبن باجەیان بە ئیمان لاواز و خراپەکار لە قەڵەم دا.

لەبارەی ژیانی ئیبن باجەوە هیچ نازانین، تەنیا ئەوە نەبێت دوای روخانی سەرقیستە ساڵی (١١١٨ز) چووەتە ئەشبیلیە و زۆرێك لە کتێبەکانی خۆی لەوێ نوسیوە. دوای ئەوە لە غەرناتە بینراوە، دواتر چووە بۆ کۆشکی پاشایانی مورابیتین لە فاس، ساڵی (١١٣٨ز) هەر لەوێدا کۆچی دواییکردووە. دەڵێن بە پیلانی دکتۆرێکی ئیرەییپێبەر ژارخوارد کراوە. ژیانیشی گەرچی کورت بووە بەڵام ژیانێکی ئاسودە نەبووە، ئەو خۆی وای گووتوە. زۆرجار ئاواتی مەرگی خواستوە تا لە رۆژی دواییدا ئاسودەیی و ئارامی بەدەست بێنێ. لە پاڵ هەژاریەکەیدا، تەنهایە ئەقڵیەکەشی باری دڵیان قورستر کردبوو. ئەوەی لە کتێبەکانیەوە دەردەکەوێ بەڵگەیەکی تەواوە لەسەر ئەوەی هیچ هەست و سۆزێکی بۆ سەردەم و ژینگەکەی نەبوو.

### ٣- تایبەتمەندییەکانی:

ئیبن باجە بە گشتی شوێنکەوتەی فارابی بوو، کە پیاوێکی خۆرهەڵاتی لەسەرخۆی دوورپەرێز بووە. ئیبن باجە رێك وەکو فارابی بەتەنگی دانانی رێباز و رێچکەوە نەبووە. بەرهەمە سەرەتاییەکانیشی زۆر کەمبوون، زۆرینەی ئەو کتێبانەش راڤەی کورتی کتێبەکانی ئەرەستۆ و فەیلەسوفانی تر بوو، تێبینیەکانیشی پەرش و بڵاوبوون و هیچ پەیوەندیەکیان پێکەوە نەبوو، کە قسەی لەسەر شتێك دەکرد، لایدەدا و دەچووە سەر بابەتێکی دیکە. بەڵام هەمیشە لە هەوڵی خۆ نزیکخستنەوە بوو لە بیروباوەڕی یۆنانی و زانستە کۆنەکان لە هەموو کایە جیاوازەکاندا.

ئیبن باجە نەیدەویست دەستبەرداری فەلسەفە ببێ و نەشیدەتوانی تیایدا شارەزا ببێ، ئەمە بۆمان دەردەخات مەزهەبەکەی ئیبن باجە لەسەرەتادا لە فۆرمێکی ناسەقامگیردابووە، بەڵام بەهۆی هەندێ پاڵنەری نادیارەوە شاعیریش بووە. لە سۆراخکردنی حەقیقەت و دادپەوەریشدا. شتێکی دیکەی دۆزیوەتەوە، ئەوەش یەکخستنی دەروونە پەرتبوەکەی و ئاسودەیی ژیانی بووە.

بەلای ئیبن باجەوە غەزالی کاتێك پێی وابووە ئاسودەیی تەنها بە هەبوونی تەواوەتی حەقیقەتێك دروست دەبێ کە خودا وەکو روناکیەك دەیخاتە دەروونەوە، مەسەلەکەی زۆر بەسادەیی وەرگرتووە. ئیبن باجە بە پێچەوانەوە پێی وابووە پێویستە فەیلەسوف بتوانێ لە پێناو خۆشەویستی حەقیقەتدا خۆی بەدوور بگرێ لەو ئاسودەییە، هەروەها سۆفیزمی ئایینی

بە وێنە هەستیەکانیشەوە وێڕای ئەوەی حەقیقەت دەردەخات، بەڵام پەردەپۆشی دەکات. تێڕوانینی ئەقڵانیانەی رووت کە تێکەڵ بە چێژی هەستیانە نابێت، تاکە رێگەی گەیشتنە بە بینینی خودا.

### ٤- لۆژیك و میتافیزیكا:

بەدەگمەن مەزهەبی لۆژیکی ئیبن باجە لە مەزهەبەکەی فارابی واوەتر چووە، بگرە بیروباوەڕە سروشتی و میتافیزیکیەکانی ئیبن باجە بەگشتی لەم کایانەدا لەگەڵ بیروباوەڕای فارابی کۆك بوو. تاکە تایبەتمەندی گرنگی ئیبن باجە شێوازی دەرخستنی پلەبەندی کامڵبوونی ئەقڵی مرۆیی و رادەی پێشکەوتنی مرۆڤ لە زانست و ژیاندا بووە.

ئیبن باجە پێی وابوو بونەوەران دابەش دەکرێنە سەر دوو بەش: بزواو و نەبزواو. بزواو جەستەیی کۆتادارە، بزاوتەکەشی ئەزەلیە، ئەم بزاوتە ئەزلیەش ناکرێ بێژین خۆبزوێنە، چونکە کۆتادارە. هەروەها ناکرێ بزاوتێکی بێ کۆتایی وەپاڵ هێزێکی بێ کۆتایی بدەین، یا وەپاڵ بوونێکی ئەزەلی بدەین، واتە ئەقڵ. لە کاتێکدا جەستەکان یا بونەوەرە سروشتیەکان لە ژێر کاریگەری شتەکانی دەرەوەی خۆیان دەبزوێن، ئەقڵ — گەرچی بزواوە- یارمەتی جەستە دەدات لە بزاوتندا، بەڵام دەروون ئەڵقەی پەیوەندی نێوان جەستە و ئەقڵە، بەڵام خۆبزوێنە.

ئیبن باجە زۆر بە ئاسانی قسەی لەسەر شتە دەروونی -روحیەکان و شتە جەستەیی ماددی سروشتیەکان کردووە، بەڵام بابەتی گرنگ بەلای ئەمەوە پەیوەندی ئەقڵە بەدەروونەوە، ئەوەش لە مرۆڤدا.

### ٥- دەروون و ئەقڵ:

بنەمای مەزهەبیی ئیبن باجە ئەمەیە: ناکرێ ماددە بێ وێنە یا فۆرم هەبێت، بەڵام فۆرم بێ ماددە بوونی هەیە. گەرنا، نەماندەتوانی وێنای هیچ گۆڕانێك بکەین، چونکە گۆڕان بەهۆی بەدوایەکداهاتنی فۆرمە جەوهەرییەکان، کارێکی شیاوە.

ئەو وێنە یا فۆرمەش هەر لە ئاستی خوارەوەی، کە وێنەی ماددەییە، تا ئاستی سەرەوەی کە ئەقڵە پوختەکانە، زنجیرەیەك دروست دەکات. ئەقڵی مرۆیی لە قۆناغەکانی کامڵبوونی خۆیدا قوناغەکانی ئەو زنجیرەیە دەبڕێ، تا دەبێتە ئەقڵێکی کامڵ و پەیوەندی بە ئەقڵی کاراوە دەکات، ئەرکی مرۆڤ ئەوەیە پەی بە سەرجەم وێنە ئەقڵانیەکان بەرێ: سەرەتا پەی بە وێنە

ئەقڵانیە جەستەییەکان دەبات، پاشان وێنە دەروونیەکانی نێوان هەست و ئەقڵ، پاشان ئەقڵی مرۆیی خۆی و ئەقڵی کارا کە دەکەوێتە سەرووترەوە، دواجار پەی بە ئەقڵێ پوختی ئەستێرەکان دەبات.

مرۆڤ بە تێپەڕین بە پلە یەکبەدوایەکەکاندا و سەرکەوتنی لە بەشەکان و بەرهەستەکان — وێناکردنیان بابەتی ئەقڵ دروست دەکات- دەگات بەو شتانەی سەرەوەی مرۆڤ و شتە ئیلاهیەکان، ئەو شتەی لەم گەشتەشدا ڕێنوێنی مرۆڤ دەکات فەلسەفەیە، یا ئەو مەعریفە گشتیەیە کە لە مەعریفە تاکیەکانەوە بەدەست دێ، بەڵام بە هەڵهاتنی رووناکی ئەقڵی کارا لەسەرەوە. هەموو هەستکردنێك یا خەیاڵکردنێك —هەڵبەت گەر بە مەعریفەی گشتی یا بێ کۆتا بەراوردی بکەین- مەعریفەیەکی فریودەرە. کەوایە ئەقڵی مرۆیی بەهۆی مەعریفەی ئەقلّیەوە بە کەماڵ دەگات، نەك بە خەیاڵ و خەونی ئایینیانەی سۆفیگەری کە بێ بەری نییە لە خلّت و خاشی هەستەکان. بیرکردنەوەی ئەقلّیانە ئاسودەییەکی باڵایە، چونکە هەموو شتێکی ئەقلانی بۆ خۆی مەبەستێکە. ئەگەر شتە ئەقلانییەکان گشتی بێت، ئەوە ناکرێ ئەو قسەیە پەسەند بکەین کە دەڵێ ئەقلّە بەشەکیە مرۆییەکان دوای ئەم ژیانە دەمێننەوە و نەمر دەبن.

بەڵام دەروون -کە بەهێزی خەیاڵ و لە رێگەی هەستەکان و ئەقلّەوە پەی بە بەشەکیەکان دەبات و بەهۆی ئارەزوو و کردارە هەمەجۆرەکانەوە دەردەکەوێ- دەتوانێ دوای مردن بمێنێتەوە و سزا و پاداشتی خۆی وەربگرێ. بەڵام ئەقڵ یا بەشی بیرکردنەوە لە دەرووندا لە هەموو کەسێکدا هەر یەکە، ئەقڵی مرۆیی بە گشتی ئەزەلیە، ئەوەش بەهۆی یەکگرتنی لەگەڵ ئەقڵی کارا، کە دەکەوێتە سەرووترەوە.

کەوایە ئەم تیۆرەیە کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بەناوی تیۆرەی ئیبن روشدەوە دەچێتە ناو جیهانی مەسیحاییەوە، لای ئیبن باجەش بەرچاو دەکەوێ، ئەم تیۆرەیە گەرچی بەتەواوی روون و یەکگرتوو نییە، بەڵام بە گشتی لەوەی فارابی روونترە.

## ٦- مرۆڤی دوورەپەرێز:

هەموو مرۆڤێك ناگاتە ئەم پلەیەی بیرکردنەوە، زۆرینەی خەڵکی لە تاریکیدا خەریکی بەکارهێنانی هەستن، ئەوان تەنها سێبەری شتەکان دەبینن، ئەو شتانەش هەر کە سێبەرییان نەما خۆیشیان نامێنن. بەڵێ هەندێ کەس رووناکی دەبینن و جیهانی شتە رەنگاورەنگەکان

دەبینن، بەڵام ئەوانەی پەی بە حەقیقەتی ئەو شتانە دەبەن کە دەیبینن زۆر کەمن، هەروەها ئەمە ئەو ئاسودانەن کە دەگەن بە ژیانی نەمریی، ئەوەش بە بوونیان بە روناکی.

بەڵام چۆن مرۆڤ دەگاتە ئەم پلەیەی مەعریفە و ژیانێکی ئاسودە؟، مرۆڤ لە ڕێگەی ئەو کردارانەی زادەی تێڕوانینن و بە گەشەسەندنێکی بێ کۆت و بەندی ئەقڵ پێی دەگات. کرداری ئازادانەی سەرپشکانە دوای بیرکردنەوە و تێڕامان دێتە بوون، واتە کردارێکە بکەرەکەی هەست بە مەبەستی کارەکەی دەکات، بۆ نموونە: ئەگەر کەسێك بەردێکی شکاند، لەبەرئەوەی پێی لێی هەڵکەوتووە، ئەوە کردارێکی بێ مەبەستە، واتە کارێکی مناڵانە و ئاژەڵانەیە، بەڵام ئەگەر بۆیە شکاندنی نەوەکا کەسێکی تر پێی لێ هەڵبکەوێ، ئەوە کارەکەی مرۆییانەیە، دەکرێ بڵێین کارێکە زادەی ئەقڵ.

بۆ ئەوەی تاك بتوانێ وەکو مرۆڤ بژی، هەروەها بۆ ئەوەی بتوانێ بە گوێرەی ئەقڵ کارەکانی بەڕێوە ببات، پێویستە جاروبار خۆی لە کۆمەڵگە دوورەپەرێز بکات. ئیبن باجە کتێبێکی نوسیوە ناوی لێناوە (ئاراستەکردنی دوورەپەرێزی)، ئەو لەم کتێبەدا داوا لە مرۆڤ دەکات خۆی خۆی پەروەردە بکات، بەڵام مرۆڤ بە گشتی دەتوانێ کەڵك لە باشیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی وەربگرێ، بەبێ ئەوەی خۆی لە قەرەی خراپیەکانی بدات.

دانا و حەکیمەکان دەتوانن لە نێو خۆیاندا گرووپێکی بچوك یا گەورە پێك بهێنن، بگرە هەر کات یەکیان بینی دەبێ وا بکەن. ئەمانە گەر وا بکەن دەبنە دەوڵەتێك لەنێو دەوڵەتێکی تردا و هەوڵدەدەن لەسەر سروشتی غەریزەیی بژین، واتە پێویستیان بە پزیشك و دادوەر نەبێت، ئەمانە وەکو رووەك لەسەر هەوا گەشە دەکەن، بەبێ ئەوەی پێویستیان بە چاودێری باخەوان بێت. هەروەها خۆیان لە چێژە گشتیەکان و مەیلە پیسەکان وەلا دەنێن، ئەمانە بە کارە دوونیاییەکانی کۆمەڵگە نامۆن. کاتێك دەبن بە هاوڕێی یەکتر، سۆز و خۆشەویستی دەبێتە ڕێکخەری سیستەمی ژیانیان، کاتێکیش دەبنە خۆشەویستی خودا کە حەقیقەتە، ئاسودەیی دەروونیان لەوەدا دەدۆزنەوە لەگەڵ ئەقڵی باڵادا یەك بگرێ کە سەرچاوەی مەعریفەکانی مرۆڤە.

## ٣- ئیبن تەفیل

### ١- دەوڵەتی مووەحەدین:

هەوساری حوکم لە خۆرئاوای جیهانی ئیسلامیدا هەر لە دەستی بەربەرییەکاندا بوو، بەڵام هەر زوو دەوڵەتی موەحەدین جێگەی دەوڵەتی موڕابیتین گرتەوە و محمد بن تومەرت هاتەمەیدان کە دامەزرێنەری بنەماڵەیەکی نوێ بوو، ساڵی (١١٢١ز) بانگەشەی ئەوەی کرد کە محەممەدی مەهدیە، لەسەردەمی ئەبو یەعقوب یوسف (١١٦٣-١١٨٤ز) و ئەبی یوسف یەعقوب (١١٨٤-١١٩٨ز) فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی موەحدین گەیشتە لوتکە، بارەگای ئەم دەوڵەتەش لە مەراکیش بوو.

موەحدینەکان تازەکردنەوەیەکی گەورەیان لە کەلامناسیدا کرد، مەزهەبی ئەشعەری و مەزهەبی غەزالییان هێنایە مەغریب، کە پێشتر ئەو دوو مەزهەبە بە گومڕا ناودەبران. ئەوەش ڕێگەخۆشکەرێك بوو بۆ ئەوەی ڕەوتی ئەقلانی بچێتە ناو مەزهەبە کەلامیەکانەوە، ئەم شتە نەیتوانی بەتەواوی پشتگیری لایەنگرانی عەقیدە و بیرمەندە ئازادەکان بەدەست بێنێ، بەڵام توانی هانی زۆر کەس بدات بەرەو فەلسەفەکاری. تا ئەوکات هەر تێڕوانینێکی ئەقلانی لەمەڕ ئایین کارێکی یاساغ بوو، بگرە زۆر سیاسەتمەدار و فەیلەسوف دواتر پێیان وابوو نابێ عەقیدەی گشتی بشلۆقێنرێ و بەرز بکرێتەوە بۆ ئاستی مەعریفەی ئەقلانی، هەوڵیاندەدا کایەی ئایین لە کایەی فەلسەفە بە تەواوی دابڕن. موەحدینەکان گرنگیان بە مەزهەبە کەلامیەکان دەدا، بەڵام ئەبو یەعقوب و میراتگرانی بە گوێرەی هەلومەرجی سیاسی ماوەیەکی کەم لە کۆشکەکانیاندا هەوڵیاندا گرنگی بە زانستە ئەقلانیەکان بدەن تا بوار بۆ گەشەندنی فەلسەفە بڕەخسێ.

### ٢- ژیانی ئیبن تەفیل:

دەبینین ئەبو بەکر محمد بن عبداللە ئیبن تەفیلی ئەلقەیسی پۆستی وەزیر و دکتۆری تایبەتی ئەبو یەعقوبی لە ئەستۆ گرتووە، کە پێشتر لە غەرناتە سکرتێر بووە. ئیبن تەفیل لە قادس لەدایکبووە، قادس شارێکی بچوکە لە ئەندەلوس، ساڵی (١١٨٥ز) لە مەراکیشی پایتەخت کۆچی دوایی‌کردووە. وا دەردەکەوێ ژیانی ئاڵوگۆڕی وای تێدا نەبووە و پتر خەریکی کتێب

بووه. له کتێبخانەی خەلیفەدا زانستی زۆری پەیدا کردووە کە بۆ پیشەکەی کەڵکی لێوەرگرتوون یا هەر بۆ تێرکردنی بە مەیلە مەعریفیەکانی خۆی. له نێو فەیلەسوفانی مەغریبدا وەکو پیاوێك دەردەکەوێ کە سەوداسەری فەلسەفە یا وەکو پیاوێکە گرنگی بە هەندێ شت دەدا بەبێ ئەوەی تیایاندا قوڵ ببێتەوە. پتر مەیلی بەلای ئەوەدا بووە چێژ لە تێڕامان وەربگرێ و کەمتر شتی نوسیووە.

ئیبن تەفیل پێی وابووە دەتوانێ چاکسازی لە مەزهەبی بەتلیمۆس بکات، بەڵام هەرگیز نابێ ئەم بۆچوونە قبوڵ بکەین، زۆر فەیلەسوفی دیکەی عەرەب ئەم بانگەشەیەیان کردووە، بەڵام هیچیان نەیانکردووە.

هەندێ قەسیدەی شیعری ئیبن تەفیلمان بەدەست گەیشتووە، بەڵام هەر وەکو ئیبن سینا خەمی گەورەی ئەوە بووە زانستی یۆنانی و حیکمەتی ئەهلی خۆرهەڵات تێکەڵ بە یەکتر بکات، بۆ ئەوەی خەڵکی بیروباوەڕێکی تازەیان لەمەڕ گەردوون هەبێ. هاندەری ئەم کارەشی بوو هەروەك ئیبن باجە هەر خۆی. ئینجا سەرنجی خستە سەر پەیوەندی نێوان تاك و کۆمەڵ و ئەو بیروباوەڕانەی لەو بارەوە هەن. بەڵام ئەم لە ئیبن باجە واوەتر چوو: ئیبن باجە بیرمەندی دوورەپەرێز دەکرد، یا گرووپێکی بیرمەندانی دوورەپەرێزی دەکردە دەوڵەتێك لەناو دەوڵەتدا، وەکو نموونەی ژیانێکی ئاسودە و کامەران. بەڵام ئیبن تەفیل پتر گرنگی بە تاك دەدا.

## ٣- حەی بن یەقززان[١١٠]:

بیروباوەڕەکانی ئیبن تەفیل لە چیرۆکەکەیدا دەردەکەوێ (حەی بن یەقزان)، شانۆی ئەم چیرۆکە، دوو دوورگەیە: لە یەکێکیاندا کۆمەڵگەیەکی مرۆیی داناوە، داب و نەریتیشی تێدا

(١١٠) ئەم چیرۆکە باڵاترین چیرۆکە کە فەلسەفەی عەرەبی شانازی پێوە بکات، بیرۆکەی سەرەکی ئەم چیرۆکە وەکو (P.Bronnle) لە پێشەکی پوختەی ئەو چیرۆکەدا دەڵێ، ئەوەیە: چۆن مرۆڤ بەبێ هاوکاری کەسانی تر دەتوانێ بگات بە ناسینی جیهانی باڵا و ناسینی خودا و نەمری دەروون. ئەو چیرۆکە پەرەسەندنی ئەقڵی داهێنەر لە حاڵەتی تاریکیەوە بەرەو لوتکەی تێڕوانینی فەلسەفی دەردەخات. ئیبن تەفیل لە چیرۆکی حەی بن یەقززاندا بۆ دەربڕینی بۆچوونە فەلسەفییەکانی خۆی، زمانێکی سادە و ئاسانی بەکارهێناوە. ئەم کتێبە ١٦٧١ بە ناونیشانی (philosophus autodidactus) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی لاتینی و ساڵی ١٩٠٤ بەناونیشانی (The Awaking of the Soul) دووجار وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی. (و.ع).

دروستکردووە. لە دوورگەی دووەمیشدا یەك کەسی داناوە کە لەسەر خۆرسك گەشە و نەش و نما دەکات. لە کۆمەڵگەی یەکەمیاندا مەیلە دونیاییەکان باوە، خەڵکەکەش باوەڕێکی رواڵەتیانەیان هەیە، لەم کۆمەڵگەیەدا دوو گەنج دەردەکەون، بەناوی سەلمان و ئاسال (یا ئەبسال)، ئەم دووانە دەگەن بە پلەی مەعریفەی ئەقڵی و بەسەر ئارەزوەکانیاندا زاڵ دەبن. بەڵام یەکەمیان ئەقڵێکی پراکتیکی هەیە و هاوشێوەی ئایینی عەوامی خەڵك، تا دەگاتە ئەو ئاستەی بەسەر خەڵکیدا دەبێتە فەرمانڕەوا. بەڵام دووەمیان سروشتێکی ئەقڵانی تیۆری هەیە و مەیلی بەلای سۆفیگەریدایە، بۆیە ئەوێ بەجێ دێڵێ و دەچێتە دوورگەکەی بەرامبەر، پێی وایە ئەو دوورگەیە ئاوەدان نییە و خۆی تەرخان دەکات بۆ زوهد و خوێندن.

بەڵام حەی بن یەقززان کە ئێمە وا باسی دەکەین، لەو دوورگەیە گەورە بووە، تا دەبێت بە فەیلەسوفێکی کامڵ، ئەو هەر بە منالی فڕێدراوەتە ئەو دوورگەیە یا هەر خۆی لەوێ دروستبووە و بەرهەمی سروشتە. لەوێدا ئاسکێك بەخێوی دەکات و شیری پێدەدات، پاشان حەی گەورە دەبێ و دەتوانێ پێداویستیە ماددیەکانی خۆی بەدەست بێنێ، هەروەك رۆبسۆن کرۆزۆ. بەڵام حەی پشت بە کەرەستە تایبەتییەکانی خۆی دەبەستێ. پاشان بەهۆی تێبینی و سەرنجەوە دەتوانێ سروشت و ئاسمان و خودا و خۆی بناسێ. لە تەمەنی چل و نۆ ساڵیدا دەگاتە خودا، واتە وەکو ئەوەی سۆفی دەگاتە ئاستی بینینی خودا و تێدا فەنابوونی. لەوکاتیدا ئاسال دەبینێ. لەسەرەتادا حەی زمان نازانێ، بەڵام دوای هەوڵێکی زۆر دەتوانن لێکتر تێ بگەن، دەردەکەوێ فەلسەفەکەی حەی و شەریعەتەکەی ئاسال یەك وێنەی حەقیقەن، بەڵام ئەوەی یەکەمیان روونترە.

کاتێك حەی دەزانێ دوورگەکەی بەرامبەری میللەتێکی لەسەرە و هەر لە تاریکی و هەڵەدا دەخولێنەوە، بڕیاردەدات خۆی بچێ بۆ ئەو دوورگەیە و حەقیقەتیان بزانێ. لەوێ بە ئەزموون بۆی دەردەکەوێ خەڵکی عەوام توانای پەیبردن بە حەقیقەتی پوختیان نییە، پەیامبەری ئیسلامیش ئەگەر حەقیقەتی بە نموونەی هەستەکی بۆ روونکردنەوە گیرۆدە دەبوو و نەیشیدەتوانی نوری کامڵیان بۆ دەربخات. دوایی بەو ئاکامە دەگات لەگەڵ ئاسالی هاوڕێی بگەڕێنەوە دوورگە خاڵیەکەیان، تاکو مردن کۆتاییان پێ دێنێ، بە شێوەیەکی رووحی خەریکی خودا پەرستی دەبن.

## ٤- حەی و پەرەسەندنی مرۆیی:

ئیبن تەفیل بەشێکی گەورەی چیرۆکەکەی تایبەت کردووە بە خستنەرووی ئەو قوناغانەی کە حەی پێیاندا تێپەڕ دەبێ تا دەگات بە پلەی کەماڵ، گەرچی گومانی تێدا نییە ئیبن تەفیل پێی وانییە تاك بە تەنها بتوانی بەو کەماڵەی حەی بگات، کە چۆن سروشت حەی پێگەیاندووە و هاوکاری لە کۆمەڵەوە وەر نەگرتووە. دەکرێ چیرۆکی حەی بن یەقزان بکرێتە نموونەی مێژووی پەرەسەندنی مرۆڤ وەکو ئەوەی بیرمەندانی ئازادیخوازی سەدەی رابردوو باسیان کردووە.

چیرۆکەکەی حەی بە گشتی مەبەستی لە بارودۆخی مرۆییە، کاتێك وەحی ئاسمانی بۆ دا نابەزێ. هەر لەو چیرۆکەدا پەرەسەندنی حیکمەتی هیندی و فارسی و یۆنانی بەرچاو دەکەوێ، هەڵبەت زۆر خاڵ هەن ئەو قسەیەی سەرەوە پشت راست دەکەنەوە با لێرەدا نەشتوانین واوەتر لەوە بچین، بەڵام هەر خاڵی نییە لە مانای ئەو قسەیەی ئیبن تەفیل کە حەی لە دوورگەی سەیلان پێگەیشتووە. — ئەو دورگەیە کە باسی دەکەین کەش و هەواکەی لە بارە بۆ خەلقبوونی منالی سروشتی، ئەفسانەکان دەڵێن ئادەم کە یەکەم مرۆڤە لەو دوورگەیە خولقاوە، هەر لەوێش پاشایەکی هیندی دەبێ بە پیاوێکی حەکیم.

دوای ئەوەی حەی هەوڵدەدات لە قۆناغی یەکەمی ئاژەڵی دەربچێ، پاڵنەری ئەم هەوڵەی، ئابڕوو و حەزی سۆراخکردنی حەقیقەتی شتەکان دەبێت، بۆ یەکەمجار هەستێکی ئایینی لە دەروونیدا سەرهەڵدەدا، کە بنەمای ئەو هەستەش سەرسامیە، ئەوەش بەهۆی دۆزینەوەی ئاگر، ئەم قسەیە ئایینی فارسەکانمان بیر دەخاتەوە. بەلام لە قۆناغی تێڕوانینی ئەقڵیدا پشت بە فەلسەفەی یۆنانی بەستراوە، وەکو ئەوەی عەرەبەکان گواستویانەتەوە.

لێکچوونی نێوان وێنەی حەی لەلای ئیبن سینا و لەلای ئیبن تەفیل زۆر بە ئاشکرا دیارە، ئیبن تەفیل خۆی باسی ئەمەی کردووە. گەرچی حەی ـەکەی ئیبن تەفیل پتر لەوەی ئیبن سینا لە مرۆڤی ئاسایی نزیکترە. هەروەها حەی ـەکەی ئیبن سینا نموونەی ئەقڵی کارایە، بەڵام چیرۆکەکەی ئیبن تەفیل نموونەی ئەقڵی مرۆیی سروشتییە کە لە جیهانی سەرەوە رووناکی بەسەردا هەڵدێ، ئەو ئەقڵەی کە بە گوێرەی لۆژیکی ئیبن تەفیل لەگەڵ دەروونی پەیامبەردا تەبایە، هەڵبەت گەر حەقیقەتی دەروونی پەیامبەر بناسین، بەڵام دەبێ تەئویلێکی مەجازیانە بۆ قسەکانی پەیامبەر بۆ بکەین.

بەم قسەیەش ئیبن تەفیل بەهەمان ئەو ئاکامانە دەگات کەبیرمەندانی خۆرهەڵاتی پێش خۆی پێی گەیشتوون، ئیبن تەفیل بەو ئاکامە دەگات کە پێویستە ئایین بەسەر عەوامی

خەڵکدا پوخت بکرێتەوە، چونکە ناتوانن واوەتر لەوە بڕۆن. هەروەها ناتوانن پەی بە دیاردەکانی ئەودیو ئایین بەرن، مەگەر ژمارەیەکی کەمیان نەبێ، هەروەها ناتوانن دوور لە کۆت و بەند خودا یا حەقیقەتی باڵا ببینن، ئیبن تەفیل زۆر شێلگیرانە جەخت لەسەر ئەو شتە دەکات. ئێمەش کە لە حەی-دا قۆناغەکانی پەرەسەندنی مرۆڤ دەبینین و ناتوانین نکۆڵی لێ بکەین، هەروەها کەماڵی ڕەهای مرۆڤیش لە پێویستبوونی بە هەموو شتە بەرهەستەکان و نقومبوون لە ئەقڵی گشتی و خەڵوەت و کپیەکی ئارامدایە.

ئاشکرایە گەیشتن بەم پلەیەی دوای بەنێو ساڵداچوون بەدەست دێ، هەروەها دوای ئەوەی لە رگەزی خۆیشی هاوڕێیەك دەدۆزێتەوە. سەرقاڵبوون بە کاروبارە ماددی و پیشەسازی و زانستەکان هەنگاوێکی سروشتی سەرەتاییە لە پێناو کەماڵی روحیدا. ئەوە بۆیە ئیبن تەفیل بەچاوی پەشیمانی و شەرمەوە لەو ژیانەی خۆی ناڕوانێ کە لە کۆشکی پاشاکاندا بەسەری بردووە.

## ٥- ئەخلاقی حەی:

زۆرجار لە حەوت قۆناغە پەرەسەندنەکەی ژیانی حەی-دا رێکەوتی بیروباوەڕی فەلسەفی دەکەین و ئیبن تەفیلیش گرنگیەکی زۆری بە ژیاننامەی پراکتیکی حەی داوە. لێرەدا بیرکاری سۆفیانە کە هێشتا لە خۆرهەڵاتدا شوێنکەوتەی هەیە و ئەفلاتون و مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان باسیان کردووە، جێگەی ئەو پەرستشانە دەگرێتەوە کە شەریعەتی ئیسلام سەپاندوویەتی.

حەی لە قۆناغی حەوتەمی پەرەسەندنی خۆیدا لە ژێر کاریگەری مەزهەبی فیساگۆرسدا میتۆدێکی ئەخلاقی بۆ خۆی دادەڕێژێ.

حەی بۆی دەردەکەوێ ئەو ئامانجەی کە دەبێ لە کارەکانیدا پێی بگات، ئەوەیە لە هەموو شتێك دانەیەك وەربگرێ و بگات بە بوونێکی رەهای سەربەخۆ.

هەوڵی دەدا لە رێگەی شتەکانی سروشتەوە بوونی باڵا ببینێ، حەی دووربوو لەوانەی دەیانگوت هەموو شتەکانی سەرزەوی لە پێناو مرۆڤدا دروستبوون، بەڵکو ئەو پێی وابوو ئاژەڵ و رووەك بۆ خۆیان و بۆ خودا دەژین، نابێ مرۆڤ بە هەوا و هەوەسی خۆی مامەڵەیان لەگەڵ بکات. ئەو پێداویستیە گرنگەکانی لە پێداویستیە جەستەییەکاندا کورت دەکردەوە. گرنگیەکی زۆریشی بە میوەی پێگەییو دەدا، پێی وابوو چاندنی تۆی ئەو رووەکە لە زەویدا تا

بە هۆی ئارەزووەوە رەگەزەکەی لەنێو نەچێ، پەرەستش و تەقوایە. حەی هەرگیز گۆشتی ئاژەڵی نەدەخوارد مەگەر ناچار بووبا و هەوڵیشیدەدا پارێزگای لە جۆر و رگەزی ئاژەڵان بکات، دروشمی حەی ئەمەبوو: ئەوەی بۆ ژیانە بەسە، بۆ خەوتن زۆرە.

ئا ئەوە ئەو سیستەمە بوو کە حەی بۆ پێداویستیە ماددییەکانی ژیانی، پێیانەوە پابەند بوو، بەڵام روحی پەیوەست بوو بە جیهانی باڵا و لە جیهانی باڵا دەچوو. هەروەها هەوڵیدەدا کەڵك لە شتەکانی دەوروبەری وەربگرێ و ژیانێکی دوور لە خڵت و خاشەکانی ماددە بژی. حەی لە پێناو بە جوانی هێشتنەوەی دووڕگەکەی گرنگی بە رووەکان دەدا و ئاژەڵانی دە پاراست. هەروەها زۆر گرنگی بە پاك و خاوێنی جەستە و جلەکانی دەدا. هەوڵیشیدەدا هەڵسوکەوتەکانی رێك و پێك بن و کەچڕەوی تێدا نەبێ، هەروەك جوڵەی تەنە ئاسمانییەکان.

بەو شێوەیە حەی وردە وردە توانی خۆی لەسەر زەوی و ئاسمان بەرز بکاتەوە، تا بووە ئەقڵیی بێگەرد. ئا ئەمە ئەو حاڵەتە فەنابوونەیە کە ئەقڵی ئێمە ناتوانێ پەی پێ ببا و رستە و خەیاڵەکانیشمان لە وەسفکردنی دەستەوەستانن.

## ٤- ئیبن روشد:

### ١- ژیانی:

ئەبو وەلید محمد بن ئەحمەد بن محمد بن روشد ساڵی (١١٢٦ز) لە شاری قورتوبە لە بنەماڵەیەکی شارەزای فیقهـ لەدایکبووە، لەو ماڵەشدا توانیویەتی خۆی فێری هەموو زانستی سەردەمەکەی بکات.

دەڵێن ئیبن تەفیل، ئیبن روشد بە ئەمیر ئەبو یەعقوبی ناساند، دوای ئەوەی ئەمیر پرسیاری ناوی خۆی و باوکی و نازناوی دەکات، جا لێی دەپرسێ: بۆچوونی فەیلەسوفان لە بارەی ئاسمانەوە چییە؟، ئایا دەڵێن ئەزەلی و کۆنە یا هاتووەتە بوون؟، ئیبن رووشد دەترسێ و دەڵێ گرنگی بە فەلسەفە نادەم، پاشان ئەمیر لەو بارەوە لەگەڵ ئیبن تەفیل دەکەوێتە گفتوگۆ، لەکاتی گفتوگۆدا ئیبن روشد سەری سوردەمێنێ لە شارەزایی ئەمیر لە بیروباوەڕەکانی ئەرەستۆ و ئەفلاتون و فەیلەسوفان و کەلامناسانی ئیسلام، ئینجا ترسەکەی دەڕەوێتەوە و بە ئازادی دەکەوێتە قسەکردن و پلە و پایەیەکی گەورە لای ئەمیر بۆ خۆی مسۆگەر دەکات. چارەنووسی ئیبن روشد لەوێوە دیاری دەکرێ و ئەمیری رایدەسپێرێ مەزهەبی ئەرەستۆ شەرح بکات،

ئەویش بە شێوەیەك راڤەی دەكات پێشتر هیچ كەسێكی تر وای راڤە نەكردووە، بەو كارەشی زانستی ئەرەستۆ بێ خڵت و خاش بۆ مرۆڤایەتی مایەوە.

لە پاڵ ئەوەشدا ئیبن روشد یاساناس و پزیشك بوو، ساڵی (١١٦٩ز) لە ئەشبیلیە دەبێتە قازی، دواتر لە قورتوبە دەبێتە قازی، كاتێكیش ساڵی (١١٨٢ز) ئەبو یەعقوب بوو بە خەلیفە، ئیبن روشدی كرد بە پزیشكی خۆی — دوای ئەوە جارێكی دیكە لە شوێنی لە دایكبوونی لە شوێنی باوك و باپیرەی بووەوە بە قازی، گەرچی رۆژگار پشتی تێكرد و ئیبن روشد قینی لە فەیلەسوفان هەڵگرت و كتێبەكانیانی سوتاند، ئینجا ئەبو یوسف یەعقوب فەرمانی دوورخستنەوەی ئیبن روشدی دەركرد بۆ ئەلیسایە، لە (١٠ دیسەمبەری ١١٩٨ز) لە مەراكیشی پایتەخت كۆچی دواییكرد.

## ٢- ئیبن روشد و ئەرەستۆ:

ئیبن روشد هەوڵی خۆی لە ئەرەستۆدا كورت كردبۆوە، هەموو بەرهەمەكانی ئەو فەیلەسوفە و راڤەی كتێبەكانی خستە بەرباس و بەراوردێكی وردی بۆ كردن. ئەو كتێبە یۆنانیانەی ئیبن روشد وەریگێڕاون هەندێكیان لە دەستچوون و هیچیان لەبارەوە نازانین و ئەوەی بەدەستیشمان گەیشتوون بە كەموكورتیەوەیە.

ئیبن روشد لە ئەركەكەیدا لەسەر شێوازی رەخنە و میتۆدێكی سیستەماتیزەكراو دەرۆیشت، جاروبارێ بە كورتی و جاروباریش بە دوورودرێژی مەزهەبەكەی ئەرەستۆی شەرح كردووە، شەرحی پوخت و سادەی خستووینەتە بەردەست. شایانی ئەوەیە نازناوی (راڤەكار)ی پێ بدرێ، دانتی لە كتێبی (كۆمیدیای ئیلاهی) ئەو نازناوەی پێبەخشیوە. فەیلەسوفانی موسڵمان لە رێگەی ئیبن روشدەوە توانیویانە لە فەلسەفەی ئەرەستۆ تێ بگەن، ئیبن روشد پێی وابووە ئەرەستۆ مرۆڤێكی كامڵ و بیرمەندێكی مەزنە كە گەیشتووە بە حەقیقەتێكی رەها، تەنانەت با شتی تازەش لە گەردوون و سروشت بدۆزرێتەوە، بەڵام هیچ شتێك لەو حوكمە لەمەڕ ئەرەستۆ ناگۆڕێ. دەشێ خەڵكی هەڵە لە ئەرەستۆ تێ بگەن، زۆرجار ئیبن روشد لە كتێبەكانی فارابی و ئیبن سیناوە شتی لەبارەی ئەرەستۆوە وەرگرتووە، بەڵام پێچەوانەی ئەوان تێی گەیشتووە، هەڵبەت راستتر لەوان. ئیبن روشد پێی وابووە ئەگەر بەراستی لە مەزهەبی ئەرەستۆ تێ بگەین، ئەوە ناكۆك نابین لەگەڵ باڵاترین مەعریفە كە مرۆڤ بتوانێ پێی بگات. بگرە پێی وابووە مرۆڤایەتی لە رێڕەوی پەرەسەندنی ئەزەلی خۆیدا تەنها لە ئەرەستۆدا

گەیشتووەتە پلەیەکی باڵا کە ئەستەمە کەسی تر پێی بگات. ئەوانەی دوای ئەویش هاتوون و بۆ هەڵێنجانی هەر بیر و بۆچوونێك، کاری فیکری زۆریان کردووە و زەحمەتی زۆریان کێشاوە، لە کاتێکدا مامۆستای یەکەم زۆر بە ئاسانی دەری خستوون. وردە وردە هەموو گومان و نارەزاییەکانی سەر مەزهەبی ئەرەستۆ رەوینەوە، چونکە ئەرەستۆ مرۆڤێکە لە سەرووی قۆناغی مرۆڤبوونەوە. وەکو ئەوەی چاودێری خودایی گەرەکی بووبێ، بەهۆ ئەوەوە مەودای توانایی مرۆڤ لە نزیکبوونەوە لە ئەقڵی گشتی دەربخات. ئیبن روشد ئەرەستۆی بە باڵاترین مرۆڤ لەقەڵەم دەدا کە تیایدا ئەقڵی مرۆیی دەردەکەوێ. تەنانەت ئیبن روشد حەزیکردووە ناوی لێ بنێ فەیلەسوفی ئیلاهی.

ئا لێرەدا سەرسامبوون بە ئەرەستۆ تەنانەت لای ئیبن روشدیش تەنها لەوەدا ناوەستێ بە تەواوی پەی بە بیروباوەڕەکانیدا ببەین، ئیبن روشد هیچ هەلێکی لە دەست نەداوە بۆ هێرشکردنە سەر ئیبن سینا، لە هەموو بۆنەیەك وەڵامی فارابی و ئیبن باجەی دەدایەوە، گەرچی کەڵکی زۆری لێوەرگرتوون، رەخنەکانی ئەو لە پێشینانی خۆی توندترە لە رەخنەی ئەرەستۆ لە ئەفلاتون.

بەڵام ئیبن روشد هەرگیز بیروبۆچوونی راڤەکارانی نوێ ئەفلاتونیەکانی تێ نەپەڕاندووە، هەرگیزیش لە هەڵەی وەرگێڕانی عەرەب و سریانی قوتاری نەبوو. هەندێجار شوێن پێی بیروباوەڕە رواڵەتیەکانی تامستیۆسی هەڵگرتووە بێ ئەوەی بەدوای بیروباوەڕە راستەکانی ئەسکەندەری فیردەوسیدا بڕوات، یا هەوڵیداوە پێکەوە تەبایان بکات.

### ٣- لۆژیك و حەقیقەتناسی:

دیارترین شت کەلەلای ئیبن روشد سەرنج دەدرێ ئەوەیە لایەنگرێکی سەرسەختی لۆژیکی ئەرەستۆ بوو. ئیبن روشد پێی وابووە کەس بێ لۆژیکەکەی ئەرەستۆ کامەران و ئاسودە نابێت، بەداخیش بووە لەوەی سوکرات و ئەفلاتون بێ ئاگا بوونە لەو لۆژیکە. کامەرانی مرۆڤ لەرادەی ناسینی ئەو لۆژیکەدایە. هەروەها پێێ وابوو ئیساگۆژی فرفریۆس زیادەیە، بەڵام هەردوو کتێبی وتار و کتێبی شیعری بە بەشێك لە لۆژیکی ئەرەستۆ لە قەڵەم داوە. ئا لێرەدا هەڵەی بەرچاو دەبینین، سەیرترینیان، بۆ نموونە: ئیبن روشد (تراژیدیا) بەستایش و (کۆمیدیا) بە لاقرتێکردن دەزانێ. هەروەها پێیوابوو دەبێ شیعر ئاماژە بێت بەو حەقیقەتانەی دەکرێ بسەلمێنرێن یائاماژەبێت بە شتە فریودەرەکان. ئیبن روشد هیچ شارەزاییەکی لە جیهانی یۆنان

نەبووە. چونکە بۆی نەلواوە ئەو جیهانە بناسێ، بۆیە چاوپۆشی لێدەکەین، بەڵام نابێ پەلە بکەین لە چاوپۆشیکردن لە پیاوێك کە زۆر توندبووە لە رەخنەکردنی خەڵکی.

ئیبن روشد لەسەر رێچکەی پێشینانی رۆیشتووە، لە زماندا گرنگی بەو شتانە داوە لە نێوان هەموو زمانەکاندا هەیە، هەروەها پێی وابووە ئەرەستۆ لە کتێبی رستەسازی و بگرە لە کتێبی وتاریشدا چاوی لەسەر توخمە هاوبەشەکانی نێوان زمانەکان بووە. بەو شێوەیە دەبێ رێڕەوی فەیلەسوفی عەرەبی لە شەرحکردنی رێسا گشتیەکاندا پشت بە پەند و ئەدەبی عەرەبی ببەستێ، گەرچی مەسەلەکە مەسەلەی یاسا گشتیەکانە، چونکە زانست مەعریفەیەکی گشتییە.

لۆژیك رێگە بۆ زانیارییەکانمان خۆش دەکات، بۆ ئەوەی لە بەشەکانی بەرهەستەوە بەرز ببینەوە بۆ حەقیقەتی ئەقڵانی پوخت. بەڵام عەوامی خەڵك هەر پابەندن بە هەست و لە تاریکیدا دەمێننەوە، کەموکورتی خۆرسك و کەمی ئەقڵییان لەسەرووی ئەو عادەتە خراپانەوەن کە خوویان پێوەگرتووە، هەموو ئەوانە رێگرن لە گەیشتنیان بە کەماڵ. گەرچی ئەمە مانای ئەوە نییە هیچ کەسێك نییە بتوانێ بگات بە ناسینی حەقیقەت. هەڵۆ دەتوانێ چاو ببڕێتە خۆر، با کەسیش نەبێ بتوانێ چاوی تێ ببڕێ، ئەوە سروشت شتێکی هەر دەخولقاند بتوانێ دەستەویەخەی ببێ. هەر شتێك کە هەڵدێ دەبی ببینرێ، هەر شتێکیش کە هەبوو دەبێ بناسرێ، جا ئەگەر یەك کەسیش بیناسێ.

حەقیقەت هەیە، گەر نەتوانین لێی نزیك ببینەوە یا تێی بگەین، ئەوە شتێك لە دڵماندا دروست دەبێ و پەرۆشی دەبین. ئیبن روشد پێی وایە لە زۆر شتدا حەقیقەتی ناسیوە، ئەو وەکو لیسینگ[١١١] تەنها بە توێژینەوە دەستبەرداری شتەکان نەبووە.

---

(**١١١**) لیسینگ دەڵێ: (فەزڵی مرۆڤ لەوەدا نییە خاوەنی حەقیقەت بێ، بەڵکو فەزڵی مرۆڤ لەو هەوڵەدایە کە بۆ بەدەستهێنانی حەقیقەت دەیدا، توانستەکانی مرۆڤ بە هەبوونی حەقیقەت نەش و نما ناکەن، بەڵکو بە سۆراخکردنی حەقیقەت گەشە دەکەن، کەماڵی پتری مرۆڤیش هەر لەو هەوڵ و سۆراخکارییەدایە. بەپێچەوانەوە هەبوونی شتێك مرۆڤ بەلای سستی و تەمبەڵی و غروردا دەبات. ئەگەر خودا هەموو حەقیقەتی لەلای راستی خۆ دانابا و پەرۆشی ئێمەیشی بۆ حەقیقەت لەلای سەروی خۆی دانابا، با بەردەوام بە هەڵەشدا شووبایەن، بەڵام هەر دەستم بۆ ئەوەی لای سەروویەوە دەبرد، و دەمگوت: "خودایە، بەزەییت، راستی بێگەرد تەنها بۆ تۆیە) کۆبەرهەمەکانی لیسینگ **ج٢ ص ٢٧١. طبعة ليتزج ١٨٥٩. (و.ع).**

ئیبن روشد پێی وابوو حەقیقەت لە مەزهەبەکەی ئەرەستۆدایە، بۆیە بە چاوێکی نزم سەرنجی زانستی کەلامناسی ئیسلامی دەدا، بەڵێ دانی بەوەدا دادەنا کە ئایین جۆرێکی تایبەتی حەقیقەتە، بەڵام رقی لە کەلامناسی بوو، چونکە ئەو زانستە دەیەوێ شتگەلێك بسەلمێنێ کە ناتوانێ بە میتۆدەکانی خۆی بیانسەلمێنێ.

ئیبن روشد و زۆری تر بەو ئاکامە گەیشتوون کە دواتر سپینۆزا پێی گەیشت، واتە وەحی کە لە قورئاندا هاتووە، مەبەستی ئەوە نەبووە زانست بە خەڵکی بدات، بەڵکو مەبەستی چاکسازی خەڵکی بووە، مەبەستی شەریعەتکاریش پێدانی زانست نییە، بەڵکو مەبەستی گوێڕایەڵی خەڵکی و چاکەکارییە، چونکە شەریعەتکار دەزانێ کامەرانی مرۆیی تەنها لە کۆمەڵگەدا بەدی دێ.

## ٤- جیهان و خودا:

دیارترین شت کە ئیبن روشد لەوانی پێش خۆی و بەتایبەتیش ئیبن سینا جیادەکاتەوە، بریتیە لە چۆنیەتی وێناکردنی جیهان، کە جیهان پرۆسەیەکی ئەزەلیە و هاتووەتە بوون. جیهان بە گشتی یەکێتیەکی زەرووری ئەزەلیە و لە نێو ناچێ و ناکرێ شێوەیەکی جیاوازی لەوەی ئێستاشی هەبێ.

ناکرێ مادە و فۆرم لێکتر دابڕێندرێن، مەگەر لە زەیندا نەبێ، فۆرم یا شێوە وەکو تارمایی ناچێتە سەر مادەیەکی تاریك و لێڵ، بەڵکو لەناو مادەیەکی جەوهەرداردا هەیە، شێوە یا فۆرمی ماددی وەکو هێزێکی سروشتی هەرگیز لەناو ناچێ و بەردەوام بەرهەم دێتەوە، گەرچی هەرگیز لە مادە دوور ناکەوێتەوە، بۆیە دەکرێ بە شتێکی ئیلاهی ناو ببرێ، هیچ بوونێك لە هیچەوە دروست نابێ، دوای بوونیشی نەبون بوونی نییە، چونکە هەموو ئەو شتانەی روودەدەن بریتیە لە گواستنەوە لە هێزەوە بۆ کردار و گەڕانەوە لە کردارەوە بۆ هێز، لەو شتەش تەنها شتێکی هاوشێوەی خۆی دروست دەبێ.

بەڵام بوونەوەران پلە پلەن، هەندێکیان لەسەرووی هەندێکیانەوەن، وێنەی ماددی یا جەوهەری لە پلەی ناوەندی نێوان رواڵەتی رووت و وێنەی پوختدایە. وێنە جەوهەریەکانیش هەر پلەو پایەیان جیاوازە، دەکەونە نێوان هێز و کردار، ئینجا وێنە لە کۆی خۆیدا لە پلەی خوارەوەی واتە وێنە ماددییەکان، تا پلەکانی سەرەوەی واتە زاتی ئیلاهی کە وێنەی سەرەکی جیهانن، یەك زنجیرەی نەپساوە پێك دەهێنن.

ئەگەر گۆڕان لەناو سیستەمی گەردوونیدا ئەزەلی بێت، ئەوە پابەندی جوڵەیەکی ئەزەلیە، ئەوەش پێویستی بە بزوێنەرێکی ئەزەلی هەیە. ئەگەر جیهان لە پرۆسەی بووندا (Becomong) بێت، ئەوە ناچارین بڕوا بە بوونی جیهانێکی تر بکەین کە لەوەوە دروست دەبێ، بەڵام گەر وتمان جیهان مومکینە (Possible) ئەوە ناچارین بڵێین بوونێکی تر هەیە لەوە دروست دەبێ، ئیتر بەو شێوەیە. بۆیە ئیبن روشد وای بۆ چووە جیهان گشتێکی لە ئەزەلەوە بزواوە و زەرووره و تەنها جیهان دەتوانێ ئەگەری گەیشتن بە بوونێکی جیاواز لە جیهان کە لە ئەزەلەوە جیهان دەبزوێنێ برەخسێنێ. ئەو بوونە بە هێنانەبوونی جوڵەیەکی بەردەوام و سیستەمێکی رەنگینی جیهان، داهێنەرێکە دەکرێ بە داهێنەری جیهان ناو ببرێ، کاریگەریشی لەسەر جیهان بەهۆی ئەقڵە بزوێنەرەکانی هەسارەکان روودەدات، هەموو جۆرە جوڵەیەك لەم جیهانە، هەر دەبێ سەرەتایەکی تایبەت بەخۆی هەبێ.

ئیبن روشد پێی وایە ماهیەتی بزوێنەری یەکەم واتە خودا، وماهیەتی ئەقڵی هەسارەکان واتە فکر، یەکێتی ئەقڵی بوونی تیایدا دەردەکەوێ، وەسفێکی چاك کە بکرێ زاتی ئیلاهی پێ وەسف بکرێ ئەوەیە هەم ئەقڵە و هەم ئەقلانی پێکەوە. بوون تیایدا هەر یەکێتیە، بوون و یەکێتیش ناخرێنە سەر جەوهەر، بەڵکو تەنها لە زەیندا هەن، هەروەك سەرجەم شتەکانی دیکە.

فکر لە بەشەکانەوە گشت دروست دەکات، گشتیش تەنها لە زەیندا هەیە، گەرچی لە بەشەکاندا سروشتێکی کارای هەیە، بە مانایەکی دیکە گشت وەکو هێز لە شتەکاندا هەیە، بەڵام بە کردەیی تەنها لە زەیندا هەیە، واتە لە زەیندا بوونێکی تەواوی هەیە، بەمانایەکی پوختر، لە زەیندا بوونێکی باشتری هەیە وەك ئەوەی لە بەشەکاندا هەیەتی.

ئەگەر یەکێ پرسی: ئایا زانستی ئیلاهی ئاگایە بە بەشەکان، یا تەنها بە گشتەکان، ئیبن روشد وەڵام دەداتەوە، کە نە ئەویان دەناسێ نە ئەمیان. چونکە زاتی ئیلاهی لە هەردووکیان بێ بەریە، زانینی ئیلاهی جیهانی دروست کردووە و پێشی بەڵەدە، خودا سەرەتایە. هەروەها وێنەی سەرەتای یەکەم و مەبەستی هەموو شتێکە، زاتی ئیلاهی سیستەمی جیهانە، خاڵی پێکگەیشتنی هەموو دژەکانە، خودا گشتێکە لە باڵاترین وێنەی بوونی خۆی. بە گوێرەی ئەو بۆچوونەش نابێ بە مانا باوەکەی باسی چاودێری خودایی بکەین.

## ٥- جەستە و ئەقڵ:

ئێمە دوو بوونەوەر دەناسین: یەکێکیان بزواوە، کە شتێکی تر دەیبزوێنێ، دووەمیان بزوێنەرە، ئەمیان لە زاتی خۆیدا بزواو نییە، بە مانایەکی تر لە نێو بووندا شتی ماددی و شتی ئەقڵی تێدایە.

بونەوەرە ئەقڵیەکان یەکێتی و کەماڵی بوونیان تێدا دەردەکەوێ، ئەو بونەوەرانە پلەبەندین، یەکێتی بونەوەرە ئەقڵیەکان سادە و پوخت نین، هەرچەندە ئەقڵی هەسارەکان لە پرەنسیپی یەکەم دووربکەونەوە سادەییان کەمتر دەبێتەوە، هەموو ئەقڵەکان خۆیان دەناسن، بەڵام خۆناسینیان پەیوەستە بە هۆکردی یەکەم.

لەوەدا دەردەکەوێ هاوسەنگیەك لەنێوان شتە ماددییەکان و شتە ئەقلانیەکاندا هەیە، لە ئەقڵە نزمەکاندا جەستە لە ماددە و فۆرم پێکدێ، بێگومان ئەو شتانەی تێکەڵ بە ئەقڵە پوختەکان دەبێ ماددەیەکە شیاوی کاردانەوە نییە، بەڵکو لە شێوەی ماددەیەکدایە و هێزی وەرگرتنی شتی دیکەی هەیە، بەبێ ئەوە ناکرێ شتە ئەقلانیە زۆرەکان و یەکێتی ئەو ئەقڵەی پەی پێ دەبات تەبا بکەین.

ماددە کاردانەوەی هەیە، بەڵام ئەقڵ شت وەردەگرێ، ئیبن روشد بۆ دەرخستنی ئەو هاوسەنگیانە بەجیاوازیەکانیشەوە، ئەقڵی مرۆیی لەبەرچاوگرتووە.

## ٦- ئەقڵ و ئەقڵەکان:

ئیبن روشد مکوڕە لەسەر ئەوەی دەروونی مرۆیی پەیوەستە بە جەستەکەیەوە، هەروەك چۆن فۆرم پەیوەستی ماددەکەیەتی، بە تەواوی نکۆڵی لەو بۆچوونەش دەکرد کە دەیگوت دەروونی تاکەکەسەکان لەناو ناچن، لەوەشدا بەرەنگاری مەزهەبی ئیبن سینا دەبۆوە. لای ئەو دەروون نامێنێتەوە، مەگەر بەو پێیەی تەواوکەری جەستەکەیەتی.

بەڵام لە دەروونناسی هەستی-دا ئیبن روشد سوربوو لەسەر پابەندبوونی بە مەزهەبی ئەرەستۆوە، پێچەوانەی مەزهەبی گالینۆس و ئەوانی دیکە. بەڵام لە تیۆرەی ئەقڵدا لەگەڵ مامۆستاکەیدا ناکۆکە، بێ ئەوەی هەستی پێ بکات. بیروبۆچوونی ئیبن روشد لەبارەی ئەقڵی ماددیەوە پشت بە مەزهەبی نوێ ئەفلاتونیەکان دەبەستێ، ئەوەش بۆچوونێکی تایبەت بەخۆیەتی. ئیبن روشد دەڵێ ئەو ئەقڵە تەنها ئامادەباشیەك یا هێزێك نییە لە دەروونی مرۆییدا، هەروەها هاوشانی خەیاڵی نەسەقامگیری نێوان هەست و ئەقڵ نییە، بەڵکو شتێکە

لە سەرووی پلەی دەروون و پلەی کەسایەتیەوە، ئەقڵی ماددی ئەزەلیە و لەناو ناچێ، هەروەك ئەقڵە پوختەکان و ئەقڵی کارا، لێرەدا دەبینین ئیبن روشد ئەو پرەنسیپەی کە دەڵێ ماددە لە جیهانی جەستەکان سەربەخۆیە دەگوازێتەوە بۆ کایەی شتە ئەقڵانیەکان و بەسەریدا جێبەجێی دەکات، لەم کارەشدا بێگومان شوێن پێی تامستیۆسی هەڵگرتووە.

لای ئەو ئەقڵی ماددی جەوهەرێکی ئەزەلیە، بەڵام ئیبن روشد ئامادەباشی مرۆڤ یا هێزی مرۆڤ لە ناسینی ئەقڵی دا ناودەنێ ئەقڵی هەڵچوو. ئەو ئەقڵە بەبوونی مرۆڤ بوونی هەیە و بە لەناچوونی مرۆڤیش لەناو دەچێ. بەڵام ئەقڵی ماددی وەکو جۆری مرۆڤ، ئەزەلیە.

لێ پەیوەندی نێوان ئەقڵی کارا و ئەقڵی وەرگر، هەڵبەت ئەگەر ئەم چەمکە لە بری ئەقڵی ماددی بەکاربهێنین، تا ئێستا لێڵ و تەمومژاویە، ناکرێ مەسەلەکە پێچەوانەی ئەوە بێت. ئەقڵی کارا وا لەو وێنەیە دەکات ئەقڵانی بێت کە دەروون وێنای دەکات. ئەقڵی وەرگریش ئەو شتە ئەقڵانیانە لەخۆیدا وەردەگرێ، دەروونی مرۆڤ خاڵی پێککەیشتنی ئەو دوو خۆشەویستە پەنهانەیە. ئەو خاڵی پێککەیشتنەش زۆر جۆری هەیە. بە گوێرەی رادەی ئامادەباشی دەروونی مرۆییی و ئەو وێناکردنەی کە تێیدایە، ئەو پلەیە دروست دەبێ کە ئەقڵی کارا دەتوانێ ئەو وێناکردنانە بەرز بکاتەوە تا دەبن بە ئەقڵانی، هەروەها رادەی توانستی ئەقڵی وەرگر لە کردنی وێناکان بە شتی ئەقڵانی بەشێکە لە ناوەڕۆکەکەی.

لەوەوە هۆکاری جیاوازی ڕادەی مەعریفەی ئەقڵیی مرۆڤ دەردەکەوێ، کۆی ئەو مەعریفانەش لە جیهاندا نەگۆڕ و سەقامگیرە، با دابەشکردنی بەسەر تاکەکانیشدا نایەکسان بێت. بۆیە پێویستە فەیلەسوف —چ ئەرەستۆ بێت یا ئیبن روشد- بەردەوام لە زەینیدا شتە هەبووەکان بکاتە شتگەلی زەیینی.

بێگومان بیروباوەڕی خەڵکی دروست دەبن، ئەقڵی وەرگریش بە گوێرەی ئەو گۆڕانەی کەسێك بەری دەکەوێ گۆڕانی بەسەردا دێ، بەڵام ئەو ئەقڵە ئەگەر وەکو ئەقڵی مرۆیی تەماشای بکەین، ئەوە کۆنە و گۆڕانی بەسەردا نایە، وەکو ئەقڵی کارا کە ئەقڵی دوایین ئەستێرەیە.

## ٧- تێڕوانینی گشتی:

بە گشتی لە مەزهەبەکەی ئیبن روشددا سێ بۆچوونی گومڕاییانە هەیە، کە مەزهەبەکە ناکۆك دەکات لەگەڵ ئەو شتانەی عەقیدەناسی هەر سێ ئایینە گەورەکە سەلماندوونی، **یەکەمیان:** کۆنی جیهانی ماددی و ئەقڵە بزوێنەرەکانیان، **دووەم:** پابەندی هەموو رووداوەکانی گەردوون بە یەکترەوە وەك هۆکار و بەرهۆ (علە و مەعلول)، کە هیچ بوارێکی بۆ چاودێری یەزدانی یا موعجیزە نەهێشتوەتەوە. **سێیەم:** لەنێوچونی سەرجەم بەشەکان، ئەم قسەیەش وادەکات نەمری تاکەکەسی نەکردە بێت.

ئەگەر بە گوێرەی ئەو رایەی کە دەڵێ ئەقڵەکان سەربەخۆن لە ئەستێرەکان، حوکم بەسەر ئەقڵدا بدەین بەوەی دەکەوێتە پلەی خوار خوداوە، ئەوە بنەمایەکی تەواوی نییە. بەڵام ئیبن روشد وەکو پێشینانی خۆی بەسەر ئەم شتەدا زاڵ دەبێت و دەڵێ جیاواز، ئەو ئەقڵە جیاوازی تاکەکەسی نییە، بەڵکو جیاوازی جۆرە. چونکە دانیان بەوەدا نەهێناوە کە جیهان یەك شتە و جیاوازی لە نێوان پارچەکانیدا ناکەن، ئەوە تاکە ئامانجیان ئەوەیە بیانوی جوڵە جیاوازەکانیان دەربخەن، کاتێك مەزهەبی بەتلیمۆس لەمەڕ جیهان روخا و ئەو ئەقڵە ناوەندییانە بوون بە شتی لاوەکی و دەکرا فەرامۆش بکرێن، ئیدی وتیان ئەقڵی کارا زاتی ئیلاهیە، هەروەك پێشتر هەندێ کەس لە رووی ئایینی و ئەقڵی تیۆری شتی وایان دەگوت. ئینجا هیچ شتێك نەما بیڵێن تەنیا ئەوە نەبێت کە ئەقڵی ئەزەلی مرۆڤ، زاتی ئیلاهیە. ئیبن روشد شتی لەم جۆرەی نەگوتوە، هەڵبەت لانیکەم بە گوێرەی ئەو دەقانەی کە نوسیونی، بەڵام بە گوێرەی مەزهەبەکەی شتی وا رێی تێدەچێ. هەروەها دەشێ مەزهەبەکەی دان بە یەکێتی بوون بەشێوەیەکی گشتیدا بنێ.

لە پاڵ ئەوەشدا مەزهەبی ماتریالیزم لە مەزهەبەکەی ئیبن روشد بەرچاو دەکەوێ، گەرچی ئەم فەیلەسوفە هێرشێکی توندی کردە سەر، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەزەلیبون و جەوهەریبون و کردەییبونی هەموو شتە ماددیەکانی سەلماندبوو، وەکو ئەوەی ئیبن روشد کردبووی، تەنها بەهۆی ماددەوە دەکرا ئەقڵ بە پاشا یا خودا ناو ببرێ.

هەرچیەك بێت، ئیبن روشد بیرمەندێکی بوێر و لۆژیکی بووە، بیرکردنەوەکانیشی هیچ پێکدژی و هەڵەشییەکیان تێدا نەبوو، گەرچی بیرمەندێکی داهێنەر نەبوو، تەنها گرنگی بە

فەلسەفەی تیۆری دەدا، هەروەها بەهۆی پلەو پایە و سەردەمەکەیەوە ناچاربوو مەزهەبەکەی و ئایین و شەریعەت تەبا بکات.

## ٨- فەلسەفە پراکتیکیەکەی:

ئیبن روشد هەموو هەلێکی دەقۆستەوە بۆ هێرشکردنە سەر فەرمانڕەوا جاهیل و کەلامناسە نەیارەکانی کولتوری سەردەمەکەی، بەلاّم بەلای ئەوەوە ژیان لە ژێری سێبەری دەولّەتدا باشترە لە ژیانی تەنیایی و دوورەپەرێزی، ئەو بۆ زۆر شت سوپاسی نەیارەکانی کردووە لەوەی کەلّکی زۆری لێوەرگرتوون، ئەوەش لایەنێکی جوانی کەسایەتی ئەوە. ئیبن روشد پێی وایە ژیانی تەنهایی، نەزانست و نە پیشەوەری لێ بەرهەم نایەت، مرۆڤ لە تەنهایی پتر لەوەی چنگ ناکەوێ، کە پێشتر بەدەستی هێناوە، با کەمێك بەرەو باشیشی ببات، بەلاّم پێویستە هەموو تاکێك کەمێك لە ئاسودەیی و کامەرانی کۆمەلّی بەر بکەوێ، بگرە پێویستە ژنیش وەکو پیاو خزمەت بە کۆمەلّگە و دەولّەت بکەن. ئەم فەیلەسوفەی لەمەڕ ئێمە لەو بیروباوەڕانەیدا شوێن پێی ئەفلاتونی هەلّگرتووە، (هێشتا بێ ئاگابووە لە سیاسەتەکەی ئەرەستۆ).

ئیبن روشد پێی وابووە زۆربەی هەژاری و کلۆلّی سەردەمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پیاو وەکو رووەك و ئاژەلّی مالّی چاو لە ژن دەکات، هەروەکو مالّ و مولّك تەماشای ژن دەکات و هەر سەرکۆنەی دەکات، لەبری ئەوەی بتوانێ بەشداری بەرهەمهێنانی سامانی ماددی و ئەقلّی بکات و پشکی خۆی وەر بگرێ.

بەلاّم لە ئەخلاقدا ئەم فەیلەسوفەی ئێمە هێرشێکی توند دەکاتە سەر مەزهەبی ئەو فوقەهایانەی کە دەیانگوت چاکە بۆیە چاکە چونکە خودا فەرمانی کردووە، خراپەش بۆیە خراپەیە چونکە خودا نەهی لێکردووە، بەلاّم ئەم نەیاریان بوو و دەیگوت: کار بۆ خۆی چاکە یا خراپە یا بەحوکمی ئەقلّ چاکە و خراپی دەردەکەوێ. کار و کردەوەی مۆرالّیانە ئەوەیە مرۆڤ لە مەعریفەی ئەقلّیەوە ئەنجامی بدات، هەلّبەت نابێ مەرجەعی کۆتاییمان ئەقلّی تاکەکەسی بێت، بەلّکو تاکە مەرجەعمان بەرژەوەندی کۆمەلّگەیە.

هەروەها ئیبن روشد وەکو پیاوێکی سیاسی تەماشای ئایینی دەکرد. ئەو بۆیە پێگەی ئایینی بەرز کردۆتەوە، چونکە ئامانجی ئەخلاقیانەی هەبووە، بەرای ئیبن روشد ئایین ئەحکامی شەرعیانەیە، نەك مەزهەبی تیۆری و فێرکردن، بۆیە هەرگیز لە دژایەتیکردنی ئەو کەلامناسانە کۆلّی نەدا کە گەرەکیان بوو بە روانینێکی ئەقلاّنیانە تەماشای ئایین بکەن، نەك

وەکو ئەرکی ملکەچان و باوەڕ لاوازان. ئیبن روشد سەرکۆنەی غەزالی کرد، چونکە رێگەی بۆ فەلسەفە خۆشکرد تا کاریگەر بێت بەسەر مەزهەبە ئایینیەکەیەوە و بەم کارەشی دەرگای دڵکرمیێ بوون و گومڕایی بۆ زۆر کەس ئاوەڵا کرد.

ئیبن روشد دەڵێ پێویستە خەڵکی بڕوایان بەو شتانە هەبێت کە لە کتێبدا هاتوون، ئەو شتانەی لەو کتێبانەدا هاتوون شتی راستن و بۆیە لە شێوەی چیرۆکدا باسکراون، چونکە ئاراستەی منالآنی تەمەن گەورە کراون، ئەگەر خەڵکی لەو کتێبە لابدەن دووچاری خراپەکاری دەبنەوە، لە قورئاندا دوو بەڵگەیە لەسەر بوونی خودا هەیە بۆ هەموو خەڵکی روون و ئاشکرایە، ئەوانیش، ***یەکەم:*** چاودێری ئیلاهی بە هەموو شتێك، بەتایبەت مرۆڤ، ***دووەم:*** ئافراندنی ژیان لە رووەك و ئاژەڵاندا. نابێ ئەو دوو بەڵگەیە دڵکرمیێیان بکات، هەروەك ناکرێ وەکو کەلامناسان دەقەکانی وەحی وەبەر باس بخەن، چونکە ئەو بەڵگەیەی کەلامناسان بۆ سەلماندنی بوونی خودا دەیهێننەوە لەبەرامبەر رەخنەی زانستیدا و لەبەرامبەر رەخنەکانی فارابی و ئیبن سیناش بۆ مانای ئەگەر و پێویست، خۆڕاگر نییە.

هەموو ئەوانە دەبنە هۆی نکۆڵیکردن لە ئافرێنەر و بەرەڵڵایی، پێویستە بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی ئەخلاق و بەرژەوەندی دەوڵەت، دژایەتی ئەو مەزهەبە کەلامیە بکەین.

بەڵام فەیلەسوفانی دانا دەتوانن ئایەتەکانی قورئان تەئویل بکەن، ئەوان لە ژێر تیشکی نوری حەقیقەتی باڵادا لە مەبەستی ئەو ئایەتانە حاڵی دەبن، ئەو شتانەش بە خەڵکی عەوام ناڵێن، تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە ئامادەکراون بۆ ئەو ئەرکە. بەم کارەش دەگەینە باشترین جۆری هاوئاهەنگی، واتە تەبایی یاساکانی شەریعەتیش لەگەڵ فەلسەفەدا، چونکە هەر یەکێکیان ئامانج و مەبەستی خۆی هەیە، پەیوەندی نێوان شەریعەت و فەلسەفە وەکو پەیوەندی نێوان تیۆر و پراکتیکە. کاتێك فەیلەسوف سەرنجی ئایین دەدات، لەکایەی تایبەتی خۆیدا بڕوای پێ دەکات، بە شێوەیەك هەرگیز فەلسەفە و ئایین پێکدژ نەکەونەوە، بەڵام فەلسەفە باڵاترین وێنەی راستەقینەیە، هاوکات باڵاترین ئایینیشە، چونکە ئایینی فەیلەسوفان ناسینی هەموو ئەو شتانەیە کە هەن.

بەڵام ئەو بۆچوونە نکۆڵیکردنە لە ئایین، ئایینی ئاسمانی راستەقینە قایل نابێت لە گۆڕەپانی حەقیقەتدا فەلسەفە پێگەی یەکەمی هەبێت، بۆیە ئاساییە کەلامناسانی خۆرئاوا و کەلامناسانی خۆرهەلات، ئەو هەلە بقۆزنەوە و واز نەهێنن تا فەلسەفە لەسەر تەختی پاشایەتی نەهێننەوە خوارەوە و بیکەن بە خزمەتکاری ئایین.

## ٧- کۆتایی

## ١- ئیبن خەلدوون[١١٢]:

### ١– هەلومەرجی سەردەمی ئیبن خەلدوون:

فەلسەفەکەی ئیبن روشد و ئەو شەرحانەی بۆ مەزهەبی ئەرەستۆ کردوونی تەنها کاریگەرییەکی زۆر کەمیان بەسەر جیهانی ئیسلامیدا هەبوو. زۆرێك لە بەرهەمە ئەسڵیەکانی لەنێوچوون، ئەوەی بەدەستمان گەیشتوون بە وەرگێڕدراوی زمانی عیبری و لاتینین. هەروەها ئیبن روشد هیچ خوێندکار و شوێنکەوتەیەکی نەبوو تا درێژە بە فەلسەفەکەی بدەن. گومانی تێدا نییە زۆر بیرمەندی ئازاد و سۆفیگەر هەبوون، بەڵام هەموویان دووربوون لە یەکترەوە، لەو سەردەمەدا جێگەی سەرسامی بوو کەسێك هەموو ژیانی خۆی بۆ لێکۆڵینەوە لە بابەتێکی تیۆری فەلسەفی تەرخان بکات، لە کاتێکدا فەلسەفە ناتوانێ کاربکاتە سەر کولتوری گشتی و ڕێڕەوی ڕووداوەکان.

بەر لە دەرکەوتنی شمشێری مەسیحیەکان شارستانیەتی ماددی و کولتوری ئەقڵی موسڵمانان وردە وردە بەرەو لەنێوچوون دەچوو، ئیسپانیاش وەکو ئەفریقیا کەوتە ژێر قەڵەمڕەوی بەربەرەکان. هەلومەرجەکە گەیشتە هەلومەرجێکی شەرمهێن، یا دەبوو ئیسلام لەو وڵاتەدا بمێنێتەوە یا دەبوو چۆڵی بکات. ئیدی خەڵکیش ئامادەبوون بۆ دژایەتیکردنی دوژمن و بگرە دژایەتیکردنی یەکتریش. شوێنکەوتوانی تەریقەت لە هەموو ڕوویەکەوە خۆیان ڕێکخست بۆ بیرکاری سۆفیگەری، لە نێو ئەوانیشدا لانی کەم کەمێك بیروباوەڕی فەلسەفی لە لەنێوچوون قوتاری بوو. کاتێك ئیمپراتۆر فریدریکی دووەم نزیکەی لە ناوەڕاستی سەدەی سێزدەهەمی زایینی لە (سبتە) کۆمەڵێك بابەتی فەلسەفی ڕووبەڕووی زانایانی موسڵمان

(١١٢) ولی الدین عبدالرحمن بن محمد بن خلدون، ساڵی ١٣٣٢ز لە تونس لەدایکبووە، ساڵی ١٤٠٦ز لە قاهیرە مردووە. (و.ع)

کردەوە، عەبدالواحدی خەلیفەی موەحدین، ئیبن سەبعین[113]ی خاوەن یەکێك لە تەریقەتە سۆفیەکانی ناچارکرد وەڵامیان بداتەوە، ئەویش بەهۆی تەسکبینیەوە، لوتبەرزانە هەندێ شتی لە بیروباوەڕی فەیلەسوفە کۆن وتازەکان وەرگرت و وەڵامی ئیمپراتۆری پێ دایەوە. لە میانی ئەوەشە دەتوانین نهێنی سۆفیگەری دەربخەین، ئەوەی دەڵێ خودا حەقیقەتی هەموو شتێکە. بەڵام تاکە شتێك کە بتوانین لە وەڵامەکەی ئیبن سەبیعەوە هەڵێنجین ئەوەیە کتێبێکی خوێندوەتەوە، پێی وابووە ئەو کتێبە بە بەردەستی فریدریکی ئیمپراتۆردا ناکەوێ.

## ٢- ژیانی ئیبن خەلدوون:

شارستانیەتی ئیسلامی خۆرئاوا لە دەوڵەتۆچکەکانی دەوروبەردا جاروبار هەڵدەستایەوە و جاروباریش دەکەوت. بەڵام بەر لەوەی بە یەکجاری هەڵبوەشێتەوە پیاوێك دەرکەوت، ئەو پیاوە هەوڵیدا یاساکانی دروستبوونی ئەو دەوڵەتە دەربخات، بە باوەڕەی خۆی بنەمای لقێکی تازەی فەلسەفی دادەڕێژێ، واتە فەلسەفەی کۆمەڵایەتی یا فەلسەفەی مێژوو، ئەو پیاوە سەرسوڕهێنەرەش ئیبن خەلدوون بوو کە ساڵی (١٣٣٢ز) لە تونس لە خێزانێکی ئەشبیلیی لەدایکبووە.

ئیبن خەلدوون لە تونس خوێندنی تەواو کردووە و پاشان فەلسەفەی خوێندووە، هەندێ لە وانە فەلسەفیەکانیشی لای مامۆستایەکی خۆرهەڵاتی خوێندووە، دوای ئەوەی سەرجەم زانستە باوەکانی سەردەمەکەی دەخوێنێ، جاروبار کاری دەوڵەتی وەئەستۆ گرتووە و جارجارەش گەشت و سەفەری کردووە. لە هەموو ئەو کارانەشیدا کە وەئەستۆی گرتوون پیاوێکی ورد و بەسەرنج بووە. لای زۆر ئەمیر پلەی سکرتێری وەرگرتووە. سەردانی زۆر حکومەتی کردووە لە ئیسپانیا و ئەفریقیا. هەروەها سەردانی کۆشکی پیتەری دڵڕەقی کردووە لە ئەشبیلیە. جگە لەوانە سەردانی کۆشکی تەیمور لەنگی کردووە لە دیمەشق.

کاتێك ساڵی (١٤٠٦ز) لە قاهیرە کۆچی دواییکرد، زانیاری زۆری لەمەڕ جیهان پەیداکردبوو.

---

(١١٣) أبو محمد عبدالحق بن ابراهیم الاشبیلی، فەیلەسوفێکی سۆفیگەرە، ساڵی ١٢٦٩ی ز لە مەککە مردووە، وەڵامەکەیشی بۆ فریدریکی ئیمپراتۆر بە زمانی فەرەنسی لە گۆڤاری ئاسیایی (S.VII, t 14 p 341) بڵاوکراوەتەوە. (و.ع)

ئیبن خەلدوون لەسەر پرەنسیپەکانی خۆی پێداگر نەبوو، وێڕای کەم پسپۆڕی و کەمێك لەخۆباییبون، بەڵام پیاوێك بوو بۆ زانست ژیا.

### ٣- فەلسەفە و ئەزموونی ژیان:

ئیبن خەلدوون هەر کە فەلسەفەی باوی ناسی دەستبەجێ رەتی کردەوە، بیروباوەڕەکانیشی لەمەڕ جیهان تازەبوون و بۆ چوارچێوە باوەکانی جیهان لەبار نەبوون. گەرچی خۆی ئامادەباشیەکی بەرچاوی تێدابوو بۆ لێکۆڵینەوە و چالاکی تیۆری، بۆیە مەزهەبێکی نۆمینالیستی (nominalismus)ی داڕشت.

فەیلەسوفان پێیان وابوو هەموو شتێك دەزانن، بەڵام ئیبن خەلدوون پێی وابوو جیهان زۆر فراوانترە لەوەی ئەقڵی ئێمە بتوانی پەی پێ ببا، هەروەها لەم جیهانەدا بونەوەر و شتی بێ سنوری تێدا دەژی کە ئێمە ناتوانین هەموویان بناسین. (خودا شتی وای خولقاندووە کە ئێمە هەر زانیاریشمان لە بارەیەوە نییە)، ئیبن خەلدون دەیگوت زۆرینەی جار پێوەرە لۆژیکیەکان لەگەڵ سروشتی شتە بەرهەستیەکاندا ناگونجێن، چونکە ئەو شتانە تەنها بە بینین پەییان پێ دەبردرێ، بەڵام ئەوەی هەندێ کەس پێیان وابوو تەنها بە بەکارهێنانی یاساکانی لۆژیك دەکرێ بگەین بە حەقیقەت، ئەوە تەنها وەهمێکی ساختەبوو. بۆیە پێویستە زانا بزانی چ شتێك دەیگەیەنێ بە ئەزموونی هەستەکی، هەروەها پێویستە تەنها پشت بە ئەزموونی تاکەکەسی نەبەستێ، بەڵکو دەبێ پشت بە کۆی ئەو ئەزموونە مرۆییانە ببەستێ کە بەدەستی دەگات، هەڵبەت دەبێ گوڵبژێرییان بکات.

دەروون بە سروشتی خۆی هیچ زانیارییەکی تێدا نییە، بەڵام هەر بە سروشتی خۆیشی دەتوانێ بیر لەو شتانە بکاتەوە کە بەر هەست دەکەون و مامەڵەشیان لەگەڵ بکات.

زۆرجار لەو بیرکردنەوانەدا ئاستی مامناوەندی دروست دەبێ وەکو ئیلهام، بەو ئاستەش دەتوانین ئەو زانیاریانە راست بکەینەوە کە بەدەستمان هێناون، بۆ ئەو راستکردنەوەیەش یاسای وێنەیی لۆژیك بەکار دەهێنین، لۆژیك مەعریفە بەرهەمناهێنێ، بەڵکو ئەو رێگایە وەسف دەکات کە لە بیرکردنەوەی خۆمان دەیگرینە بەر و پێمان دەڵێ چۆن دەگەین بە مەعریفە. هەروەها لۆژیك چاکەی ئەوەیشی هەیە لە هەڵە لامان دەدا و بیر تیژمان دەکات و وامان لێدەکات لە بیرکردنەوەدا ورد بین. لۆژیك زانستێکی یاریدەدەرە و پێویستە کۆمەڵە

کەسێکی لێهاتوو خۆیان تەرخان بکەن بۆ فێربوونی ئەو زانستە، بەڵام ئەو پێگە و گرنگیە بنەڕەتیەشی نییە کە فەیلەسوفان بۆیان دروستکردووە.

زانایانی سەرجەم لقە زانستیەکان دەتوانن دەستبەرداری لۆژیکناسی بن.

ئیبن خەلدوون بیرمەندێکی بیر چەسپیوە، ئەو بە بەڵگەی ئەقلانی دژایەتی کیمیاگەری و ئەستێرەناسی کردووە، هەروەها زۆر نەیاری ڕەوتی سۆفیزمی ئەقلانی بە بنەما سادەکانی ئایین لای فەیلەسوفان بووە. ئەوەش بەباوەڕ و قەناعەتی خۆی لەبەر هۆکاری سیاسیی. بەڵام ئایین هەرگیز کاریگەر نەبووە بەسەر بیروباوەرە زانستیەکانیدا. پتر مەزهەبی ئەرەستۆیی-نوێ ئەفلاتونی و فەلسەفەی فیساگۆرسی ئەفلاتونی و مێژوونوسانی خۆرهەڵاتی پێش خۆیشی بەتایبەت مەسعودی، کاریگەرییەکی بەرچاویان بەسەر بیروباوەڕەکانیدا هەبووە.

## ٤- فەلسەفەی مێژوو، میتۆدی مێژوویی:

ئەم فەیلەسوفەی لەمەڕ ئێمە، سپڵەیی کرد کە پێیوابوو لقێکی تازەی فەلسەفی دارشتووە و هەرگیز بە خەیاڵی ئەرەستۆدا نەهاتووە. وەکو فەیلەسوفان دەڵێن فەلسەفە زانستی ئەو شتانەیە کە هەن و لە هۆکردەکەی خۆیانەوە سەرچاوەیان گرتووە. بەڵام ئەوەی لەبارەی جیهانی ئەقڵی باڵا و زاتی یەزدانی دەیڵێن لەگەڵ ئەو قسەیەی سەرەوە تەبا نییە و وێك نایەتەوە، ئەوان لەم بارەوە قسەی وا دەکەن ناتوانن بیسەلمێنن.

ناسینی ئەم جیهانەی کە تیایدا دەژین پشت ئەستورترە لەوەی ئەوان دەیڵێن، بەهۆی تێبینی ئەو شتانەی لە دەروونماندا هەن دەتوانین شتی جێ متمانەتر لەبارەی ئەم جیهانەوە بزانین، لەم جیهانەدا رووداوی وا هەن دەکرێ بەدوای سەلماندن و هۆکارەکانیاندا بگەڕێین، هەروەها ئەگەر بەو رادە سەرکەوتنەی لەم ئەرکەی دواییدا بەدەستی دەهێنین، لە لێکۆڵینەوەی مێژووییدا بەدەستی بهێنن — مەبەستم ئەو رادەیەیە کە دەتوانین لە دەستنیشانکردنی هۆکار و یاسای رووداوە مێژووییەکان بەدەستی دەهێنین- ئاسانتر دەتوانین مێژوو ناوبنێین زانستێکی حەقیقی و بەشێك لە فەلسەفە.

بۆیە لای ئیبن خەلدوون زۆر بەروونی ئەو بیرۆکەیە دەردەکەوێ کە دەڵێ مێژوو زانستێکی سەربەخۆیە و هیچ پەیوەندی بە فزولیەت و خۆدەرخستن و خۆهەڵکێشان و بەرژەوەندی گشتی و هەوڵی ئەو کەسانەی دەیانەوێ وەکو دەمامکێك کەڵکی لێوەرگرن و ئەو جۆرە شتانەوە

نییە، گەرچی خزمەتکردنی مێژوو بەمەبەستی ژیانێکی باڵا، بەڵام جگە لە تۆمارکردنی ڕووداوەکان و دەرخستنی ڕووداوێك بەهۆکارەکەی ئەوەش لەسەر بنەمایەکی ڕەخنەیی دوور لە لایەنگری و ئارەزوو، گرنگی بە هیچی تر نادات.

گەورەترین ڕێسای میتۆدی لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەوەیە ڕووداوەکان وەکو هۆکرد و بەرهۆ بەیەکەوە دەبەستێتەوە. مەبەستم ئەوەیە ڕووداوە لێکچووەکان هەر دەبێ لە هەلومەرجی هاوشێوەدا دروست بن، واتە هەلومەرجی شارستانی هاوشێوە ڕووداوی هاوشێوەی لێدەکەوێتەوە. ئەگەر بێ دوودڵی ئەو بۆچوونە پەسەند بکەین کە دەڵێ سروشتی خەڵکی و گرووپەکان بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانیان بەسەردا نایەت، یاخود گۆڕانێکی بەرچاویان بەسەردا نایەت، ئەوە ئێستاناسی کە ناسینێکی زیندووی دروستە، باشترە لەو زانستەی بەهۆیەوە حوکم بەسەر ڕابردوودا دەدەین، ئەگەر ئێمە بەتەواوی شتێکی نزیك بەخۆمان ناسی، ئەوە دەتوانین حوکمێکی هەڵێنجانی بەسەر ئەو ڕووداوانەی ڕابردوودا بدەین کە هێشتا بەتەواوی نەماننناسیوە، بگرە ئەگەر وابێت دەتوانین پێشبینی کاروبارەکانی ئاییندەیش بکەین. بۆیە دەبێ هەمیشە ئەو زانیاریانەی لەبارەی ڕابردووەوە پێمان دەگەن بەپێوەری ئێستا بپێوین، ئەگەر مێژوو شتێکی بۆ گێڕاینەوە کە ڕوودانی لە ئێستادا مەحاڵە، ئەوە دەبێ گومانی لەدروستی بکەین، چونکە ڕابردوو وەکو ئێستایە، هەروەك دوو دڵۆپی هەمان ئاو.

دەکرێ هەموو ئەو شتانەی بەگشتی لە مەزهەبی ئیبن ڕوشدا کورت بکەینەوە، بەڵام لای ئیبن خەلدوون لە لێکۆڵینەوەکانیدا بەشێوەیەکی بەرچاو کەڵکی لێوەرگرتووە، ئەو شتانە بە شێوەیەکی گشتی ڕاستن، بەڵام لە پەیڕەوکردنی بەسەر پارچە و بەشەکاندا ملکەچی چەندین کۆت و مەرجە کە هەر دەبێ بە ڕووداوەکان پشت ئەستوورییان بکەین.

## ٥- بابەتی زانستی مێژوو:

بەو پێیەی کە مێژوو لقێکە لە لقەکانی فەلسەفە، ئەی بابەتەکەی چییە؟، ئیبن خەلدوون لە وەڵامدا دەڵێ، بابەتەکەی ژیانی کۆمەڵایەتی و شارستانیەتی ماددی و مەعنەوییە. مێژوو کاروچالاکی خەڵکی و چۆنیەتی بەدەستهێنانی بژێوی ژیان و هۆکاری ناکۆکیەکانیان و دامەزراندنی کۆمەڵی ژێر چنگی فەرمانڕەوا جیاوازەکان دەردەخات، هەروەها چۆن لە ژیانێکی شارستانی و ئارامدا کاتێکی بەتاڵ پەیدا بکەن بۆ پراکتیزەکرنی پیشەوەری و زانستە باڵاکان. مێژوو دەریدەخا چۆن وردە وردە شارستانیەتیەکی باڵا لە سەرەتایەکی سادەوە نەشونما دەکات و چۆن چۆنیش لەنێو دەچێ.

ئیبن خەلدوون پێی وایە کۆمەڵ بەشێوەی جیاواز جیاواز و دوابەدوای یەك دەردەکەوێ، وەك: ١) قۆناغی کۆچەری و دەوارنشین، ٢) بنەماڵەی فەرمانڕەوا و هۆز، ٣)دەوڵەتی شارستانی شار. یەکەم بابەتی بایەخدار بریتیە لە بابەتی بەدەستهێنانی خواردن، تاك و گەلان بە گوێرەی هەلومەرجی ئابوریيان جیاوازن، (کۆچەرییەکان و ئاژەڵدارە نیشتەجێبووەکان یا لەسەر بەخێوکردنی ئاژەڵ یا بەکشتوکاڵکردن دەژین)، هەژاری دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی دەست بدەنە جەنگ و تاڵانکاری یا کۆبوونەوە لە ژێر دەستی رێبەرێك، جا هۆزێك دروست دەکەن و شارێك بۆ خۆیان بونیاد دەنێن، لێرەدا هاوکاری و کاردابەشکردن دەبێتە هۆی ژیانێکی خۆشگوزەران، بەڵام ئەو خۆشگوزەرانیە تەمبەڵیەکی ناسروشتی و نقومبوون لە ئارەزووبازی لێدەکەوێتەوە. لەسەرەتادا کار خۆشگوزەرانی لێدەکەوێتەوە، بەڵام دوای ئەوەی خەڵکی دەگەیەنێتە باڵاترین پلەی شارستانی، ئیدی خۆیان دەستبەرداری کار دەبن و کەسێك دەدۆزنەوە کاریان بۆ بکات، زۆرجار ئەو کارکردنەش بێ پاداشتە، چونکە خزمەتکردن و ماستاوکردن بۆ کەسانی دەوڵەمەند و باڵادەست و مامەڵەکردنی ئەوان لەگەڵ کەسانی هەژار و چینی خوارەوە، خۆشگوزەرانی لێدەکەوێتەوە.

بەلام مرۆڤ لەو حاڵەتەدا لەسەر کەسانی تر دەژی. پێداویستیەکانیش بەشێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکەن، فشاری باج و سەرانەش توندتر دەبێت. ئیدی هەژاری، دەوڵەمەندە دەستبلاو و سەرجەم باجدەرانیش دەگرێتەوە، ئەو حاڵەتە ریزپەڕەش دەبێتە هۆی نەخۆشی و بێ

ئومێدی[١١٤]. هەروەها خۆشگوزەرانی دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی حەز بە جەنگ نەکەن و نەتوانن پارێزگای لەخۆیان بکەن، پاشان ئایین لە درەوونیان گەندەڵ دەبێ و دیواری دەمارگیری و گروپگەری دەرووخێ، کە پێشتر بەخواستی فەرمانڕەوا و پێویستییەکانی خەڵك، ئایین و گرووپگەری دوو بەهێزترین فاکتەری یەکڕیزی گرووپ و کۆمەڵ بوونە. پاشان هەموو شتێك لەناو دەوڵەتدا دەچێتە باری هەڵوەشانەوە و لەنێوچوونی.

لەو کاتیدا سەر لە نوێ هۆزێکی تازەی لە بیابانەوە هاتوو دەردەکەوێ، یا میللەتێك دەردەکەوێ نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستەی خۆشگوزەرانی، ئەم میللەتە گرووپگەری تیایدا بەهێزە، ئینجا ئەمان دێن ئەو شارە لە نێو دەبەن کە خۆشگوزەرانی شەکەتی کردووە، جا پشت ئەستوور بە سەروەتی ماددی و ئەقڵیەتی پێشکەوتوو، دەوڵەتێکی تازە دادەمەزرێنن.

دەوڵەت و گرووپە گەورەکان هەر لەماڵ دەچن: مێژوویان لەنێوان سێ بۆ شەش نەوە کۆتایی دێت، نەوەی یەکەم دایدەمەزرێنێ، نەوەی دووەم پارێزگاری لێدەکات، دەشێ نەوەی سێیەم و چوارەم و پێنجەمیش هەر پارێزگاری لێ بکەن، بەڵام دوایین نەوە واتە نەوەی کۆتایی دەیڕوخێنێ، کۆی شارستانیەتەکان هەر لەسەر ئەو ڕێڕەوە دەڕۆن بەڕێوە.

## ٦- تایبەتمەندیی مەزهەبەکەی ئیبن خەلدوون:

ئۆگست مولەر (August muller) پێی وایە مەزهەبەکەی ئیبن خەلدوون بەسەر مێژووی ئیسپانیا و سەقلیە و ڕۆژئاوای ئەفریقیا لەنێوان هەردوو یانزەهەم و پانزەهەمی زایینیدا پەیڕەو دەکرێ، چونکە ئیبن خەلدوون مەزهەبەکەی بەرهەمی خوێندنەوەی مێژووی ئەو دوو وڵاتەیە، گومانی تێدا نییە کتێبە مێژوویەکەی ئیبن خەلدوون کۆکردنەوەی ئەو کتێبانەیە کە پێشتر نوسراون، کاتێك لە ڕەخنەکردنی ئەو زانیاریانەی پێی گەیشتووە تیۆرەکەی خۆی بەکارهێناوە، زۆرجار کەوتووەتە هەڵەوە، بەڵام لەو پێشەکیە فەلسەفیەی کە بۆ مێژووی

---

(١١٤) ئیبن تەنها باسی ئەو دەوڵەمەندانە دەکات کە دووچاری هەژاری بوون، هەروەها باسی چینی کرێکار و چەرمەسەرییەکانیان ناکات، وەکو ئەوەی لە شارە گەورەکاندا هەیە، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئیبن خەلدوون بەگشتی لە شارۆچکە بچوکەکاندا ژیاوە، وەختێکیش لەکۆتایی تەمەنی قاهیرە دەبینێ زۆری پێ سەرسام دەبێ. (نوسەر).

فەلسەفەی نوسیوە تێبینی و سەرنجی دەروونی و سیاسیی وردی تێدایە، بەڵام بەگشتی کارێکی مەزن و سەرسوڕهێنەرە.

پێشنیانی ئیبن خەلدوون گرنگیەکی قوڵیان بە گرفتی مێژوویی نەداوە، بەرهەمی هونەری مێژوویی گرنگیان بۆ جێ هێشتووین، وەلێ مێژوویەکی زانستی فەلسەفییان بۆ دانەمەزراندووین، بۆ نموونە هۆکاری ئەوەی مرۆڤ لە زەمانی کۆندا بە پلەی باڵا نەگەیشتوون وەکو ئەوەی مرۆڤی شارستانی پێی گەیشتووە، گەرچی پلەی باڵا لەئەزەلەوە هەر هەبووە، گەڕاندۆتەوە بۆ زەمینلەرزە و لافاو و ئەو جۆرە شتانە. لەلایەکی ترەوە فەلسەفەی مەسیحایی بە پێشکەوتنەکانیشیەوە بە مێژووی وەدیهاتن و سەرەتای مەملەکەتی خودا لەسەر زەمی دادەنرێ. ئینجا ئیبن خەلدوون هات، ئەمیش یەکەم کەس بوو هەوڵیدا پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی مرۆڤ و هۆکارە راستەوخۆکانی پێکەوە ببەستێتەوە، هەروەها لە بابەتەکانی لێکۆڵینەوەدا پەیبەرێکی بەتوانا بووە و نوسینەکانیشیی بە بەڵگەی قایلکەر پشت ئەستور بووە.

ئیبن خەلدوون تیشکی کردۆتە سەر رگەز و کەش و هەوا و بەرهەمهێنانی کاڵا و ئەو شتانە و کاریگەریان بەسەر پێکهاتنی جەستەیی و ئەقڵی تاك و کۆمەڵگەوە.

ئیبن خەلدوون پێی وایە شار و کۆمەڵگەی مرۆیی یاسای نەگۆڕییان هەیە و هەردووکیان لە پەرەسەندنی خۆیاندا پشتی پێ دەبەستن. ئەو یەکەم کەس بووە بەو پەڕی تواناوە پەنجەی خستوەتە سەر هۆکارە سروشتییەکان و پێی وابووە زنجیرەی هۆکار و بەرهۆکان هەر دەبێ بگەڕێنەوە بۆ هۆکاری یەکەم، ناکرێ ئەو زنجیرە هۆکار و بەرهۆیە تا هەتا درێژەی هەبێ. بۆیە لەم رێگەیەوە دەگەین بە سەلماندنی بوونی خودا. ئەم ئاکامە وەکو ئیبن خەلدوون دەڵێ: واتە ئێمە ناتوانین هەموو شتەکان و کاریگەرییەکانی خودا بناسین، ئەم داننانە بە نەزانی، خۆمان و هەستکردنی مرۆڤ بە هیچ نەزانی خۆی جۆرێکە لە مەعریفە و زانین. بەڵام پێویستە مرۆڤ بەوپەڕی توانای خۆی هەوڵی بەدەستهێنانی زانست بدات، ئیبن خەلدوون کە زەمینەی بۆ زانستێکی تازە خۆشکردووە، تەنها ئاماژەی بە مەسەلە گەورەکان داوە و گرنگی بە بابەت و میتۆد نەداوە، ئیبن خەلدوون بەهیوای ئەوە بووە لەدوای خۆی کەسانێك بێن و درێژە بە لێکۆڵینەوەکانی بدەن و پشت ئەستور بە بیرۆکەیەکی دروست و زانستێکی روون، بابەتی تازە بخەنەروو.

هیوا و ئاواتەکانی ئیبن خەلدوون خەریکبوو وەدی دەهاتن، بەڵام لەسەر دەستی موسڵمانان نا. هەروەك چۆن خۆی بابەتی ئەو زانستەی دانەهێنا، بۆیە کەسیشی نەدۆزیەوە لە دوای خۆی درێژە بە لێکۆڵینەوەکانی بدا. لەگەڵ ئەوەشدا کتێبەکەی کاریگەریەکی بەردەوامی بەسەر زانایانی خۆرهەڵاتەوە هەبوو، هەروەها زۆرێك لەو سیاسەتمەدارە موسڵمانانەی کە هیوای زۆرێك لە پاشا و سیاسەتمەدارە ئەوروپییەکانیان لە سەدەی پانزەهەمی زایینیدا لەنێو برد، بەرهەمی کتێبەکانی ئیبن خەلدوون بوون، واتە لە ژێر کاریگەری کتێبەکانی ئەودا بوون.

## ٢- عەرەب و فەلسەفەی مەسیحایی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

### ١- هەڵوێستی سیاسی، جولەکە:

غەنیمە و دەستکەوت بۆ براوەیە، لەو جەنگانەی کە لە ئیسپانیا لەنێوان مەسیحیەکان و موسڵمانەکاندا هەڵایسا، ژیری مەسیحییەکان کەوتە ژێر کاریگەری جوانی ژنانی بەربەری و چەندین سوارچاکی مەسیحی (نۆ رۆژی پەرستیشان) لەگەڵ ژنانی بەربەری بەسەربرد. بەڵام سەرکەوتووەکان، وێڕای کاریگەربوونیان بە دەستکەوتی ماددی و چێژی هەستەکی، کەوتنە ژێر کاریگەری سیحری کولتوری ئەقڵی، ئیدی زانستی عەرەب لە چاوی شەیدایانی مەعریفە بوو بە بووکێکی رازاوە و دڵفڕێن.

لەم مەسەلەیەدا جولەکەکان ئەڵقەی پەیوەندی بوون، پێشتر لە هەموو قۆناغەکانی شارستانیەتی ئەقڵی موسڵمانان بەشدارییان کردبوو، زۆریان بە زمانی عەرەبی دەیاننوسی، زۆری دیکەیشیان کتێبە عەرەبییەکانیان وەردەگێڕایە سەر زمانی عیبری، ئازایەتی مانەوەی زۆرێك لە کتێبی فەیلەسوفانی ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وەرگێڕانانەی ئەوان.

فەلسەفەی جولەکە لە کەسایەتی ئیبن مەیمون (١١٣٥-١٢٠٤ز) دەگاتە ترۆپکی نەش و نما. ئیبن مەیمون، هەڵبەت لە ژێر کاریگەری فارابی و ئیبن سینادا، هەوڵیدا مەزهەبی ئەرەستۆ و تەورات پێکەوە تەبا بکات، هەندێ جار ئیبن مەیمون تیۆری فەلسەفی لە دەقە ئاسمانیەکانەوە هەڵێنجاوە، هەندێ جاریش فەلسەفەی ئەرەستۆی بەسەر شتەکانی ئەم جیهانەوە پوخت کردۆتەوە، بەڵام شتەکانی سەرووی ئەم جیهانەی لە تەوراتەوە وەرگرتووە.

لە وڵاتانی ئیسلامیدا لە رۆژگاری گەشەسەندنیاندا، جولەکە بەشدارییەکی بەرچاویان لە کارە زانستیەکاندا کرد، هەڵبەت موسڵمانان زۆر لێبوردەبوون لەگەڵیاندا و بگرە لەلایەن موسڵمانانەوە شانسیان هەبوو، بەڵام دوای روخانی ئەو وڵاتانە و لەنێوچوونی شارستانیەت، پێگە و پایەییان ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات، ئیدی لەلایەن دەمارگیرەکانەوە راوەدوو نران و ناچار پەنایان وەبەر وڵاتە مەسیحاییەکان برد، بەتایبەت فەرەنسای باشوور تا پەیامەکەیان لە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریدا بگەیەنن.

## ٢- پالرمۆ و تەلیتلیە:

جیهانی مەسیحایی و جیهانی ئیسلامی لە دوو خاڵدا پێك دەگەیشتن: باشوری ئیتاڵیا و ئیسپانیا. زانستەکانی عەرەب لە کۆشکی ئیمپراتۆر فریدریکی دووەم لە پالرمۆ زۆر بە پەرۆشیەوە دەخوێندرا. ئیدی بە ئاسانی کەوتە ژێر دەستی لاتینیەکان، هەروەها ئیمپراتۆر و مانفردی (manfred)ی کوڕی چەندین کتێبی فەلسەفیان بەخشیە زانکۆکانی پۆلۆنیا و پاریس، ئەو کتێبانە هەندێکیان لە عەرەبی و ئەوانی تر لە یۆنانیەوە وەرگێڕدرابوون.

بەڵام بزووتنەوەی وەرگێڕان لە ئیسپانیا زۆر لەوە مەترسیدارتر و کاریگەرتربوو، لە شاری تەلیتلیە کاتێك مەسیحییەکان داگیریان کرد لە یەکێك لە مزگەوتەکاندا کتێبخانەیەکی عەرەبی هەبوو پڕاوپڕ لە کتێب، ئەو کتێبخانەیە وەکو سەنتەرێکی رۆشنبیری ناو ونێوبانگی گەیشتبووە ئەوپەڕی وڵاتانی مەسیحایی باکور. لێرەدا دەبینین بە عەرەبکراو و جولەکەکان و مەسیحیەکانی ئیسپانیا شان بە شانی یەکتر کاریان کردووە. پیاوانی سەرجەم وڵاتان لەو بزووتنەوەیە هاوکاربوون. ئەوانەی کاری وەرگێڕانیان دەکرد، وەك: یوحەننای ئیسپانی (johannes hispanus)، و گوندیسالینۆس (gundisalinus) (لە نیوەی یەکەمی سەدەی دوانزەهەمی زایینی)، هەروەها گێرارد کریمۆنی (gerard von cremona) (1114-1187ز) و میخائیلی ئوسکوتلەندی (michel der schotte) و هێرمانی ئەڵمانی (herman deuche) (لەنێوان ١٢٤٠-١٢٤٦ز).

زانیاری تێروتەسەلمان لەمەڕ هەوڵ و کۆششی ئەم پیاوانە پێی نەگەیشتووە، لەوەدا دەتوانین وەرگێڕانەکەیان بەراست و بە ئەمانەت لەقەڵەم بدەین کە هەموو وشەیەکی عەرەبی یا عیبری یا ئیسپانی وشە لاتینیەکەی بەرامبەریان نوسیوە، گەرچی بەشێوەیەکی گشتی بە وردی لەو شتانە تێ نەگەیشتوون کە وەریان گێڕاوە و بۆ کەسێکیش عەرەبی نەزانێ تێگەیشتن لەو

بەرهەمە وەرگێڕدراوانە زۆر سەختە. وەرگێڕەکان هەندێ وشەی عەرەبیان وەکو خۆی هێشتوەتەوە و هەندێکی دیکەشیان گۆڕیوە، بۆیە وەرگێڕانەکانیان وەکو شتێکی بێ تامە.

هەروەها ناوی هەندێ کەسی دیاریان وا گۆڕیوە ناسینەوەیان دژوارە. دەشێ هەموو ئەو هۆکارانەش پشێویان لە بیروهزری ئەو کەسانە دروست کردبێ کە فەلسەفەیان بە زمانی لاتینی دەخوێند، ئەو بیروباوەڕە تازانەش کە لەو بەرهەمانە دا هەبوون پشێویەکی وایان دروست کرد، لەوەی سەرەتا کەمتر نەبوو.

بزووتنەوەی وەرگێڕان بەگشتی هەنگاو بەهەنگاو شان بە شانی گرنگیدانی دامودەزگا مەسیحاییەکان بەرێوەدەچوو، بەرێوەچوونەکەشی هەر بەهەمان شێوەبوو کە لەلای موسڵمانانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بینیمان.

لەسەرەتادا کتێبی بیرکاری و ئەستێرەناسی و پزیشکی و فەلسەفەی سروشتی و دەروونناسی وەرگێڕدران، پاشان لۆژیك و میتافیزیکایشی هاتە پاڵ. دواتر خەڵکی وردە وردە کەوتنە سەر کتێب و شەرحی کتێبەکانی ئەرەستۆ، بەڵام لەسەرەتادا لە ژێر کاریگەری هەموو ئەو جۆرە کتێبانەدابوون کە بەسۆراخی ئاشکراکردنی نهێنیەکانەوە بوون.

جا کیندی-ییان ناسی و وەکو پزیشك و ئەستێرەناسێك لەنێویاندا نێوبانگی پەیدا کرد، پاشان لە رێگەی بیروباوەڕە پزیشکی و دەروونناسی هەستەکی و فەلسەفەی سروشتی و میتافیزیکیەکانەوە کەوتنە ژێر کاریگەری ئیبن سینا، بەڵام گەر بەراوردی بکەین بە ئیبن سینا کەمتر کاریگەربوونە بە فارابی و ئیبن باجە، دواتر شەرحی مەزهەبی ئەرەستۆکەی ئیبن روشد هات، پایە و نێوبانگی ئەو شەرحانە، لە پاڵ پلەوپایەی یاساکەی ئیبن سینا (یاسای پزیشکی)، ماوەیەکی زۆر کاریگەرییان هەر مایەوە.

## ٣- عەرەب لە پاریس:

ئێستا دەتوانین بپرسین: ئەی چاکەی موسڵمانان بەسەر فەلسەفەی مەسیحایی سەدە ناوەڕاستینەکانەوە چیبوو؟، راستیەکەی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە مەبەستی ئەم کتێبە نییە، چونکە کاری وا پێویستی بە شەونخونی خوێندنەوەی ئەو هەموو دەستنوسە زۆر و زەبەندانەوە هەیە، کە هیچم لێ نەخوێندوونەتەوە.

دەتوانین بڵێین مەسیحیەکانی خۆرئاوا لە وەرگێڕانی کتێبەکانی عەرەبەوە دوو شتیان دۆزییەوە: لەلایەکەوە مەسیحیەکان پتر لەوەی دەیانزانی، شارەزای لۆژیك و سروشت و

میتافیزیکای ئەرەستۆیی بوون، گەرچی ئەوە گرنگیەکی کەمی هەبوو و بۆماوەیەکی کەم هانی توێژینەوەی فەلسەفیی دان، دوای ماوەیەکی کورت کتێبەکانی ئەرەستۆ بەشێوەیەکی باشتر و راستەوخۆ لە زمانی یۆنانییەوە وەرگێڕدرانە سەر زمانی لاتینی، گەرچی گرنگترین کاریگەری عەرەب بەسەر مەسیحیەکانەوە ئەوەبوو، دوای خوێندنەوەی کتێبەکانی عەرەب و بەتایبەتیش ئیبن روشد، ئیدی بیروبۆچوونێکی تایبەتیان لەمەڕ ئەرەستۆ پەیداکرد کە پێیان وابوو حەقیقەتێکی بالآیە، ئەوەش نەك هەر هەلێك بوو بۆ پێکدادانی نێوان ئایین و فەلسەفە، یا ملکەچکردنی یەکێکیان بۆ ئەوی تر، بەڵکو خەریکبوو ببێتە هۆی نکۆڵیکردن لە بیروباوەڕە ئایینەکان. ئینجا کاریگەری فەلسەفەی ئیسلامی بەسەر پەرەسەندنی بیروباوەڕی مەسیحایی سەدە ناوەڕاستینەکان، لەلایەکەوە پاڵنەربوو، لەلایەکی دیکەشەوە فاکتەری روخاندن بوو، چونکە کەلامناسی و فەلسەفە لەجیهانی مەسیحاییدا نەیتوانی بە سەربەخۆیی و هەر یەکەو لەسەر رێچکەی خۆی بڕوا بەڕێوە و دەستەویەخەی یەکتر نەبن، وەکو ئەوەی لای بیرمەندانی ئیسلام هەبوو.

پاشان عەقیدەناسی مەسیحایی لەسەدەکانی سەرەتادا بۆ پەرەسەندنی خۆی لە وەرگرتنی فەلسەفەی یۆنانی زیادەڕۆیی کرد، تا وای لێهات لێکجیاکردنەوەی ئایین و فەلسەفە بوو بەکارێکی نەکردە، بەڵکو دەیتوانی تەنها چەند شتێکی بچوك پەسەند بکات، کەچی هەزمکردنی فەلسەفەی یۆنانی بۆ بیروباوەڕی سادەی ئیسلامی ئاسانتربوو (کە بیروباوەڕی فەلسەفیی زۆری تێدابوو) وەك لە بیروباوەڕی ئالۆزی مەسیحایی.

کاتێك لە سەدەی دوانزەهەمدا کاریگەری عەرەب دەرکەوت، زانستی بیروباوەڕی مەسیحایی بۆن و بەرامەی نوێ ئەفلاتونیزمی تێکەڵ بە بۆن و بەرامەی ئۆگەستینیزمی بەخۆوە گرت. ئەو بۆن و بەرامەیەش لای فرەنسیسکانەکان تا سەدەی سێزدەهەم هەر مایەوە. رەوتی ئەفلاتونیی — فیساگۆرسی لە هزری ئیسلامیدا رێك وەکو ئەوەی هزری مەسیحایی بوو.

ئیبن جەبروون لای دانس سکوت (Duns Scotus) نموونە بالآبوو. لەلایەکی دیکەوە هەردوو دۆمینیکی مەزن: ئەلبێرت و تۆما (Albert und Thomas) کە ئایینده‌ی تیۆرە ئایینیەکانیان دامەزراند، بەشێوەیەك مەزهەبی ئەرەستۆ تالیسیان خواست کە بگونجێ لەگەڵ ئەوەی فارابی و بەتایبەتیش ئەوەی لای ئیبن سینا.

لە ناوەڕاستی سەدەی سێزدەهەم کاریگەرییەکی مەزن دەرکەوت کە سەرچاوەکەی ئیبن روشد بوو، دەرکەوتنەکەشی لە پاریس بوو، پاریس مەڵبەندی رووناکبیری زانستی مەسیحایی ئەو سەردەمە بوو. ساڵی ١٢٥٦ز ئەڵبێرتی مەزن (Albert der Grosse) کتێبێکی دژی ئیبن روشد نووسی، دوای پانزە ساڵ تۆما ئەکوینی (Thomas von Aquino) کتێبێکی دژی شوێنکەوتوانی ئیبن روشد نووسی، کە رێبەرەکەیان سایگەر بارابانت ( Siger von Barabant) (ساڵی ١٢٦٦ز ژیاوە) بوو و ئەندامی کۆلیژی ئاداب بوو لە پاریس، سایگەر تا دوایین ئاکامە لۆژیکیەکانی دەستبەرداری شوێنکەوتەیی رێبازی ئیبن روشد نەبوو، هەروەك چۆن ئیبن روشد رەخنەی لە ئیبن سینا گرت، سایگەریش ئالبێرت و تۆما ئەکوینی وەبەر تیری رەخنەدا، بەڵام رەخنەکانی ئەم لەوان زۆر بەرێزەوە بوو.

سایگەر بڕوای بە وەحی هەبوو، بەڵام پێی وابوو ئەوەی ئەرەستۆ لە کتێبەکانیدا خستۆتیەروو، وەکو ئەوەی ئیبن روشد راڤەی کردووە، ئەقڵ پشتگیرییان دەکات، بەڵام مەزهەبە ئەقڵیەکەی سایگەر بە وردبینیەکەشیەوە زانایانی لاهوتی قایل نەکرد، ئیدی پیاوانی دادگای پشکنین کەوتنە راووەدونانی، واش دەردەکەوت ئەو کارە بە دەستووری فرانسیسکانەکان بووە، چونکە دەیانویست لە رێگەی ئەوەوە دژایەتی مەزهەبەکەی ئەرەستۆ بکەن کە دۆمینیکیەکان دەستیان پێوەگرتبوو.

دواجار سایگەر لە شاری ئۆرڤەرتیۆ و لە ساڵانی (١٢٨١-١٢٨٤) لە زینداندا کۆچی دواییکرد. دەشێ (دانتی) هیچی لە بارەی سایگەری گومڕاوە نەزانی بێ، ئاوا وەکو نوێنەری زانستی دونیایی خستۆتیە باخچەکانی بەهەشتەوە.

بەڵام نوێنەرانی مەزنی فەلسەفەی ئیسلامی، (دانتی)یان لەگەڵ مەزنان و دانایانی یۆنان و رۆمان و هەروەها ئیبن سینا و ئیبن روشدی دوایین فەیلەسوفانی مەزن، کە لە سۆنگەی ئایینەوە بیریان نەدەکردەوە و نەوەکانی دواتری وەك دانتیش بەچاوی سەرسامییەوە لێیانیان دەڕوانی، هاوێشتە کۆڵانەکانی دۆزەخەوە.

